# له مه‌هاباده‌وه تا بایکانۆر



## بیره‌وه‌ری کوردێک له زیندانه‌کانی ستالین



بیره‌وه‌ریی دکتۆر ڕه‌حمان حه‌له‌وی
وه‌رگێڕانی: ڕه‌سووڵ سوڵتانی

# لە مەهابادەوە
# تا بایکانۆر

## بیرەوەری کوردێک لە زیندانەکانی ستالین

ناسنامەی کتێب ...

ناوی کتێب: لە مەهابادەوە تا بایکانۆر
بیرەوەریی دکتۆر ڕەحمان حەلەوی
وەرگێڕ: ڕەسووڵ سوڵتانی
دیزاینی بەرگ و ناوەرۆك: ئیبراهیم ساڵح
نۆرەی چاپ: یەکەم- 2022
تیراژ: 1000
نرخ: 9000
شوێنی چاپ: چاپخانەی دانیشفەڕ

لەبەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان /هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی (١١٤٣)ی ساڵی ٢٠٢٢ی پێدراوە

# پێڕست

# وەک پێشەکی:

لە مەهابادەوە تا بایکەنوور ناونیشـــانی بیرەوەرییەکانی بەڕێز، کۆچکردوو کاک دوکتۆر ڕەحمان حەلەوییە کە پاش مەرگی لە لایەن بنەماڵەکەیەوە بە زمانی فارســـی چاپ و بڵاو کراوەتەوە. لە کاتی کۆرۆنا بەخۆشـــییەوە لـە لایـەن کوڕی نـاوبراوەوە لە ئەمەریکـا، زەحمەتیـان کێشـــــا و نوســـخەیەکیان بۆ ناردم و خوێندمەوە. زۆرم بەدڵ بوو، بەڵام پێم ســـەیر بوو بۆ بە کوردی نەنووســـراوە یان بۆ وەرنەگێڕدراوەتەوە سەر زمانی کوردی!؟

هەر ئەو کات پێشـنیاری بە کوردیکردنی ئەم پەڕتووکەم کەوتە زەین، بەڵام لە خۆم ڕا نەدی ئەم کارە بکەم، هەر لە دڵمیشـــــدا بوو بۆ وەرگێڕانی بۆ ســـــەر زمـانی کوردی بیروکەیەک بدۆزمەوە، یان کەســـێکی شـــارەزا لە کاری وەرگێڕانـدا ببینمەوە. دیـارە خودا هەڵنـاگرێ کـاک دوکتور مێهردادی بەڕێز زۆری پێ خۆش بوو بۆ ئەوەی کـارێـک بکەم کە ئەو کتێبە بە کوردیش هەبێ، تا هەم کوردزمانەکان کەڵکی لێ وەرگرن و هەم کتێبخانەی کوردیی پێ دەوڵەمەند بکرێ.

وا بوو هەر لەم ســـەروبەندەدا کەوتمە فکری مامۆســـتا ڕەســـووڵ ســـوڵتانی کە ئەم کتێبە بکاتە کوردی. ئەوە لە کاتێکدا بوو کە کاک ڕەســـووڵیش دڵی هێشـــابوو و قەراری دابوو چیتر خۆی ڕەنجبەخەســـار نەکا و دەســـت لە کار و

ئەرکی وەرگێڕان هەڵگرێ. دیـارە مـاڵی ئـاوەدان بێ و پەژیوان بۆوە و بە خۆشییەوە پێشنیارەکەی منی قەبووڵ کرد و بڕیـاری وەرگێڕانی ئەم کتێبەی دا. منیش هەر لێرەوە سپاس و دەسخۆشیی لێدەکەم.

هەموو لایەک باش دەزانن کە کاک ڕەســـووڵ زۆر دەســـڕەنگین و زمانزان و پســـپۆڕی وەرگێڕانە و هیچ حەوجێ بـــە پێـداهەڵگوتن نییە، بۆیە هەر چی بیڵێم لە زیادێیە و واز لە کاک ڕەسووڵ دێنم.

منیش بەڵێنم دا بۆ وەرگێڕانی بۆ سـەر زمانی کورد و بۆ چاپکردنی پێشەکییەکەی کورتی بۆ بنووسم.

یەکەم، لەبەر ئەوەی من مـاوەیەکی زۆری تەمەنم لە یەکێتیی ســـۆڤیەتی ژیاوم و خەریکی خوێندن بووم و خوێندنی دوکتۆرام لە زانســـتی پزیشـــکیدا لە بەشـــی نەشـــتەرگەریی گشـــتی تەواو کردووە. دیـارە ئەمە ئـارەزووری کـاک ڕەحمـانی ڕەحمەتیش بوو، بەڵام بە داخەوە هەر وەک بۆخۆی باسی دەکا پێ ڕانەگەیشتووە.

دووەم، ئەوە مێژووییە و بەســـەرهـاتی زۆربەی کـــەرەکتێرەکـانی نـاو ئەو کتێبە بۆم ئـاشـــنـان و ســـەرەدەمانێک لە جوغرافیای ســـۆڤیەت چاوم پێیان کەوتووە و لەگەڵیان ئاشـــنا بووم، هەرچەند قۆناخەکان جیاواز بوون و ســـۆڤیەتیش زۆر گۆڕانکاریی بەســـەردا هاتبوو، هەم لە ســـیســـتمی ســـیاســـی و ئابووری بگرە کۆمەڵایەتیش ئاڵوگۆڕی بنەڕەتیی تێدا ساز ببوو.

سێیهەم و گرینگترین هۆکاریش کە حەزم دەکرد ئەم کتێبە بە کوردیش هەبێ، تا کوردی بێدەوڵەت و کیان و بێبەش لە هەموو مافە سیاسی و فەرهەنگی و نەتەوایەتییەکان و تامەزرۆی سازکردنی دەوڵەتی کوردی بیزانێ، شێوازی هەڵسوکەوتی سۆسیالیسمی یەکێتیی سۆڤیەتی ئەوان سەردەمان بوو لەگەڵ پرسە نەتەوایەتییەکان و پرسی بەدەوڵەتبوونی کورد .

هەروەها گرینگە بزانن ئەو چەرمەسەری و نەهامەتی و کارەساتانەی ستالین بە سەر خەڵک و وڵاتانی یەکێتیی سۆڤیەتی هێناوە و چۆن مرۆڤ بووتە قوربانی ئیدۆلۆژی و ئازادی و دیموکراسیی لێ زەوت کراوە.

ئەو کات و تەنانەت ئێستاش کەم نین و نەبوون ئەو کەسانە خەونیان بەوەوە دەدیت کە هۆردووی سوور دەوڵەتی کوردی ساز بکا. یەکێک لەوانەش بە خۆمەوە! بۆیە خوێندنەوەی ئەم کتێبە ئەو ڕاستییە تاڵانەمان بۆ دەردەخا و ڕەنگە کاریگەریی خۆی هەبێ لەسەر ئەو کەسانەی کە وایان بیر دەکردەوە.

کاک دوکتور ڕەحمان خۆی لە ناو جەرگەی ڕووداو و کارەساتەکانی پێش و دوای شەڕی دووهەمی جیهانیدا بووە و هەروەها لە سەرهەڵدان و دروستکردنی کۆمەڵەی ژێکاف و پاشانیش دامەزرانی حیزبی دێموکراتی کوردستان و کۆماری کوردستاندا بە ڕێبەرایەتی پێشەوا قازی محەممەد دەوری گێڕاوە و بە چاوی خۆی شاهیدی ئەوان سەردەمان بووە. دوکتور حەلەوی زۆر بە شێوازێکی ساکار و ڕاستگۆیانە دەست بە گێڕانەوەی ڕووداوەکان دەکات و بەبێ

ئەوەی بە خۆیدا هەڵبڵی و خۆی وەک قارەمان نیشان بدا کە ئەمە تایبەتمەندیی کتێبگەلی بیرەوەی و مێژووی زارەکییە. بە پێچەوانەوە هەمیشە باسی زوڵملێکراویی خۆی دەکا و زۆر جارانیش لەبەر ڕاستی و سەداقەت و دروستکاریی خۆی تووشی چەرمەسەری و کێشە و ئەزیەت و ئازار هاتووە.

من وەک خۆم زۆرم حەز لە مێژوویە و پێم وایە ئەگەر پیشەی دکتوریم نەبوایە، حەتمەن مێژووم دەخوێند، هەر بۆیەش زۆر هۆگری خوێندنەوەی بیرەوەری و ژیاننامەی کەسانی دیاری ئێستا و ڕابردووی کوردم. مێژووی زارەکی سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندە بۆ ساغکردنەوەی کەلێن و قوژبنی تاریکی مێژووی نەتەوەیەکی بندەست و بێ پشت و پەنای زانستی و ئاکادیمیک، بۆیە من لە خوێندەوەی مێژووی زارەکی چێژ وەردەگرم و بۆ ئەزموون و دەرسوەرگرتنی جیلەکانی داهاتووش دەبێ.

بیرەوەرییەکانی کاک دوکتور ڕەحمانیش بەشێکن لەم مێژووە کە ئەرکی کۆکردنەوە و لێ هەڵێنجنینیان بێ شک دەکەوێتەوە سەرشانی نەوەکانی ئێستا و داهاتوو و دامودەزگا و دامەزراوەکانی ئاکادیمی و دەوڵەتی کوردی لە دواڕۆژدا.

پێم وابێ زۆربەی هەرەزۆری بیرەوەریی کەسایەتییەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستانم خوێندووەتەوە، لە زۆربەیاندا جۆرێک خۆمێحوەرییەتی یان بە واتایەک

براگەورەیەتیی نووسەر یا هەمان خاوەنی بیرەوەرییەکانیان پێوە دیارە، کۆی ڕووداوەکان دەکەن بە پەراوێزی خۆیانەوە و یا لە قالبی بیروبۆچوونی سیاسی و یا بە ڕەنگ و بۆنی حیزبایەتییەوە دەیاننووسنەوە، پێم وایە ئەمە ئەکرێ بە ڕەخنەیەکی جددی لە سەربردەنووسینەوەی تاکی کورددا بێتە هەژمار.

لەم کتێبەدا بەپێچەوانەی زۆربەی بایۆگرافییەکان، نووسەر خۆی بە قارەمانی داستانەکان نازانێ و تەنیا بیرەوەرییەکانی خۆی دەخاتە ڕوو و ڕەنگە لە زۆر جێگاشدا کەمکاریی کردبێ لە دەربڕینی بۆچوون و باسکردنی ڕووداوەکانی ئەو سەردەم کە ڕەنگە ویستبێتی بۆ خەڵکی شارەزا و پسپۆڕیان جێ بێڵێ، یان لەبەر هەر هوکارێک بێ زۆر ڕوونکردنەوە نادا و سەرپێی بە سەر زۆر ڕووداوی مێژوویی سەردەمی کۆمەڵەی ژێکاف و کۆماری کوردستاندا بازی داوە، کە دەبوایە نووسەر بە قووڵی چووبا ناو جەرگەری مێژووی ڕووداوەکان و کارکتێرەکانی ئەو سەردەم و ئەو کات. ڕەنگە ئەمەش هەر لەبەر خاکەڕایی کەسایەتیی خۆی دوورەپەرێزی لە خۆهەڵکیشان بێ یان لە ترسی دەوڵەتی دەسەلاتداری فارس بێ و یان وەک کوتم ویستبێتی هەموو شتیک بۆ کەسانی شارەزا و پسپۆر بەجێ بهێڵی.

گێڕانەوەکانی کاک دوکتۆر زۆر دەگمەن و جیاوازن و خوێنەرپەسەند و لە هەمان کاتدا سەرچاوەی باش و جێی بڕوان بۆ جیلی ئێستا و داهاتووش. من پێم وایە دوکتور ڕەحمان زۆر سەرکەوتوو بووە لە نووسینەوەی ئەم کتێبە،

ئەوەش ئەم سەرکەوتوبوونەی تەنیا خۆی لە یەک خاڵدا دەبینێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە سادە و ساکار و خۆمانە و خۆماڵیانە دەست بە گێڕانەویان دەکات کە تۆش ئاگادار بیت چی ڕووی داوە و هەروەک فیلمی سینمایی تا کۆتایی پێت خۆشە سەیری بکەی.

شتیکی دیکەش کە جێی خۆیەتی باسی بکەم، بڕوا و باوەڕبەخۆبوون و ماندووییەناسی ئەو مرۆڤەیە کە بۆ فیربوونی زانست و عیلم و خوێندن لە هەموو قۆناخەکانی ژیانیدا کۆڵی نەداوە و بەڕاستی سەرکەوتنی بەدەست هیناوە و زۆریشی خزمەتی هاوزمانانی خۆی کردووە کە ئەمە سەرکەوتنێکی بێوێنەیە لە ژیانی تاکەکەسیدا و بۆ لێفێربوون دەبێ واتە کۆڵنەدان و تێکۆشان لە پێناو ئاوات و ئارەزووکان. هەر چەند ڕۆژگاری تاڵ لێ ناگەڕێ بە ئارەزووی خۆی کار و ژیان بکات، بەڵام دیسانیش من وەک مرۆڤێکی نموونە و سەرکەوتوو لە ژیاندا حیسابی بۆ دەکەم.

لە کۆتاییدا دەڵێم دوکتور ڕەحمان حەلەوی هەموو شتێ لە خۆیەوە دەست پێدەکات و بەخۆی کۆتایی دێت. باسی سادەیی و ڕووحی بەرز و سەداقەت و خاکەڕایی کاک دوکتوریش هەر ناکرێ. تایبەتمەندیی ئاوێتەی ئەدەب و ڕێزی لە گێڕانەوەی بیرەورییەکانیدا ئەوەیە کە قەت قامکی تۆمەت و خیانەت و ناجوامێری بۆ کەس درێژ ناکا، هەرچەند خەڵکێکی زۆریشی هێناوەتە ناو داستانەکەی و باسی هەموویان دەکا بەڵام وەک کوتم لە

بازنەی شـــەرم و مرۆڤايەتی لانادا. ئەم شـــێوە نووســـينە خوێنەر ڕائەكێشـــێ و هەســـــت ئەكەيت كە لە كۆڕێكی دۆســـتـانەدای و هـاوڕێيەک خەريكە داســـتـانێكت بۆ دەگێڕێتەوە.

لە كۆتاييدا پێزانين و ســـپاســـێكی گەرم بۆ بەڕێز كاك ميهرداد حەلەوی لە ئەمريكا و و هەزاران ڕەحمەت بۆ ڕووح و ڕەوانی نووسەر و سەری وەفا وبۆ زەحمەتەكانی دوكتور حـەلـەوی دادەنوێنم بۆ خزمەت و فيـداكـارييـەكـانی و دەوڵەمەندكردنی بەشـــێک لە مێژووی زارەكی كە مايەی شانازيی هەموو تاكێكی نەتەوەی كوردە.

**دوكتور ڕۆژان ئاشتاب كانادا**

## پێشەکیی نووسە

بەر لە بڵاوبوونەوەی بیرەوەرییەکانم، بە پێویستم زانی بڵێم بۆچی ئێستا کە ساڵانێک بەسەر ئەو ڕووادانەدا تێپەڕیوە و حوکمەتی سۆڤیەتی لەبەر یەک هەڵوەشاوەتەوە، قۆڵم لە بڵاوکردنەوەی ئەو بیرەوەرییانە هەڵماڵیوە کە ئیتر کۆن بوون و لەبیر چوونەتەوە. پێش هەموو شتێک با بڵێم، من خۆم زۆرم حەز لە خوێندنەوەی بیرەوەریی خەڵکە، ئەگەر تەنانەت ساڵانێکی زۆریش بەسەر ئەو ڕووداو و بیرەوەرییانەدا تێپەڕیبێ. بۆ نمونە بیرەوەرییەکانی کۆنت دۆگۆبینۆی باڵوێزی فەرەنسا لە ئێراندا بە ناوی "سێ ساڵ لە ئێران" ئەگەرچی گەلێ ساڵان بەسەر ئەو قۆناغەدا ڕابردووە، کەچی خوێندنەوەکەی چێژی خۆی هەر تێدایە، جا خوێندنەوەی سەربردەی خەڵکی دیکەش. ئینجا ئەوەش بڵێم، پاش ئەوەی لە سۆڤیەت هاتمەوە و ئەو ڕووداوانەی بەسەرم هاتن، بە ڕاستی وایان لێ کردم دەست بکەم بە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانم، بەڵام لەبەر چەند هۆیەک خۆمم لێ بوارد.

یەکێکیان ئەوەی کە، ئەو دەم واتە ساڵی ١٣٣٥ی هەتاوی، بارودۆخێکی وەها بەسەر ئەم وڵاتەدا هاتبوو، کە هەموو جۆرە نووسینێک، وەک خراپەگوتن و جنێودان بە ڕژیمی یەکیەتیی سۆڤیەت لەقەڵەم دەدرا و دەیانگوت بە ڕاسپاردە و ئەمری ڕێکخراوی هەواڵگریی ئێران

نووسراوه، هەر بۆیەش نووسینی لەو چەشنەیان بە ناڕاست و هەڵبەستراو دادەنا.

دووهەمیان، بە پێی ئەوەی خۆم زۆر کەیفم بە حوکمەت و ڕژێمی پاشایەتیی ئێران نەدەهات و پێم وابوو هەرچەشنە ڕەخنەگرتن و خراپەگوتنێکی سـۆڤیەت، دەبێتە بەڵگەیەک بۆ پێشگرتن لە خەباتی خەڵک دژی ڕژێمەکەی ئێران.

لەبەر ئەو شـتانە، خۆم لە نووسـینەوەی بیرەوەرییەکانم بوارد. پاش شـۆڕشـی ئێران و ڕووخانی ڕژێمی پادشـایەتی و دیسـان سـەرهەڵدانەوەی حیزبی توودە و دەیان حیزب و دەسـتەی چەپیی دیکە، وێدەچوو بوارەکە بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو بیرەوەرییانە باش و لەبار بێ.

بەڵام لە ڕاسـتیـدا حەزم لێ نەبوو گێڕانەوەی ئەو بیرەوەرییانە، وەکوو بەرەنگاری لەگەڵ پرسـە سـیاسـییە باوەکان لەقەڵەم بدرێ. وەک چۆن ئێسـتاش باوەڕم وایە خراپەگوتن و ڕەخنەگرتن لە ڕژیمێک کە بەسـەر یەکیەتیی سۆڤیەتی جاراندا زاڵ بوو، بە واتای ڕەخنەگرتن لە خەڵک و بیروبـاوەڕی کۆمۆنیسـتی نییە و وەک گەلێ جـاران لە سـەربردەکەی خۆمدا ئاماژەم پێ داوە، بە هیچ شـێوەیەک دژی ئەو ڕێبـاز و بیروبـاوەڕە نەبووم. بڵێی و نەڵێی ئەو ڕێبازە، بیروباوەڕ و پرسـێکی زانسـتی و فەلسـەفییە، وەکوو هەموو ڕێباز و بیروباوەڕەکانی دی.

لەوانەیە بیروباوەڕ و ڕێبازێک لە ڕووی تیۆرییەوە زۆر شیاو و پەسند بێ، بەڵام بە کردەوە نەکرێ چۆنی پێویستە، ئاوا جێبەجێی بکەی.

کەوابوو ڕەخنەگرتن لە ڕژیمێک بە واتای ڕەخنەگرتن لە ڕێباز نییە، ئەگەرچی تا ڕادەیەک لەوانەیە پێوەندیی بە کەمایەسی و کەموکورتییەکانی ئەو ڕێبازەشەوە هەبێ. هەرچۆنێک بێ ئێستا کە هەم ڕژیمی سۆڤیەتی و هەم ڕژیمی پادشایەتی هەڵوەشاونەوە و ئیتر نە هیچ دوژمنایەتیەک لەگەڵ حوکمەتێک لەگۆڕێیە و نە دۆستایەتی و لایەنگری لە حوکمەتێکی دی، بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە ئەو بیرەوەرییانە دەنووسمەوە. لەگەڵ ئەوەدا بەردەوام ئەم پرسیارەش دێتە گۆڕێ، کە بۆچی حوکمەتی سۆڤیەتی سەرەڕای ئەوەی خۆی بە دەسەڵاتێکی خەڵکیان و ئاڵاهەڵگری حەفتاساڵ خەبات دژی سەرەڕۆیی و چەوساندنەوەی گەل دەزانی، ڕێک لە کاتێکدا لێک ترازا، کە هیچ پێشبینی نەدەکرا؟ بە ڕای من ئەم بیرەوەرییانە و سەربردەی دیکەی لەو چەشنە، وەڵامێکی گونجاو و بەجێن بۆ ئەو پرسیارە.

**ڕ. حەلەوی.**

# زێدەکەم

لە شـــاری مەهاباد، کە جاران پێی دەگوترا ســـابڵاغی موکری، لەدایـک بووم و بە گوێرەی قســـەی دایکم بێ، ئەودەمی سمایل ئاغای سمکۆ شاری مەهابادی گرتووە، من سێ مانگان بووم. ناسنامەکەشـم دووی ڕەزبەری هەزار و سێسەدی هەتاویی لێ نووسراوە، هەڵبەت چەند مانگێک کەم و زیـاد لە ژیـانی پڕ لە هەوراز و نشـــێوی مرۆڤـدا، کاریگەرییەکی ئەوتۆی نییە.

ئەوەی لە قۆناغی منداڵیم لەبیرم ماوە، ئی پاش تەمەنی حەوت ســاڵانمە. ئەودەمێ ماڵەکەمان لە گەڕەکی خڕێ بوو، بۆیەش ئەو نـاوەی لێ نرابوو، چونکە خڕێـک بە نێوەنـدی شـــارەکەدا تێدەپەڕی و ئـاوەڕۆ و ئـاوی بەفر و بـارانی کوێستان و چیاکانی باشـووری شـارەکەی پێدا دەڕۆیشـت. ئەو خڕە، دواجار دەچۆوە ســەر ڕووباری شـارەکە، کە بە بـاکووری شـــاردا تێـدەپەڕی. مـاڵەکـانی شـــارییش لەمبەرەوبەری ئەو خڕە هەڵکەوتبوون.

مەهاباد ئەودەم شـــارێکی بچکۆلانە بوو، کە حەوت تا هەشت هەزار کەسی تێدا دەژیا. ڕووبەرەکەشی زۆر نەبوو، لە باشـــوورەوە دەچۆوە ســەر باغی شـێخی و مەزراکانی عەلیـابـاد و لە ڕۆژئـاواوە دەچۆوە داوێنی گڕاوان و لە باکوورەوە چۆمی مەهاباد و لە ڕۆژهەڵاتیشـەوە گۆڕستانی شاری.

گرینگترین گەڕەکەکانی شـــاری بریتی بوون لە هەرمەنیان و حاجی حەسەن و شادەرویش و قوڵەقەبران و ڕۆستەم بەگ و قیبلە و گەڕەکەکەی ئێمە "خڕێ".

ئەوماڵەی ئێمە تێیدا دەژیاین، لە نشـــێوێک بوو، کە دەهاتەوە سەر خڕەکە. ئەو خانووە، بینایەکی گەورە بوو، کە چەند کرێچییەکی تێدا دەژیان و یەکێکیان ئێمە بووین. ئەو ژوورەی ئێمە بە کرێمان گرتبوو، لە بەری ڕۆژئاوای بیناکەوە و نزیک دالانی وەژوورکەوتنێ بوو، چونکە حەوشـــەی ماڵەکە زۆر پانوبەرین بوو، لەگەڵ منداڵی دەروجیران لەوێ یاریمان دەکرد.

ئێمە چوار کەس بووین، بابم و دایکم و من و خوشـــکەکەم. شـــۆرەتی هەمووشـــمان حەلەوی بوو. لە حاڵێکدا شۆرەتی دایکم و خوشکەکەم کە زڕخوشکم بوو، دەبوو جیاواز بێ. بەڵام چونکە فەرمانگەی باری کەسیەتی (سجیل) ساڵی ١٣٠٧ لە مەهاباد دامەزرابوو، بۆ هەموو ئەندامانی خێزانەکە یەک شـــۆرەت دانرابوو. ئەودەم چونکە زۆرینەی خەڵک نەخوێندەوار بوون، کاربەدەســـتانی فەرمانگەی باری کەســـیەتی بە کەیفی خۆیان شـــۆرەتیان بۆ بنەماڵەکان دادەنا. هەر بۆیەش شـــۆرەتی زۆر بنەماڵە نالەبار و تەنانەت هێندێ جار ناشـــیرین و خراپیش بوو. لەو ســـەروبەندەدا بوو کە خوشکەکەم مێردی کرد و بووینە سێ کەس. جا هەر لەو کاتەشـــدا بوو کە منیان وەبەر خوێندن نا و چوومە قورئانخوێندنێ. مەکتەبەکەی ئێمەش لە مزگەوتی قیبلە

بوو. پێشـــنوێژی قوتابخانەکەمان پیرە مەلایەک بوو، کە دەرســـی پێ دەگوتینەوە. ســـەعاتی دەرســـگوتنەوەش، پێشـــنیوەڕۆیان بوو. هەر بۆیە ئێمەی منداڵ دوانیوەڕۆیان کاروپیشـــەمان هەر یاریکردن بوو و تا تاریک دادەهات لە پێش مزگەوتی هەباســـاغا یاریمان دەکرد. ئاواڵەکانی ئەودەمم تەنیا سەید گوڵە سەمەدی (سەید محێدین سەمەدی مەشهوور بە سەید گوڵە سەمەدی ۱۳۰۲ ـــ ۱۳٤۳) و کاک محەمەدی ســـەلیمیم لەبیر ماون. پێم وایە ئەو دوو کەســـە لەمێژە بەر ڕەحمەتی خوا کەوتوون. لە یارییەکانی ئەودەمیش هەڵماتێن و گوێزێن و جگێن و جۆرە یارییەکم لەبیر ماوە کە بە تۆپ دەمانکرد. تۆپەکەش، بە بەن دروســـتمان دەکرد. هێندێ کاتیش دەچووینە ســـەربانی مزگەوتی هەباساغا و زۆرانبازیمان دەکرد. جارێکیان لەگەڵ قادری تەوەکولی زۆرانیمان گرتبوو، ئەو کەوت و قاچی شـــکا و چەند مانگ نەیتوانی بڕوا. شـــەوانی هاوینێش لە کۆڵانەکاندا بە پێخواســـی یاریمان دەکرد. شـــەوێکیان دووپشک پێوەی دام، دەمودەست بابمیان ئاگادار کردەوە و ئەویش لوێچێ تووتنی خووســـاند و لە شـــوێنی چزووی دووپشکەکەی دا. ژانەکەی شکا، بەڵام تا چەند ڕۆژان قاچم ئاوسابوو و نەمدەتوانی باش بە ڕێیەدا بڕۆم. دایکم جاروبار دەچووە تەکیەی بابەخەلیفە و منیشی لەگەڵ خۆی دەبرد.

ڕۆژێکیان دایکم بەشی ژنانەی بەرهەیوانێ نوێژی دەکرد و من لەگەڵ منداڵەکان لە حەوشـــە یاریم دەکرد، کە لەپڕ لە حەوزی ئاوەکە کەوتم. نازانم کێ هێنامییەوە دەرێ، بەڵام دایکم نوێژەکەی نەبڕی. ئەو دەیگوت، ئاگام لێ بوو منداڵێک

لە حەزەکە کەوتووە، بەڵام هەر توانیم لە دڵی خۆمـدا هـاواری حەزرەتی غەوس بکەم. بە ڕاسـتی خەڵکی ئەودەمی باوەڕێکی قووڵ و پتەویان هەبوو. من ئیتر لە ترسـان نەچوومە ماڵی بابە خەلیفە. بەڵام هەر جارێکی نەخۆش دەکەوتم، دایکم دەچووە ماڵی ئەو سـەیدە مەزنە و نوشـتووی بۆ دێنام. ئەو نوشـتووەکەی، کە لەسـەر کوتەکاغەزێک نووسـیبوو، لە پیاڵەئاوێکدا دەخووسـاند و دەرخواردی دەدام.

هێندێ کات، دایکم بە ڕەحمەت بێ، بۆخۆی دەبووە پزیشـک. ئەو منداڵانەی هەڵامەتیان گرتبوو و لەوزەیان هەبوو، دەیانهێنانە لای ئەو. ئەو لەپێشدا دەستی ڕاستی دەشـوشـت و زاری بە منداڵەکە دادەپچڕی و بە قامکە درێژ و ڕەقەڵەکەی خۆی، لەوزەی ئاوسـاوی منداڵەکەی بەرەو نێو قوڕگی پـاڵ دەنـا و بەو جۆرە منـداڵەکە، کە نەیـدەتوانی تفی خۆی قووت بـدا، چـاک دەبۆوە. ئەو دەیگوت بۆ ئەم کـارە ئیجـازە و ودمم وەرگرتووە، تەنانەت دەتوانم بە دەستی خۆم مار و دووپشکیش بگرم بەبێ ئەوەی پێمەوە بدەن. دەیگوت بۆ ئەو کارەش ودمم پێیە.

سـاڵ و نیوێـک دواتر، مـاڵمـان چووە گەڕەکی هەرمەنیـان، چووینە مـاڵی میرزا مسـتەفا کـاکـاغـازادە. ئەوەی ئێمە بە کرێمان گرتبوو، ژوورێکی گەورە بوو، کە لەوسـەری ئەو مـاڵە گەورەیە هەڵکەوتبوو. دایکم لە

ڕاڕەوەکەیدا ئاورگێکی هەبوو، کە چێشتی لەسەر لێ دەنا.
ژوورەکەی ئێمە بەرانبەر ماڵەکەی میرزا عەولای کاکاغازادە بوو. ئەو ماڵە ڕۆژانی چوارشەممە دەبووە تەکیە و خانەقای ژنان. ژنەکەی میرزا عەولا خەلیفەی ژنان بوو. میرزا بۆخۆشی سۆفی بوو و لەگەڵ کوڕەکانی کارخانەی سابوونسازیی هەبوو. زۆر زوو لەگەڵ کوڕانی ئەو گەڕەکە ئاشنا بووم، یەک لەوان قادر و ڕەحمانی وەیسی کە نزیکترین جیرانمان بوون.
ئەو دوانەش بوونە هۆی ئەوەی من بچمە قوتابخانە. هەموو ڕۆژێ دەمدیتن کە کتێبیان لەبن هەنگڵیدایە و دەچنە قوتابخانە. ڕۆژێکیان هەر وا بەبێ ئەوەی ماڵەوەمان ئاگادار بکەمەوە بەشوێنیاندا چوومە قوتابخانە. لە نزیک مزگەوتی ڕۆستەم بەگ گوێم لە دەنگی زەنگێک بوو. هەر دووکیان غاریان دا و لە کۆڵانەکەی لای چەپی مزگەوتەکەدا چوونە نێو حەوشەیەکی گەورە. منیش چووم. منداڵی زۆر ڕیز ڕیز ڕاوەستابوون. منیش لە یەکێک لە ڕیزەکاندا ڕاوەستام. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە خەریک بوو ڕیزەکانی بەسەر دەکردەوە، هەر منی دی، بە بزەیەکەوە بەرەولام هات و پرسی، ئەوە تۆ بۆ لێرەی؟ گوتم هاتووم دەرس بخوێنم. دەستمی گرت و بردمییە ڕیزی منداڵە بچووکەکانەوە و گوتی لێرە بوەستە. ئەوە ڕیزی منداڵەکانی پۆلی بەرایی بوو. من لەگەڵ ئەوان چوومە سەر پۆل کە لە نهۆمی دووەمی بیناکە بوو و لە تەنیشت یەکێک لە کوڕەکان دانیشتم. هەموویان بەسەرسووڕمانەوە سەیریان کردم. مامۆستای پۆلی بەرایی خوالێخۆشبوو فتووحی بوو. کە وەژوور کەوت

و منی دی، ناوی خۆم و بابمی لێ پرسـیم. لەو شـارە بچووکەدا هەموان یەکتریان دەناسـی. پێم وایە مانگێک دەبوو خوێندن دەسـتی پێ کردبوو، بەڵام چونکە من لە مەکتەب(حوجرە) ئەلف و بێ فێر ببووم و بەهرەشـم هەبوو، پاش دوو مـانگ لە پۆلی بەرایی بردمیـانە پۆلی یەک. خودا لێی خۆش بێ، لەو پیـاوە شـەریفە، چەندە میهرەبان و بەسۆز بوو.

مامۆسـتای پۆلی یەکەمی سـەرەتاییمان جەنابی مەلا عەبدوڵڵا فـازڵی بوو. چەپرەک[1] بوو. بیرکـاری و بـاقی وانەکانی دیکەی بە دەسـتی چەپ لەسـەر تەختەڕەش دەنووسی.

ئەودەمی تەنیا یەک قوتـابخـانەی کوڕانە لە مەهـابـاد هەبوو. ناوی قوتابخانەی سـەعادەت بوو. بەڕێوەبەری قوتـابخـانەکەی جەنـابی عەلی مەحمـوودی بـوو و ڕاگرەکەشـی بەڕێز محەمەدی ئەسـحابی؛ مامۆسـتاکانی بەڕێزان فتووحی و فازڵی و مەلا محەمەد و مەلا حەسەن و مەلا قادری مودەڕسـی و محەمەدی موبەلیغیم لەبیر ماوە. تا پۆلی چوار لەو گەڕەکە خوێندم.

سـاڵی پێنجی سـەرەتایی، قوتابخانەکە گۆڕدرا و ڕایانگوێزتە ماڵی میرزا مسـتەفای پینەچییان لە گەڕەکی حاجی حەسـەن. ئەو شـوێنە زۆر بەرین و هەراو بوو،

---

[1]. چەپرەک: ئەو کەسانەی بە دەستی چەپ دەنووسن.

دەتگوت باغە. تاقە عەیبێکی هەبوو، شوێنی یاریکردنی نەبوو. تەنیا لەبەر دەم بیناکە، شوێنێکی بەتاڵ هەبوو بۆ ڕیزبەستنی منداڵەکان، کە لەوێوە بە سەر چەند پلیکانێکدا دەچوونە پۆلەکان.

بەیانیان من بەو بەژنە کورتەمەوە لەسەر پلیکانەکان ڕادەوەستام و بە دەنگی بەرز نزای بەیانیانم دەخوێندەوە و منداڵەکان دووپاتەیان دەکردەوە. مامۆستای پۆلی پێنجەم بەڕێز واعیزی بوو. نازانم خەڵکی تەورێز بوو یان مەراغە. یەکێک لەو ڕووداوانەی لەو قوتابخانەیە لەبیرم ماوە، هاتنی عەلی ئەسغەری حیکمەت، وەزیری معارف بوو بۆ مەهاباد. کاتێک بۆ سەرانسۆ هاتە قوتابخانەکەی ئێمە، بەهار بوو. ئێمە منداڵانی پۆلی پێنجیان بردە پۆلی شەشەکان. جەنابی وەزیریش هاتە ئەوێ و بۆ تاقیکردنەوەمان ئەمری کرد ئینشایەک بنووسین، لەبارەی "مەڕ"ەوە.

پاش نووسینی ئینشاکە و کۆکردنەوەی کاغەزەکان، جەنابی وەزیر کاغەزێکی جوێ کردەوە، خاوەنی کاغەزەکە، ئەحمەد مەنگوڕی بوو. هاتە پێشێ و نووسراوەکەی خۆی خوێندەوە و لە کۆتاییدا بە دەنگی بەرز گوتی: "بەندەزادە، ئەحمەدی مەنگوڕی. جەنابی وەزیر و هاوڕێیانی پێکەنین. بەڕێز حیکمەت گوتی ئینشائەڵلا ئاغازادەت دەبێ. ئەوە بووە هۆی ئەوەی منداڵەکان سەر بکەنە سەر مەنگوڕی و بەردەوام بە ئاغای بەندەزادە بانگی بکەن.

ساڵی شەشی سەرەتاییشم هەر لەو شوێنە تەواو کرد. لە قۆناغی سەرەتایی هەر یەکەمی پۆل بووم. ئەوەشم لە سایەی سەری خوالێخۆشبوو مەلا قادری مودەڕیسییەوە

پێ بڕابوو. ئەو هـاوینـان لە هەیوانەکەی مزگەوتی ڕۆستەم بەگ، کاتی بەنرخی خۆی بۆ من تەرخان دەکرد و من لە حزووریدا فێر دەبووم. ئینجا سـەرەڕای ئەوەی زۆرم حەز لە خوێندن بوو، سـەیرم دەکرد، گەیشـتوومە کۆتـایی، چونکە ئیتر مەهـابـاد دوانـاوەنـدیی لێ نەبوو. بابیشـم دەسـتی ئەوەندە نەدەڕۆیشـت بمنێرێتە یەکێک لە شـــارەکانی دەوروبەر درێژە بە خوێندنێ بدەم. ئەوانی دیکەش وەک من وابوون. هەر بۆیە منـداڵەکـان پـاش تەواوکردنی قۆنـاغی ســـەرەتـایی یـان خەریکی کـار و کاسبی دەبوون، یان دەچوون فێری پیشەیەک دەبوون.

## لافاوەکەی ساڵی ١٣١٥

قوتابخانە تەواو ببوون و هاوین داهاتبوو. شەوانە، زۆربەی بنەماڵەکان لە سەربانی ماڵەکانیان دەخەوتن. هەر خێزانەی نوێنوبانی خۆی دەبردە سەربان و شەوانە لەوێ ڕای دەخست و بەیانیان کۆی دەکردنەوە. شەوانی هاوین، دیمەنی شار بە ڕاستی جوان بوو. لە سەربانان ڕووناکیی چرا و لە ژوور سەریش ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە جریوەیان بوو و چاویان دادەگرت. بەتایبەتی کە دەبووە مانگەشەو، چرا جوانەکەی خوا داییسا. منداڵ لە کۆڵانان یارییان دەکرد. سەربان سەرەڕای هەموو جوانی و خۆشییەکەی، ئەوەی ناخۆش بوو، مێش و مێشەکوێرەی زۆر بوو. هێندێ خێزان تەنانەت نان و چای بەیانییشیان هەر لە سەربانێ دەخوارد.

دۆخی زۆربەی بنەماڵەکان وەک یەک بوو. کەلێنێکی وا لە نێوان هەژار و دەوڵەمەنددا نەبوو. خەڵک پێکەوە ڕووخۆش و خۆمانە بوون. بەهاناوەهاتن و یارمەتیدانی یەکتر، بەشێک بوو لە خەسڵەتی خەڵکەکە. لە ڕووداوە تاڵەکاندا پشت و پەنا و دەستباری یەکتر و لە کار و کاسبیدا ڕاستگۆ بوون. دزی و گزی هەر نەبوو. سواڵکردنیان بە عەیبەیەکی گەورە دەزانی. بنەماڵەیەک، ئەگەر لە برسان قڕیشی هاتبایە، سواڵی نەدەکرد و دەستی پان نەدەکردەوە. لە کۆڵانەکەی ئێمە جاروبار ژنێکمان دەدی کە پێیان دەگوت دایە سوورە. دەموچاوێکی سوورهولی بوو. ئەویش سواڵکەرێکی بەتەواومانا سواڵکەر نەبوو. خەڵکەکە دەستیان

دەگرت. پشتوێنێکی پانی لە پشتی دەبەست و کۆڵێکی گەورەی، کە وێدەچوو دار و نەداری هەر ئەوە بێ، بە کۆڵیدا دەدا. کابرایەکیش هەبوو وەک بزانم ناوی ڕەحمانەکچە بوو، ئەوەیان ژن بوو، بەڵام جلوبەرگی پیاوانەی لەبەر دەکرد. ڕیش و سمێڵی نەبوو. ئەویش کەسێکی بێکار بوو، شەوانە دەچووە ماڵان و هێندێ نوقڵ و نەباتی وەردەگرت و لەگەڵ خۆی دەیبردەوە. سەر لەئێوارێ دەهات، دادەنیشت و نانەکەی لەگەڵ دەخواردی و ئینجا زۆر بە ئەدەب و ڕێزەوە ماڵاوایی دەکرد. خاوەنماڵ زۆر جاران دراوێکیشی لە مستی دەنا. یەکێکیش بوو ناوی خەییام بوو، ئەویان یەکی باڵابەرزی دەموچاو خروێلکاوی بوو. دەنگی خۆش بوو، لە بازاڕێ گۆرانیی دەگوت. بەتایبەتی شیعر و غەزەلەکانی وەفایی دەخوێندەوە و دەیانگوت نەوەی حاجی وەفایی شاعیرە مەزنەکەی مەهابادە. جاروبار دەروێشێکیش بە ڕیشێکی درێژ و کەشکۆڵ و عەبایەکەوە پەیدا دەبوو.

شارەکە دوو شێتیشی هەبوو. یەکێکیان قادرە شێت و ئەوی دی عەلیە شێت. زەڕیان بۆ کەس نەبوو، هەر دووکیشیان ماڵیان لەگەڕەکی حاجی حەسەن بوو.

قادر لەسەر سینییەک شیرینیی دەفرۆشت. بە کۆڵاناندا دەگەڕا و زۆربەی جاران بیانووی دەگرت و پارەی شیرینییەکەی دەدایەوە و دەیگوت ئەو پارەیە قەڵبە. ناچار دەبوو پارەیەکی دیکەی بدەیەی. عەلییش یەکی بەخۆوەی کەتە بوو. منداڵەکانیش لێی دەترسان. کە

لە ماڵێ دەهاتە دەرێ، وەکوو تاوێرەبەردێکی لە هەورازەوە جاڵەی بکەیەوە، دەوری هەڵدەگرت و ڕۆیشتنەکەی دەبووە غاردان. کەسیش نەیدەتوانی پێشی بگرێ. تا ئاخری خۆی بە کۆسپێک یان دیوارێکدا دەدا. زۆربەی کات ئەو بەستەزمانە لەو سۆنگەیەوە بریندار دەبوو. هەرچۆنێک بێ، ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی مانگی گەلاوێژ بوو، سێ سەعاتێک لە نیوەڕۆ لای دابوو، گەواڵە هەوری ڕەش ڕەش بەری ئاسمانی شاریان گرت. هەواکە زۆر گەرم و قورس بوو. لەپێشدا ڕەشەبایەک هەڵی کرد و ئینجا تەرزەیەکی درشت دای کرد. من لە ژیانمدا تەرزەی وا درشتم نەدیتبوو. چەند دەقەیەکی پتر نەخایاند. هورەکان ڕەوینەوە و دیسان هەتاوە گەرم و سووتێنەرەکە هەڵاتەوە. وەک سەعی دەڵێ، دوو شت بەرگەی دوو شتان ناگرن. پیر بەرگەی "بردالعجوز"[1] و بەفر بەرگەی تاوی تەمووز. ئەو تەرزەیە یەکدابەدوو بە هەتاوە گەرمەکەی هاوینێ تواوە و کتوپڕ لافاوێکی بەلرفە و سامناک بەرەو شارەکە وەڕێ کەوت. خەڵکەکە خافڵگیر ببوون. لافاوەکە، چیی وەبەر هات، ڕای دا و بردی. گابەردی گەورەی هەڵکەندبوو. ماڵ و دووکان وێران بوون و کەلوپەل و شت و مەک بوونە پێخۆری ئەو دێوەزمەیە. ئەرخەوانسوورە و قوڕاوێکی خەست بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشت. هاواری مرۆڤ و دەنگی ئاژەڵ شارەکەی پڕ

---

[1]. بردالعجوز: سەرمایەکە لە ٢٥ی ڕەشەمەدا، کە بەفرێکی لەگەڵ دەبارێ، پێی دەگوترێ بەفرە پیرێژنە.

کردبوو. خەڵک ڕایان کردبووە سەربان و بەرزاییەکان. زریکەی ژنان و گریان و هاواری منداڵ، ئاوازی دەف و تەپڵی دەروێشان و نزاکەران حەشرێکی بەرپا کردبوو. من و دایکم چووبووینە سەربان و بە ترسەوە سەیری ئەو دیمەنەمان دەکرد. لافاوەکە لە دەرگای حەوشەی ماڵەکەمانەوە هاتبووە ژووریّ و دیواری سەید قادری بابەسووریی جیرانمانی ڕووخاندبوو و بەویدا دەڕژایە کۆلانی سەید نیزامەوە. بێخەبەر لەوەی ژێرزەمینەکەشمان پڕ بووە لە ئاو. کاتێ ئەو لافاو و بەلا و موسیبەتەی بەسەر شارەکەدا هاتبوو، نیشتەوە، من و دایکم لەسەربانێ هاتینە خوارێ. هەر دایکم دەرگای ژوورەکەی کردەوە، سەیر دەکەین هەرچی هەمانە وەبن ئاوێ کەوتووە.

دایکم بە شین و گریان لەخۆی بەربوو. ئاخر ئێمە جگە لە پەتۆ و لێفەکەی سەربانێ هیچ شتێکی دیکەمان نەبوو. هەموو کەلوپەلەکانی ماڵێ و وشکە و خۆراک و کتێبەدەرسییەکانی من وەبن ئاو و لیتە کەوتبوون. شوێن و پەناشمان نەبوو. لەو حاڵەدا دایکم گوتی: ڕەحمان بچووە بازاڕێ بزانە بابت چیی بەسەر هاتووە. بڵێ بێتەوە ماڵێ. من هاتمە دەرێ، کۆلان هەموو لیتە بوو. بە جلوبەرگی قوڕاوی و سەر و وەزعێکی پەرێشانی خۆمم گەیاندە بازاڕێ. بابمم دیت لەگەڵ کۆمەڵێک کەس لەبەر دووکانە ڕووخاو و داتەپیوەکان کە هیچ شتێکیان تێدا نەمابوو ڕاوەستابوو. دەتگوت لەسەر گۆڕ و کاژێرێک

ڕاوەستاون؛ سەیری دووکانە تاڵانکراوەکانی خۆیان دەکرد. بابم کە لە دوورەوە منی دی، لەو نەگبەتی و پەرێشانییەدا گەشایەوە و لە باوەشی گرتم. پرسیی دایکت چۆنە؟ گوتم شوکور باشە وەرە بڕۆینەوە ماڵێ. پرسیی چی بووە؟ خۆم پێ نەگیرا و دەستم کرد بە گریان، گوتم هیچمان نەماوە. هەرچی هەمانبوو وەبن قوڕ و لیتە کەوتووە. بابم لەگەڵم هاتەوە و نەگبەتییەکەی بەچاوی خۆی دی. ئاواش، بابم زۆر بەغیرەت و بەجەرگ بوو. دڵی دایکمی داوە و گوتی ژنەکە مەگری خوا گەورەیە. دەستمی گرت و بردمی بۆ ماڵی کاک جەلیل کابانی کە لەگەڵ بابم پێکەوە کاسبییان دەکرد. ماڵەکەی ئەو چونکە لە بەرزایی بوو، زیانی وێ نەکەوتبوو. هێندێ نان و پەنیرمان هەڵگرت و هاتینەوە ماڵێ. خەریک بوو شەو دادەهات. لەگەڵ دایکم چووینە سەربان. سەماوەرەکە لەسەر بان بوو. هەڵی کرد و سفرەی ڕاخست. بە حەز و ئیشتیاوە نان و پەنیرەکەمان خوارد. سەرەڕای ئەو بەڵا و نەهامەتییەی بەسەرمان هاتبوو، هێندە شەکەت و خەفەتبار بووین، ئەو شەوە وەها خەوتم، دەتگوت هیچ نەقەوماوە. بەیانی کە لە خەو هەستام، تاو لە پشتمی دابوو. بابم هەر ئەوێ ڕۆژێ لەو حەوشەیەدا، دوو ژووری نهۆمی سەرەوەی لە میرزا عەوڵای کاکاغازادە بەکرێ گرت و بەڕە و لێفەکەی سەربانێمان هێنایە نێو ژوورە تازەکان. ماڵێکی ڕووت و قووت وەک منداڵی هەتیو. بابم لەگەڵ ئاغای کابانی کە شەریکی بوو، ملی نایەوە لە فرۆشتنی پەنیری کووپە. چونکە هیچی دیکەیان بەدەستەوە نەبوو. ئینجا کرێکاریان هێنا و دیوارەکانی ژوورەکەیان چاک کردەوە. بەننا و

کرێکار پارووپان لە ڕۆن کەوتبوو. قایمەقامی مەهابادیش لیستـەیەکی خەسـار و زیانەکانی گرتبۆوە و قەول وابوو لیژنەیەک لە تـارانەوە بێ. چەنـد ڕۆژێکی نەبرد، لیژنەی یارمەتیدان لە تارانەوە گەیشتێ و لە مزگەوتی هەباساغا نیشـــتەجێ بوون. من هەموو ڕۆژێ دەچووم و بەو پێیە کە سـێ سـەر خێزان بووین، ڕۆژانە پـازدە قڕانم وەردەگرت. بابم ئەو پوولەی بۆ کەلوپەل و پێویسـتیی ماڵێ و خاوێنکردنەوی ژێرزەمینەکە خەرج کرد.

## کرانەوەی سیکلی یەکەمی دواناوەندی لە مەهاباد

ورده ورده خەریک بوو ڕووداوی تاڵی لافاوەکە و خەسار و زیانەکانی لەبیر دەچوونەوە. منیش بە گوێرەی تەمەنم لەگەڵ ئاواڵ و منداڵانی گەڕەک خەریکی گەڕان و خۆشڕابواردن و بەتایبەتی تۆپێن بووم. بەڵام بەداخەوە شوێنی تۆپێنەکەمان لەبار نەبوو. بە ناچاری لەگەڵ کوڕەکان لەوسەری باشووری گۆڕستانەکە، خڕکەبەردی زەوییەکی بەیارمان خڕ کردەوە و کردمانە یاریگە.

زۆربەی عەسران لەوێ تۆپێنمان دەکرد و پاش تەوابوونی یارییەکە بۆ حەسانەوەی ماندوویەتیمان دەچووینە قاوەخانەکەی باغی شێخی کە لە نزیک زەویی تۆپێنەکەمان بوو. ئەو قاوەخانەیە چونکە لە نێو باخێکی خۆش و شوێنێکی ئارام و بێدەنگ هەڵکەوتبوو، هاوینان خەڵکێکی زۆر ڕوویان تێ دەکرد. دووکانداره‌کانیش زۆربه‌یان پاش داخستنی دووکان دەهاتنە ئەوێ. مانگی خەرمانان بوو کە دەنگۆ داکەوت ئەمساڵ پۆلی یەکەمی دواناوەندی لە مەهاباد دەکرێتەوە. ئەگەرچی دیار نەبوو ئەو قسەیە ڕاستە یان نا. بەڵام من هەر پێی شاگەشکە و خەنی ببووم. لە نیوەی خەرمانان‌دا بوو دەنگۆکە وەڕاست گەڕا. فەرمانگەی فەرهەنگ، ماڵەکەی میرزا سوڵتانی سوڵتانیانی کە لە کۆڵانەکەی ئێمەدا بوو، بەکرێ گرت بۆ دواناوەندی. چەند ڕۆژ دواتر ناونووسینیش دەستی پێ کرد. بەڵام خەڵکێکی زۆر ناویان نووسی. چونکە دەرچوانی شەشەمی

ســـەرەتایی ســـاڵانی پێشـــتریش ناویان دەنووســـی. بە شێوەیەک کە پاش کرانەوەی قوتابخانەکە و دەسپێکردنی دەرس، ژمارەی قوتابی ئەوەندە زۆر بوون، کە پۆلەکان جێیان نەدەبۆوە. بەو شێوەیە، لە سەرەتای ساڵی ١٣١٦ - ١٣١٥دا پۆلی یەکەمی دواناوەندی لە مەهاباد کرایەوە.

هەڵبەت، کە سـەیری قەڵافەت و بەژن و باڵا و تەمەنی قوتابییەکانت دەکرد، دیار بوو هاوتەمەن نین. هێندێ لە قوتابییەکان خێزاندار بوون و ڕیش و ســـمێڵیان هاتبوو. چەند مامۆســـتایەکیش لە ورمێوە هاتبوون. خاتوونێکی گەنجیـان لەگەڵ بوو، بە نـاوی کەنگەرلوو، کە بیرکـاریی دەگوتەوە. ئەوە بۆ ئێمە شـــتێکی نوێ بوو کە خانمێک لەبری پیاوان وانە بڵێتەوە.

هێشـــتا دوو مانگ لە وەرزی خوێندن تێنەپەڕیبوو، کە فەرمـانگەی فەرهەنـگ نـاچـار بوو قوتـابییە بەتەمەنەکان لەوانی دی جوێ بکـاتەوە و بۆ ئەوەی ئەوانیش لە خوێندن بێبەش نەبن، خولی شـــەوانەی بۆ کردنەوە. بەو جۆرە، هەم قوتـابییەکـانی پۆلی یەکەمی ڕۆژانە کەمتر بوونەوە و هەمیش قەد و قەڵافەت و تەمەنیش زیاتر وێک چوونەوە. ئینجا لەبەر ئەوەی حەوشـــەی دواناوەندییەکە زۆر گەورە و بەرین بوو، ئەو سەعاتانەی بێکار دەبووین، لەوێ یـاریمـان دەکرد. هەڵبەت ڕۆژانی پێنجشـــەممە و هەینی بۆ تۆپێن هەر دەچووینەوە زەوییەکەی تەنیشـــت قەبرســـتـانەکە. ئـاواڵ و هـاوڕێی من لە تۆپێنـدا بەڕێز ڕەحیمی ئاســـەف بوو. چەند وێنەیەکی ئەودەممانم ماوە،

که ئی پووشپەڕی ساڵی ١٣١٦ـــیە، کە یەکەمی دواناوەندی بووین.

لەگەڵ دەســـپێکی ســـاڵی دووەمی دوانـاوەنـدی، قوتابخانەکەیان گواســـتەوە ماڵی میرزا مارفی شـــافعی بەرانبەر مزگەوتی ســـەید نیزام. بەڕێوەبەر و مامۆســـتای فیزیک و شـــیمی، ئەوێ ســـاڵێ ئاغای نەخجەوانی بوو. خەڵکی تەورێز بوو. مامۆســـتای وەرزش ئاغای بێهمەرام و مامۆستای زمانی فەرەنسیشمان مسیۆژان بوو، یەکێک لە ئـاشـــوورییەکـانی ورمێ. من زۆرم حەز لە زمـانی فەرەنســـی بوو. زۆربەی شـــیعرەکـانی لامـارتین و شاتوبریانم لەبەر بوو.

ســـەرۆکی فەرهەنگی ئەودەمی، ئـاغـای تەربیەت بوو. نـاوبراو وانەیەکی بەنرخی فێر کردم. دوانیوەڕۆیەک لە دواناوەندی ڕێوڕەســـمێک هەبوو. ســـەرۆکی فەرمانگەکان و دەمڕاســـت و پیاوماقووڵانی شـــار بانگهێشـــت کرابوون و قوتابییەکان شـــانۆیەکیشـــیان ئامادە کردبوو. من تۆزێک درەنگ چوومە نێو هۆڵی کۆبوونەوەکە. کوڕانی دواناوەندی لە پشتەوەی خەڵکەکەوە ڕاوەستابوون، تەختی عەرزەکەش خشـــتڕێژ بوو. من بە پێڵاوی ناڵچەدارەوە و بە زرموکوت بەســـەر شـــختەکاندا چوومە ئەوســـەری هۆڵەکە و لای کوڕەکان ڕاوەســـتام. تاوێکی پێنەچوو ئاغای تەربیەت بە ســـەری پەنجەی پێ هاتە لامان و بە ئاماژەیەک منی واوە برد و بەوپەڕی میهرەبانییەوە گوتی: کوڕم خۆ ئێرە مەیدانی مەنـگـوڕان نـیـیە ئـاوا بەڕێـیەدا دەڕۆی؟ بەوپەڕی شەرمەزارییەوە گوتم داوای لێبوردن دەکەم جارێکی دی وا

ناکەمەوە. ئەو لەوە زیاتر هیچی نەگوت، بەڵام هەر ئەو وشەیە دەرسێک بوو، کە من ئێستاش لەیادم نەکردووە.

ساڵی سێیەمی دواناوەندییشم سەرکەوتوانە بڕی. تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ، سەرانسەری بوون و بڕوانامەی تەواوکردنی سیکلی یەکەمی دواناوەندییان پێ دەداین، کە دەکرا لە یەکێک لە دامەزراوە فەرهەنگییەکانی وەکوو پەیمانگەی مامۆستایان و یاریدەدەریی پزیشکیدا بەشدار بی. کەچی مخابن هیچ کام لەو ناوەندانە لە مەهاباد نەبوون.

باش بوو پاش کۆتایی تاقیکردنەوەکان و داخرانی قوتابخانە، فەرمانگەی فەرهەنگی مەهاباد کۆمەڵێک قوتابیی ساڵی سێیەمی بۆ بەشداری لە هاوینەگەشتێکدا بۆ ورمێ هەڵبژارد. من بووم و ئاغای هاشمی شیرازی و موحسینی ئاغاخانی و ئەحمەدی مەنگوڕی. ئەو چوارەمان ڕۆژی ١٤ی پووشپەڕی مانگی ١٣١٨ی هەتاوی بە سەرپەرشتیی ئاغای ڕەحیمی لەشکری بەرەو ورمێ وەڕێ کەوتین.

هاوینەگەشتەکەمان لە جاددەی بەند و لە باغێکی خۆشدا بوو. قوتابیی شارەکانی دیکەی سەر بە پارێزگای ورمێش تێیدا بەشدار بوون. پاش ئەوەی گەیشتینێ و بەرپرسی هاوینەگەیشتەکەیان پێ ناساندین، خێوەتێکیان بۆ ئەو چوار کەسەمان تەرخان کرد. بەیانیان سەعات حەوتی بەیانی کەڕەنای سەحەری و بەخەبەرهاتن لێ دەدرا. لە ماوەی سەعاتێکدا دەبوو دەر و ژووری

خێوەتەکەمان گسک بدەین، قاپ و قاچاغ بشۆین و دەست و دەموچاومان بشۆین و خۆ ئامادە بکەین. ڕێک سەعات هەشت شەیپووری ئاڵاهەڵکردن لێ دەدرا. هەمووومان لەبەر ئاڵاکە بە ڕیز دەوێستاین و یەکێک لە پێشەنگەکان، لەسەرخۆ پەتی ئاڵاکەی ڕادەکێشا و ئاڵا نەرم نەرم دەچووە سەرێ و لەو حاڵەدا لەگەڵ سڵاوی پێشەنگانەدا سێ پەنجەی دەستی ڕاستمان بە لای برۆمانەوە دەنا. پاش ڕێوڕەسمی ئاڵاهەڵکردنێ، وەرزشمان دەکرد ئینجا بەرچاییمان دەخوارد و ئیتر بەو جۆرە ڕێوڕەسمەکە تا سەعات شەشەی دوانیوەڕۆ بە ڕێکوپێکی هەتا هێنانەخوارەوەی ئاڵا بەردەوام دەبوو.

شەوانەش لە خێوەتەکاندا بەرنامەی تەفریحی هەبوو. گەشتەکەمان لە کۆتایی مانگی پووشپەڕدا تەواو بوو و دوایین ڕۆژەکە بە ئوتوبووس بردیانین بۆ بەندەری گوڵمانخانەی دەم گۆلی ورمێ. ئێمە لە گۆلی ورمێدا مەلەمان کرد. سەیر ئەوە بوو لە ئاوەکەدا نوقم نەدەبووین، چونکە خوێی زۆر بوو و ئاوەکە قورس بوو و لەکاتی مەلەکردنێدا وەسەر ئاوەکە دەکەوتین. جا چونکە ئاوەکە زۆر سوێر بوو، هارویمان لەگەڵ خۆمان بردبوو، بۆ ئەوەی ئەگەر ئاوەکە وەچاو و لووت و دەممان کەوت، خێرا بە هارویێ بیسڕینەوە و سوێرییەکەی نەهێڵین. پاش مەلەکردنەکە، ڕێوڕەسمی ماڵاوایی بوو و ماڵاواییمان لەو کەسانە کرد وا تازە لەگەڵیان ئاشنا ببووین.

یەکێک لە باشییەکانی ئەو هاوینەگەشتە، دۆستایەتیی نێوان قوتابییانی شارەکان بوو و، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاهێنانی

منداڵەکان بە ڕێکوپێکی و ڕەچاوکردنی پاکوخاوێنی.
ئینجا منداڵەکانی فێر دەکرد ئەگەر لە بنەماڵەی خۆیان دابڕان بتوانن بەخۆیان ڕا بگەن و کاروباری خۆیان جێبەجێ بکەن.

دیتنی شـاری ورمێ و هـاتوچوونی پەیتوون و ئەسکەلەی گوڵمانخانە و مەلەکردن لە ئاوی گۆلی ورمێدا گەلێ بیرەوەریی شیرین و لەبیرنەکراویان لەگەڵ خۆ هێنا. جگە لە هەموو ئەو شتانە و لایەنی خۆشڕابواردن و شادیهێنی مەسەلەکە، شتێکی کە لەڕادەبەدەر بۆ ژیانی من بەسوود و کاریگەر بوو، بانگهێشتکرانم بوو بۆ بەشداربوون لە پەیمانگەی مامۆستایان و درێژەدان بە خوێندنم لەوێدا. ئەو شتەی کە هەر بە خەیاڵیشمدا نەدەهات و نیعمەتێکی گەورە بوو. ئیتر بە ورە و دەروونێکی تژی لە خۆشی و هیواوە هاتمەوە نێو ئامێزی بنەماڵەکەم و خەمی دووریيە چاوەڕواننەکراوەکەم لە دڵی دایکم ڕەواندەوە. ئینجا مزگێنیشم بە دایکم و بابم دا کە هەل و دەرەتانی درێژەدانی خوێندنم بۆ ڕەخساوە. بابم بە ڕواڵەت دڵخۆش بوو. بەڵام دایکم خەمێکی قورس دایگرت. ئەو دەیدی کە تاقانە کوڕەکەی بەو زوانە لێی دادەبڕێ. دایکە حەقی بوو، چونکە بەپێی بیرکردنەوەی ئەو سەردەم و بە گوێرەی ئەوەش کە ئیتر ئەوان تەمەنیان هەڵکشابوو، تاقە شتێکی بۆ دایکم گرینگ بوو، من بووم. هەموو دنیا لایەک و بەتەنێ من لایەک. کە بیری لەوە دەکردەوە من لە شارێکی غەریب و بێکەس

دەژیم، خەمێکی گران و تاقەتپڕووکێن دایدەگرت. گوتم دایە ورمێ ئەوەتا چەند سەعاتێک لە مەهاباد دوورە. هیچ بۆ نیگەرانی نابێ. خەرجی خوێندنیشم لەسەر ئەوانە. لەگەڵ ئاواڵەکانم لە شوێنێکدا دەژیم. ئاگامان لە یەکتر دەبێ. کوڕەکەی میرزا عەولای شیرازییشم لەگەڵە. سەمەدی خانمی دایکی زۆر خۆشحاڵ بووە بەوە. دایکم دیار بوو تۆزێک ئۆخژنی بەدڵیدا هاتەوە و هیچی نەگوت.

دایە گیان، هیوادارم لەسەر ئەو خەم و پەژارەیەی دەستی ڕۆژگار بە ملی تۆی میهرەبان و فیداکاریدا هێنا، گەردنمت ئازاد کردبێ. هەر جارێکی شیعرەکەی "دڵی دایک"ـی ئیرەج میرزا دەخوێنمەوە (من ئێستاش زۆر جاران ئەو شیعرانە لەبەرخۆمەوە دەڵێمەوە) دۆخی دایکمم بیر دەکەوێتەوە و خەم دڵم دەلەرزێنێ. بەڵام خۆ لاوێتیی ئەو شتانەی بەگوێدا ناچێ.

## خوێندن لە پەیمانگەی مامۆستایان

چەند ڕۆژێک پێش تەوابوونی مانگی خەرمانان لەگەڵ ئاغای هاشمی شیرازی چووینە ورمێ و پاش ناونووسین لە پەیمانگەی مامۆستایان، بە فەرمی لە سەرەتای مانگی ڕەزبەرەوە چوومە پۆل و ملم لە خوێندن ناز هەر قوتابییەی مانگێ هەشت تمەنیان یارمەتیی خوێندن دەدایێ. بابیشم ڕایسپاردبوو، مانگێ پێنج تمەن لە ئاغای حاجی مستەفا جەفایی بازرگانی مەهابادی وەرگرم، کە لە بازاڕی توتنفرۆشانی ورمێ توجارەتخانەی هەبوو. بەو جۆرە، مانگێ سێزدە تمەنم وەردەگرت.

من و ئاغای هاشمی شیرازی و ڕەسووڵ میکاییلی پێکەوە ماڵێکی سەربەخۆمان لە سەرەتای بازاڕ گرت، مانگێ بە شەش تمەن. لە کەلوپەلیش جگە لە چەند پەتۆ و پەڕەمێزێک و قۆرییەک و چەند ئیستیکان و قاپ و کەوچکمان نەبوو، کە لە بازاڕێ کڕیبوومان. نیوەڕۆیان کە لە پەیمانگا دەهاتمەوە، چونکە کاتی چێشتلێنانمان نەبوو، سێ دیزەمان لە قاوەخانەکەی سەری کۆڵانێ دەکڕی و دەمانبردنەوە ماڵێ. خوێندنەکەمان زۆر بەباشی دەچووە پێشێ. من و ئاغای شیرازی چونکە زۆرمان حەز لە تۆپێن بوو، لە دەستەی تۆپێنی پەیمانگادا ناومان نووسی و لە چەند کێبەرکێشدا بەشداریمان کرد. من بەرگریی ڕاست و شیرازی چەپ بوو، جا چونکە

هەردووکمان کورتەبالا بووین، سەیرکەر هاواریان دەکرد، بچکۆلانە لێی بدە.

پاش نیوەڕۆیانیش دوای دەرسخوێندن و تەکلیفەکانی قوتابخانە، پێکەوە دەچووینە قاوەخانەی شێخ لە شەقامی پالەوی. ئەوێ شوێنی کۆبوونەوەی هاوولاتییەکان بوو و جا چونکە چەند هۆدەشی بۆ کرێ هەبوو، زۆر جاران لەوێ دەمانتوانی خەڵکی لای خۆمان ببینین و ئینجا چێژ لە چای بەتام و تۆخی شێخ وەرگرین. جاری واش بوو، شیوەکەمان کە هێلکەوڕۆنێک بوو، هەر لەوێ دەخوارد. ڕۆژانی پشووش دەچووینە دەم چۆمی بەتایبەتی کاتی گەیشتنی تووەسپیی دەم چۆمەکە، کە پێیان دەگوت تۆتغ واتە باغەتوو، گەلێک خۆش بوو. سینییەک توو بە دۆوە بایی قڕانێک بوو. هەم سەیرانگەی خەڵکی بوو، هەم شوێنێک بۆ خواردنی تووی شیرین و بەتام. شەوانی هەینییش دەچووینە سینەما، ئەودەمی لە مەهابادێ سینەما نەبوو. نیوەڕۆیانی جومەعەش دەچووینە کەبابخانە، نەفەرێک کەباب بە دۆی سارد و زەردێنەی هێلکەوە بە سێ شایی، واتە سێ پەناباد بوو. بە کوردی بە دە شایی دەڵێن پەناباتێک و بە چوار شاییان دەگوت یەک عەباسی. قڕانێک بیست شایی بوو و تمەنێک دە قڕان.

دووەم ساڵی پەیمانگەم، چونکە بە ڕاستی چێشتلێنان زۆر ئەستەم بوو، لەو ڕووەوە تووشی زەحمەت بووم. من لەگەڵ ئاغای هاشمی خەلیلزادە چووینە ماڵی خاتوونێکی بەڕێز لە بنەماڵەی سەوڵەت، مانگێ بە نۆ تمەن. ناوی خانماغا بوو. خخانماغا باری ژیادیان لەبار و باش بوو.

خانمێکی بێوەژن بوو، چل چلوپێنج ساڵێک تەمەنی بوو، دوو کوڕی هەبوو، یەکێکیان لە تاران لە کۆلێژی شارەوانی دەرسی دەخوێند و ئەوی دیکەی بەناوی فەیرووز دە ساڵانە بوو و لەگەڵ خۆی دەژیا. خانووەکی هەبوو، سێ حەوشەی تووناوتوون، حەوز و ئاوێکی زۆر کە بە حەوشەکاندا دەڕۆیشت. حەوشەکەی ناوەڕاست داروباری هەبوو و زۆر خۆش بوو. ئەو ماڵە لە گەڕەکی کۆمۆر مەیدانی واتە مەیدانی ڕەژوو هەڵکەوتبوو. خانم پێویستی بە پارە نەبوو، بەڵام هەر بۆ ئەوەی کوڕە چکۆلەکەی بەتەنێ نەبێ، ئێمەشی قبووڵ کردبوو. چەندی بڵێی ژنێکی پاکوخاوێن و زۆریش ئیماندار بوو. سەری چووبایە نوێژی نەدەچوو و چەندی بڵێی لەگەڵ ئێمەش میهرەبان و خولقخۆش بوو. خواردنی زۆر خۆشی دروست دەکرد. ئەوەندەی ڕۆن لە هێلکەوڕۆنەکە دەکرد، کە وەکوو گۆشتاو نانمان تێ دەگوشی. من بە پێچەوانەی برادەرەکەم، هەرگیز ئیرادم لێ نەدەگرت و چیی لەپێش دانابایەم بە تاسەوە دەمخوارد هەر بۆیە زۆر کەیفی بە من دەهات. بابیشم لە مەهابادەوە جاروبار تووتنی دەنارد. چونکە خانماغا جگەرەکێش بوو، ئەو بۆخۆی جگەرەکانی دەپێچاوە. جاروبار منیش یارمەتیم دەدا. نێرگەلەیەکی زۆر جوانیشی هەبوو. لە دەم حەوزەکە دادەنیشت و بە حەزەوە قوڵتەقوڵتی لە نێرگەلە دێنا. باغێکیشی لە شاری هەبوو. هاوینان دەچووە ئەوێ و زۆربەی کات پێویستییەکانی زستانێی دابین دەکرد. مێوژ

و گوێز و گۆشتی قاورمه و ماستی تۆراغ و كەنگروماست و شیرینیی باسوخ و نانێکی زۆری دەکرد و لەسەر تەختەکە دایدەنان یان بە میچەکەیەوە هەڵدەواسین. ئەوە ئەو شتانە بوون کە لە ماڵەوە هەیبوون. جا من شـــیرینییەکەم زۆر پێخۆش بوو.

ئەو دۆشاوەش کە لە ترێی باخەکەی خۆی دەیگرت زۆر خۆش و بەتام بوو. نانی ئێوارەمان زۆربەی کات ماست و دۆ بوو، یان شیر برنج بە دۆشاو. بەو حاڵەشەوە لەوپەڕی بێخەم و خەیاڵیدا زۆر بە دەســــت فەیرووزی کوڕیەوە ناڕەحەت بوو. فەیرووز منداڵێکی شـەڕانی و دەرسنەخوێن بوو. زۆربەی کات نەدەچۆوە قوتابخانە. بەیانیان دەســـتی دەدا جانتای کتێبەکانی و بە ڕواڵەت دەچووە قوتابخانە، بەڵام حەفتەیەک دواتر هەواڵیان دێنا کە ئەو حەفتەیە هەر نەچووەتەوە قوتـابخـانە. دایکی دەیبردە ژێرزەمینێ، تـا دەبزووت لێی دەدا. بەڵام بێ فایدە بوو، هەر بە گوێشـــیدا نەدەچوو. بە تێهەڵدانێ ڕاهاتبوو. جگە لەوەش، ئەو دایکێکی دلۆڤان بوو. خودا بە کەرەم و گەورەیی خۆی، ئەو خاتوونە دڵ و دەروونپاک و ئیماندارە بخاتە بەر تیشـــکی ڕەحمەتی خۆی. من لە ژیانمدا هەر بە چاکە یادم کردووەتەوە.

مەرگی دایک

سەرەتای زستانێ بابم هەواڵی نارد کە دایکم نەخۆشە و زوو بچمەوە مەهاباد. ئیزنم لە ئاغای نازمیی بەرپرســـی پەیمانگە وەرگرت و خانماغاشم ئاگادار کردەوە. دەمودەست بەرەو مەهاباد وەڕێ کەوت. کە گەیشـــتمەوە ماڵێ، دایکم بەجێوبان کەوتبوو و خوشـــکیشـــم لە ژوور ســـەری بوو.

دایکم هەر ئێســـک و پرووســـکی لێ ماوەتەوە. گوتی، ڕەحمـان چـاکت کرد هـاتیەوە. دایکمم لە بـاوەش کرد، ڕوومەتە زەرد و وشـــکهەڵاتووەکـانیم مـاچ کرد. تـاڵی ڕەشـی لە سـەریدا نەمابوو. کە چاوی بە من کەوت، تین و گوڕێکی بەبەردا هاتەوە. بە خوشکمی گوت، هەڵیستێنێ. داینیشاند، لەو دەمەوە تۆزێک باشتر بوو. حەفتەیەک لای دایکم مامەوە.

دایکم بـاشـــتر ببوو. ئەویش و خەڵکەکەی دیکەش پێداگر بوون بچمەوە ورمێ، چونکە ئەگەر بەفر کەوتبا، ســـەفەر ئەســـتەم دەبوو و جاری وابوو ڕێیەکە تەواو دەبەسـترا. ناچار چوومەوە ورمێ، بەڵام بە ڕاسـتی وەک دەیانگوت لەگەڵ یەکەم بەفری زســـتانێ ئیتر ئاگام لە دایکم بڕا. ئاخری چەند ڕۆژێک پێش جێژن چووم هێندێ دیاریم کڕی و لەگەڵ یەکەم وەســـیلە خۆم گەیـاندەوە مەهاباد. کە گەیشتمە گەراج، بەوپەڕی سـەرسووڕمانەوە کـاک موتەلیبی میکـاییلیی زاوامم لەوێ دی. پـاش چاکوخۆشـــی، گوتی با بچینە مـاڵی ئەوان. گوتم دەبێ بڕۆمەوە مـاڵێ. ئەی دایکم چۆنە؟ هیچ ئـاگـات لێیەتی؟ گوتی بەڵێ هەموان لە مـــاڵی ئێمەن. وەڕێ کەوتین. جانتایەکی بچووکیشم پێ بوو. ماڵەکەی وی لە گەڕەکەی حاجی حەسـەن لە تەنیشـت بازاڕ بوو. کە گەیشـتینەوە و وەژوور کەوتین، هەر خوشـکم منی دی، خۆی پێ نەگیرا لە بانگی دا و بە گریانەوە باوەشـی پێدا کردم. ئیدی زانم دایکم مردووە و بۆ وی دەگری. خۆمم پێ نەگیرا، بە

کوڵ گریام. ببووە قیامەتێک. خوشکم و منداڵەکانی، هەموومان وێکڕا دەگریاین. گوتم خوشکێ بۆچی ئاگادارتان نەکردمەوە؟ گوتی بابم نەیهێشت. جا ئاگاداریشیان کردبامەوە فایدەی چی؟ چ دەکرا؟ دایکم زۆر نەخۆش بوو و دیار بوو ناژی. هیچمان لەدەست نەدەهات. بابیشم هاتە ماڵی خوشکم. نازانم شەرحی ئەو خەمە بێبڕانەوەیە چۆن بنووسم. ئەوێ ڕۆژێ نەمتوانی دەم لە هیچ بدەم. بۆ سبەینێ کە یەکەم ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ١٣٢٠ بوو، بە دڵێکی پڕ لە خەم و پەژارەوە لەگەڵ خوشکم چوومە سەر قەبران. خۆم بەسەر گڵکۆی دایکمدا دا و چەندی توانیم گریام و گڵی گڵکۆیم ماچ کرد و بۆنم پێوە کرد.

بە تکای خوشکم هەستام و چووینەوە ماڵی وی. ڕۆژی جێژن و خۆشی بوو، بەڵام بۆ ئێمە ڕۆژی ماتەم و تازیەباری. تا سێزدەبەدەر لە مەهاباد مامەوە، بەڵام هەموو ڕۆژێ دەچوومە سەر قەبری دایکم. لەو سێزدە ڕۆژەدا نەیانهێشت بچمەوە ئەو ماڵە بچکۆلانەیەی دایکم لەوێدا گیانی سپاردبوو. ئاخری پاش سێزدە ڕۆژ، بە کۆڵێک خەم و پەژارەوە گەڕامەوە ورمێ. کە چوومە سەر پۆل، هاوپۆلییەکانم سەریان سووڕ ما. لەو ماوە کورتەدا زۆر لەڕ و لاواز ببووم. ساڵی خوێندنەکەم سەرەڕای هەموو ژان و ناخۆشی و خەمێکی کە لەگەڵ خۆی هێنا، تەواو بوو و لەگەڵ تەواوبوونی تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ، هاتمەوە مەهاباد.

## گوندی گلۆلان

بـابم چونکه دەیزانی که پـاش مەرگی دایکم، ئەو هـاوینەم له مەهـابـادێ خۆش بۆ نـاگوزەرێ، بۆیه لەگەڵ کاکەڵلاغا، که خاوەنی چەند گوندێکی مەحاڵی گەورک بوو، قسەی کردبوو و ڕێک کەوتبوون، وەختێک هاتمەوە مەهـابـادێ، بچمە گلۆلانێ، لەوێ هەم بگەڕێم و هەم بە منداڵەکانی کاکەڵلاغا و خزمانی بخوێنم. بەشکم به دوور کەوتنەوە لە شـاری خەم و خەفەتی مەرگی دایکمم لەبیر بچێتەوە. هەر بۆیه چەند ڕۆژێک پاش ئەوەی هاتبوومەوە مەهاباد لەگەڵ نۆکەرێکی کاکەڵلاغا بەرەو گوندی گۆرین وەڕێ کەوتم. بۆخۆشـم ئەو سـەفەرەم زۆر پێ خۆش بوو. سـەرەڕای ئەوەی گوندەکە زۆر لە شـاری دوور نەبوو، بەڵام بە پێی ئەوە ڕێیەکە، ڕێی ماڵات و ناخۆش بوون بەیانی بە ئەسپ وەڕێ کەوتین، عەسرێ گەیشتنێ. هێندێ کتێبیشم لەگەڵە خۆم بردبوو.

هەوای کوێسـتان و کتێبخوێندنەوە و ئەسـپ سـواری خەمڕەوێنێکی باش دەبوون. لەبەر هەیوانی دیوەخـانێ، کاکەڵلاغا و چەند پیاو و کوڕ ڕاوەسـتابوون. که له ئەسـپەکە دابەزیم، کـاکەڵلاغـا بەرەوپیرم هـات و دەسـتوموشـتاقی لەگەڵ کردم. لەگەڵ ئەوانی دیکەش دەستوموشتاقم کرد. دوو کوڕێژگەی کاکەڵلاغا، یەکێکیان ناوی حەسـەن و ئەوی دی ڕەحان بوو. پێکەوە لە بێڵایێ دانیشـتین. دەمودەسـت چایان هێنا. لە پێشـمانەوە تا چاو هەتەری دەکرد دەر و دەشـت بوو. پاش قسـە و باسـێکی

زۆر، وا دانرا لە بەیانییەوە دەرس بە منداڵەکان بڵێمەوە. هۆدەی سەر دیوەخانێمان کە چۆل بوو، کردە پۆل.

بەرنامەی کارەکەشم وا دارشت، کە دەرسەکان تا نیوەڕۆ تەواو بن. بۆ ئەوەی دوانیوەڕۆیان دەرفەتێک بێ بۆ پشوودان و خوێندنەوە و ئەگەر هەڵیش کەوت، گەڕان و ئەسپسواری. خواردنیشیان لە ئەندەروونێوە بۆ دێنایین، جاروبار بە سواری بەو دەشتەدا دەگەڕاین و دەچووینە گوندەکانی دەوروبەریش. باغی میوە و بێستان و شت هیچ لەگۆڕێ نەبوو. وەرزێر ژیانێکی مەمرە مەژییان هەبوو.

منداڵ ڕووت و قووت و ژن بە جلوبەرگی شڕ و کۆنەوە بەردەوام خەریکی مریشک و جووچکە بەخێوکردنێ بوون. لە تەواوی ئەو مەحاڵەدا دەرمانگەیەکی تێدا نەبوو. ئەگەر یەکێک نەخۆش دەکەوت، دەبوو بە هەزار زەحمەت بیگەیەننە شاری. هیچ جۆرە میوەیەکیش دەست نەدەکەوت. جاری وابوو چەرچی بە سواری وڵاغ چەند تێڕ و توورەگەیەکیان کاڵەک و شووتیی خراپ دێنایە ئاوایی و بە گەنم و جۆ و مریش و کەڵەشێریان دەگۆڕییەوە. ئێمە شەوانە لەگەڵ حەسەن و ڕەحمان لە دیوەخانێ دەنوستین. زۆربەی جاران هەقایەتبێژیش دەهات، تا منداڵ خەویان لێ دەکەوت، هەقایەتیان بۆ دەگێڕانەوە. بە ڕۆژ زۆر گەرم بوو و هیچ کەرەستەیەکی فێنککەرەوەش نەبوو. لە هەمووش خراپتر ئەوە بوو حەمامیش نەبوو بۆ ئەوەی خۆمان بشۆین. ناچار لە حەوزی مزگەوتێ بە سابوون خۆمان دەشوشت و جلی ژێرەوەمان بە سابوونێ دەشوشت. جلوبەرگ بۆنی ئارەقەیان لێ دەهات. خۆشترین ڕابواردنی ئێمە، سەیران و

ســـــواری بوو، که ئەویش زۆر زوو لێی وەڕەز بووم. ڕۆژی هاوینیش خۆ نابڕێنەوە. ئەو چەند کتێبەی لەگەڵ خۆمم بردبوون و خوێندبوومنەوە و کتێبی دیکەشـــی لێ نەبوو. چەند ســـــەعات دەرســــگوتنەوەی ڕۆژانەش کە تەواو دەبوو، نە شـــوێنێک هەبوو بچین و نە جێیەک بۆ سەیران و نە کەسێک کە بکرێ دوو قسەی لەگەڵ بکەین وەرزێڕ دەچوونە دەشتێ. ژنەکانیان لە کۆلیتە قوڕینەکاندا خەریکی کــاروبــاری مــاڵێ و بەخێوکردنی منـداڵە ڕەشوڕووت و کز و لاوازەکانیان بوون. بە ڕاستی ژیانی بێ ئامانج، هەر کوێرەوەرییە.

خەرمـانـان بوو. جووتیـار بۆ فرۆشـــتنی بەروبووی خۆیان، کڕینی کەلوپەلی پێویســت دەچوونە شــارەکانی مەهـابـاد و بۆکـان و هەواڵی نـاخۆش و تـاڵیـان دێنـاوە. دەیانگوت گۆیا ڕووس هێرشــــیان کردووە و بەو زوانە دەگەنە ئێرەش. خەڵک ترسیان ڕێ نیشتبوون. پیرەپیاوان کە بیرەوەریی خۆشـــیان لە جەنگی نێودەوڵەتیی یەکەم نەبوو، گەلێ چیرۆکی تاڵ و سامناکیان لە کوشتارەکەیان دەگێڕاوە. مامی کاکەڵڵاغا کە پیرەپیاوێکی پەککەوتە بوو و چەند وشـــەیەکی ڕووســـیشـــی دەزانی، دەیگوت: پەنا بەخوا ئەگەر ئەو بێدینانە پێیان بگاتە ئێرە، ڕەشـەکوژمان دەکەن.

چەند ڕۆژ پاش ئەو هەواڵانە، چەند فڕۆکەیەک هاتنە ســـەر گۆلان. کۆمەڵێک کاغەزیان بەردانەوە. جووتیار چەند دانەیەکیان کۆ کردەوە و هێنایانە لای ئێمە. هەموان

له من کۆ ببوونەوه و دەیانویست بزانن چ باسە؟ ڕاگەیەنراوێک بوو، لەلایەن سوپای سۆڤیەتەوە، دەیگوت: سوپای یەکیەتیی سۆڤیەت بۆ دەرپەڕاندنی سیخوڕە ئەڵمانییەکان و پووچەڵکردنەوەی تابووری پێنجەم سنووریان بڕیوه و هاتوونەته ئێران. هیچ مەترسییەک لەسەر خەڵکەکه نابێ و کاریان به خەڵکی نەداوه. سەرەڕای ئەوەی جووتیاران هیچ لەو شتانه نەدەگەیشتن، بەڵام هێور ببوونەوه. ئەوەی بۆ ئەوان گرینگ بوو، تێرکردنی زگی ژن و منداڵەکەیان بوو. ئەو هەواڵانه نه دڵخۆشی دەکردن و نه خەمبار. چەند ڕۆژ دواتر هەواڵ هات که شاری مەهابادیان بۆمباران کردووه و کۆمەڵێک کەس کوژراون. سەرم سووڕ ما، مەگەر له ڕاگەیاندنەکانیاندا نەیانگوتووه کاریان به خەڵک نییه؟ ئەی بۆمبارانی شاری یانی چی؟ زۆر نیگەرانی بابم بووم. هەتا نامەیەکیم بۆ هات و تێیدا گوتبووی من باشم و وا زوو مەیەوه شاری. ژەندەرمه هەموو بنکەکانیان چۆل کردبوو. گوند و ڕێگەوبان ئەمنیەتیان نەمابوو. هاتوچۆ زۆر به دەگمەن هەبوو. شەوانه کاکەڵڵاغا لای ئێمه دەنوست و نەدەچۆوه ئەندەروون. نۆکەر و پارێزەری دیوەخان و ئەندەروونیشی زیاد کردبوو. هەموو ڕۆژێ هەواڵی ناخۆش له دەوروبەرەوه دەهات. هەژاریی خەڵکیش ، ئەوەندەی دیکه بازاڕی دزی و تاڵن و بڕۆ و خەڵک ڕووتکردنی له ڕێگایان گەرم و خۆشتر کردبوو. به دەردی دەڵێن "دز، له بازاڕی شێواو دەگەڕێ"، ڕاست ئەوه بوو.

# هاتنی حەمەڕەشید خان

لەو بارودۆخەدا دەیانگوت حەمەڕەشید خان لە سنووری عێراق پەڕیوەتەوە و بەرەو بانە دێ و لەو ڕۆژانەدا دەگاتە گڵۆلان. دیار نییە بە چ نیەتێک دێ. هێندێ دەیانگوت بەتەمایە لەگەڵ هێزی دەوڵەت بەشەڕ بێ و لە بانە حوکمەت بکا. هێندێکیش پێیان وابوو ئینگلیزان ناردوویانەتە ئەم ناوچەیە، بۆ ئەوەی نەهێڵێ ڕووسەکان بگەنە ئەم مەڵبەندە. من لەو سەروبەندەدا پرچم زۆر درێژ ببوو. خۆ گوندیش دەللاکی لێ نەبوو سەرم کورت بکەمەوە. جووتیار دەیانگوت وا باشترە بیتاشم، نەکا پیاوەکانی حەمەڕەشید خان ئەزیەتم بکەن و پێیان وابێ پیاوی دەوڵەتم. منیش گوێم نەدەدا بەو قسانە، ئەوەندە نەبێ پێچ و کڵاوم لەسەر کرد، بۆ ئەوەی هەم سەرم داپۆشم و هەمیش بزانن کوردم. ئاخری حەمەڕەشید خان بە خۆی و لەشکرێکی چەکدارەوە هاتنە گڵۆلان، کە دەیانگوت سێسەد کەس دەبن. کاکەڵڵاغا و خزم و کەسەکانی لە پێش دیوەخانێ ڕاوەستابوون و چاوەڕێی بوون. ڕەشید لە پێش سوارەکانییەوە دەهات.

تەپوتۆز وەسەر گوندەکە کشابوو. حەمەڕەشید خان لەپێش دیوەخانێ ڕاوەستا و کاکەڵڵاغا بە غاردان چوو لە دابەزینێ یارمەتیی دا و بەخێرهاتنی کرد و دەستی گوشی. هێندێ لە سوارەکانیشی دابەزین. ڕەشید خان چەکمەی ملدرێژی لەپێدا بوون. یەکی کورتەباڵا بەڵام تا

بلێی گورج و توندوتۆڵ دیار بوو. زیرەکی و چاوکراوەیی لە ڕوخسـاری دەباری. لەگەڵ ژمارەیەک لە سـوارەکانی وەژوور کەوتن. نۆکەرەکـانی کـاکەڵڵاغـا خێرا پیـاڵەی چـایـان لەپێش دانـان. بەڵام من چونکە لێیـان دوور بووم، گوێم لە قسـەوباسیان نەدەبوو. بۆ فراوین میوانی کاکەڵڵاغا بوون، هەتا ورگیان گوتی بەسـە، خواردیان، بەتایبەتی لە خواردنی ڕانەمریشکدا زۆر وەستا بوون.

ئاخری پاش نان و چا، سـوار بوون و وەک دەیانگوت بەرەو بـانە وەڕێ کەوتن. هـاتنی حەمەڕەشـید خـان بۆ گونـدەکە، وەکوو لافـاوێـک بوو، کە هەڵـدەسـتێ و زوو دەنیشـێتەوە. بەڵام کاولکارییەکی کە لەپاش خۆی بەجێی هێشـت، تاڵانی سـفرەی نان و برینج و گۆشـت و مریشـکی کاکەڵڵاغا بوو. تەپوتۆزی ڕەشید خان لە دوورەوە دەبینرا و وردە وردە وەک تراویلکەیەک لە چاوان ون بوو.

هەڵبەت ئەو خۆڕانـان و عەشـیرەتبـازییـانە جگە لە بەهێزکردنی گیانی عەشایەری و نەهێشتنی تەناهی و ئارامی و تـاڵانچیەتی هیچ بەرهەمێکی نەبوو. دواتر هەر نەمزانی حەمەڕەشـید خان چیی کرد و چیی بەسـەر هات. ئەو دۆخە لەمێژە لەو ناوچانەدا هەر هەبووە. هەر لەگەڵ لاوازبوون و نەمانی دەسـەڵاتی دەوڵەت و حوکمەت، کەسـانێک بە ناوی خزمەتی خەڵک و دروسـتکردنی کەشـوهەوایەکی سـیاسـیی لەبار و باش، بەڵام تەنیا بە مەبەستی تاڵان و بڕۆ و بشێوی نـانەوە، کۆمەڵێـک خەڵکیـان لە خۆ کۆ کردووەتەوە. هەر ئەوانەش ڕوخسـاری کۆمەڵایەتیی کوردانیان لەبەر چاوی خەڵک ڕەش کردووە. بێخەبەر لەوەی حەمەڕەشـید خانەکان

دێن و دەڕۆن و هیچ کاریگەرییەکی ئەرێنی و باشیان لێ نامێنێتەوە. جگە لەوەش، هیچ نەیاندەزانی کە سەردەمی خانخانی بەسەرچووە.

## کەوتنی سەربازگەکان

پاش مەسەلەی حەمەڕەشید خان، ڕۆژێکیان خەبەریان هێنا، کە شەوێ دز تەویلەی کاکەڵلاغایان بڕیوە و ٩ سەر ئەسپیان بردووە. دیار بوو ئەوە بە یەک کەس ناکرێ، بەڵکو کاری چەند کەسی چەکدارە. کاکەڵلاغا نۆکەرەکانی خۆی ناردە گوندەکانی دەوروبەر، بەشکم شوێنی دزەکان هەڵگرن. پاش چەند ڕۆژ گەڕان، هەواڵیان هێنا کە دزەکان لە ئێران دەرچوون و چوونەتە ئێراقێ.

لەو دەمەدا هەواڵ هات کە بنکەی سەربازیی سەردەشت گیراوە و کەوتووەتە دەست خەڵکی و هەرچی چەک و تەقەمەنییە تالان کراوە. ئەفسەر و دەرەجەدارەکان توانیویانە جلەکانیان بگۆڕن و خۆیان قوتار بکەن. خەڵکی گوندێ گلۆلانیش هێندێ تفەنگ و لەگەڵیاندا تیربارێکیشیان هێنابوو. تیربارەکەیان لە هەیوانی دیوەخانێ دابەستبوو، ڕۆژانە تەقەیان پێ دەکرد و نیشانەیان دەشکاند. بە دەردی کوردە، گوللە و باڕووتی بایزاغایە و تەق لە کەندالێ. دۆخێکی ناخۆش بەسەردا هاتبوو، ئیتر من تەواو وەڕەز ببووم و دەمویست هەرچۆنێک بێ بچمەوە مەهاباد. لەگەڵ کاکەڵلاغا باسم کرد. سەرەڕای ئەوەی ڕازی نەبوو و ڕێیەکان پڕ مەترسی بوون، ڕۆژی ٢٤ی خەرمانان لەگەڵ نۆکەرێکی کاکەڵلاغا گەڕامەوە شاری. قەول وابوو بۆ ئەو ماوەیەی دەرسم گوتبۆوە، پەنجا تمەن و دوو تەنەکەم ڕۆن بدەنێ. بەڵام لەو بارودۆخەدا من بە دەستبەتاڵی هاتبوومەوە. کە

گەیشـــــتمەوە مـاڵێ، دەروجیران گوتیـان بـابـت تووتنی بردووەتە شاری خۆی، لەوێ بیفرۆشێ. جوان دیار و بوو ڕواڵەتی شار تەواو گۆڕاوە.

خەڵکی چەکدار دەهاتن و دەچوون. دامودەزگای میری بەشـی زۆریان داخرابوون و سـەربازگەی مەهابادیش بە مەرەدی سـەربازگەی سـەردەشـتێ چووبوو، چەک و تەقەمەنییەکەی کەوتبووە دەسـت خەڵکی بەتـایبەتی عەشـایری دەوری مەهاباد. لە هێزەکانی میری هێشـتا شـارەوانی مابوو. بەڵام دەسـەڵاتی نەمابوو. جاروبار بۆ شتێکی پێویست ئەویش بەبێ چەک دەهاتنە دەرێ.

دەنگۆ داکەوتبوو کە عەشـایری دەوروبەر دەیانەوێ پەلاماری مەهاباد بدەن و تاڵانی بکەن. کڕین و فرۆشتنی چەک، بەتـایبەتـی بـڕنـۆی کـورت کە دەسـکردی چیکۆسلۆڤاکیا بوو، برەوی باشی بوو. چەکی جۆراوجۆر ودەمانچەش دەسـت دەکەوت و هەر کەسـە و بەپێی گیرفانی خۆی دەیکڕین.

بۆ پاراستنی شـار لە تاڵانی عەشـایری و پێشـگرتن لە دزی، وا دانرا هەر شـەوەی چەند کەسـێک لە گەڕەکی خۆیان ئێشـک بگرن. بشـێوی و نائەمینی گەیشـتبووە ئاسـتێک، کە هیچ کەس لە گیان و ماڵی خۆی ئەمین و دڵنیا نەبوو. کۆنەقین هەڵەسـوونیان هێنابۆوە و ئەمڕۆ تۆڵە دەستێنراوە. سەرەڕای ئەوەی نە یاسایەک هەبوو و نە دامەزراوەیەک بۆ پێشـگرتن لە پێشـێلکردنی یاسـا، کەچی خەڵکەکە لە سایەی خواوە پێکەوە باش بوون و لە

ئاشـــتەواییدا دەژیان. شـــەڕ بە دەگمەن دەکرا. دەڵێن چەکی بەتـــاڵ دوو کەس لێی دەترســـــن. لەوانەیە لەبەر ئەوەی خەڵـک چەکـدار بوون، ئیتر نەیـانـدەوێرا تخوونی یەکتر بکەون.

## بوومه بازرگان

ژیان گەمەی ســـەیری بە دەمەوە. هەتا چەند مانگ لەوەپێش بە ئاواتەوە بووم زووتر قوتابخانە بکرێنەوە و وەکوو مامۆســتا دەســت بەکار بم. کەچی ئێســتا بێکار کەوتبوومەوە و ڕۆژانە زیاتر دەچوومە لای ئاغای "م" کە دووکانێکی لە سەرای شافیعی هەبوو.

ڕۆژێکیــان بــابی هــاتە دووکــان و گوتی لە عێراقێ قوماشــیان هێناوە. ئەگەر کەســێکی دڵنیام لێ هەڵکەوێ، پێیــدا دەیــاننێرمە ورمێ. بیســــتوومە لەوێ بــاش دەفرۆشرێن. ئەویش منی پێ ناساند. بابی قبووڵی کرد و منیش ڕازی بووم. ناردی لە ماڵەوە قوماشــەکانیان هێنا. ٥٠ تۆپ کرپی دوشین و ٥٠ تۆپ کرپی ساتین و بیست و دوو دەســـتە دەســـرەی حەیری گیرفان. هەر تۆپێک کرپی بە ٣٦ تمەن و هەر دەســتەیەک دەســرەی بە ٢٠ تمەن دانا و گوتی ئەو شــتومەکانە ئەگەر لەوەت گرانتر فرۆشــتن، پاش گێڕانەوەی خەرجی هاتوچۆیەکەت، ئەوی دیکەی بەش دەکەین. قوماشــەکانمان پێچاوە و ناردمانە گەراج. ئینجا دوو کەســـی دیکەش کە دووکانێکیان بە تەنیشــت دووکانەکەی ئاغای "م"ەوە هەبوو، ڕایانسپاردم لە ورمێ ســـاچمەیان بۆ بێنم و هەر قوتووەکی پەنجا دانەیی بیســـت تمەنی پێ بدەم. نیو ســـەعات دواتر بە ئوتووبووس لەگەڵ قوماشــان بەرەو ورمێ وەڕێ کەوتم. ســـەعات چواری دوانیوەڕۆ گەیشـــتمە گەراجی ورمێ. دەمودەست قوماشەکانم بە کرێکارێک هەڵگرت و بردمنە

میوانخانەی ئازەربایجان لە شەقامی پالەوی، کە بە ڕێکەوت چەند دووکانێکی قوماشفرۆشیی لە تەنیشت بوو. هێشتا نەگەیشتبوومە ژووری میوانخانەکە، چەند قوماشفرۆشێک هاتن و پرسییان چیم پێیە بۆ فرۆشتن؟ گوتم کریپی دوشین و کریپی ساتین و دەسرەی گیرفان، بەڵام بەسەر یەکەوە دەیانفرۆشم. بوخچەمان کردنەوە. بە ڕاستی قوماشەکان جوان بوون. گوتم تۆپی کریپ بە پەنجا تمەن و دوو دەستە دەسرە بە سی تمەن. کەمتری نادەم. بەزاز بەسەر یەکەوە لێیان کڕیم و بە نەقدی پووڵەکەیان دامێ. پووڵم لە دەسرەیەک نا و توند لە بن جلەکانمەوە لە نێوقەدمم بەست. لە پێشدا چوومە هۆڵی میوانخانەکە، بەڵام چایەکم خواردەوە و پشوویەکم دا و هاتمە دەرێ. هێشتا تاریک دانەهاتبوو. دەمویست نانێک بخۆم و بێمەوە میوانخانە.

بە شەقامی پالەویدا بەرەو فولکەی پارێزگاری دەچووم، کە ئەودەمی پێیان دەگوت فولکەی ئەیالەت. هێشتا نەگەیشتبوومە دەرمانخانەی توڕابی، یەکێک بانگی کردم. ئاوڕم داوە، لە دووکانێکی بچووکدا کاک موحسینی ئاغاجانی، هاوپۆلەکەی قۆناغی دواناوەندیم لە مەهاباد لەوێ دانیشتبوو. زۆر دڵخۆش بووم. یەکترمان لە باوەش گرت. ئەحواڵیم پرسی. گوتی، مانگێک دەبێ لە تەورێز هاتوومەوە، وازم لە کۆلێژی سەربازی هێنا و بە یارمەتیی دایکم و بابم کە لە ورمێ دەژین، ئەم خەڕازییە چکۆلەیەم کردووەتەوە. ئەودەمی لە مەهاباد بووم، دڵم بە خوشکە چکۆلەکەیەوە بوو. بنەماڵەیەکی نەجیب بوون. بابی سەروانی سوپا بوو. شەرمم کرد ئەحواڵی خوشکی بپرسم. ناچار پرسیم لەگەڵ

دایکت و بـابـت هەمووتـان پێکەوەن؟ گوتی بەڵێ بەڵام خوشـــکە گەورەکەم وەک دەزانی مێردی کرد بە ئاغای "م" و خوشکە چکۆلەکەشـم ئەمسـاڵ مێردی کرد. ئێسـتا هەر خۆمم و دایکم و بـابم. بە خەفەتەوە گوتم ژیـان ئاوایە ئیتر. هەر ڕۆژە و یەکێکمـان لێ کەم دەبێتەوە تـا کەس نامێنێ. ژیان حیسـابی کۆ و کەمکردنەوەیە. لە منی پرسـی. گوتم منیش دەســتم کردووە بە کاسـبی. هێندێ قوماشم هێنابوو دەمودەست فرۆشتم. دوایی گوتم ئەرێ موحســین گیان نازانی لە کوێ ســاچمەی تاپڕم دەســت دەکەوێ؟ گوتی چەندت دەوێ؟ گوتم چەندی هەڵسووڕێ. گوتی تـاکەی لێرەی؟ گوتم بەیـانی دەگەڕێمەوە. گوتی کەوابوو دوانیوەڕۆ ســەرێکم لێ هەڵێنە، پێم شــک دێ و چەندی هەبێ بۆتی دەکڕم. چەندی حەولی دا میوانی بم، سپاسم کرد و لێک هەڵبڕاین.

ســـبەینێ ســـەعات دە چوومە دووکانەکەی. چووبوو پەنجا قوتوو ســـاچمەی کڕیبوو، یەکی بە هەشـــت تمەن. پووڵی ســـاچمەکانم دایە و زۆرم ســـپاس کرد و گوتم لەمەودوا هەر جارێکی بێمەوە ورمێ، ســـەرت لێ دەدەم. مـاڵاواییم لێ کرد و هـاتمەوە مەهـابـاد. ســـبەینێکەی، قوتووی ســـاچمەم یەکی بە بیســـت تمەن فرۆشـــتنەوە. هەڵبەت بـابی برادەرەکەم حەقی بەســـەر قـازانجی ســـاچمەکانەوە نەبوو. بەو جۆرە لە یەک دوو ڕۆژاندا زیاتر لە هەزار و سێسەد تمەنم قازانج کرد. دەمم شیرن بوو. لە لایەکەوە چاوەڕێ بووم دیســـان قوماش بێنن،

بەڵام خۆم ماتڵ نەکرد. دوو ڕۆژ دواتر دیسـان بۆ کڕینی ساچمە چوومەوە ورمێ.

کاسـبییەکی پڕ دەهات و ئاسـانم دۆزیبۆوە. سـەرتان نەیەشـێنم لە مانگێکدا ئەوە هێشـتا بابم نەهاتۆتەوە، ببوومە خاوەنی چوارهەزار تمەن. ئەوەم بە خەونیش نەدیتبوو.

وەختێک کە ئیتر لە ورمێ سـاچمەم دەسـت نەکەوت، ڕووم کردە تەورێز. کاتێک بابم لە سـەفەرێ هاتەوە و تووتنەکانی خۆی فرۆشـت و وەزعی منی ئاوا دی، زۆر خۆشـحاڵ بوو. چەند پارچە مافووری تەورێزمان بۆ ماڵێ کڕی. کەلوپەلمـان گۆڕی. ئینجا بڕیاریشـمان دا بچینە خانووەکی باشـتر و لەبارتر. لای خۆم وام لێک دەداوە، ئەگەر ئاوا بچێتە پێشێ، زۆر نابا، دەوڵەمەند دەبم.

سروشتی مرۆڤ وایە، چەندی پتر پەیدا دەکا، چاوبرسیتر دەبێ. هەڵبەت وەزعی بازاڕ لەو بارودۆخ و بشـێوییەدا کە هێزی بێگـانەش لە ئێرانێـدا بوون و جەنـگ لە ئەورووپـا جۆرێک بوو ڕۆژ بە ڕۆژ شـت گرانتر دەبوو، بازرگـان قازانجێکی زۆریان دەکرد. کەسانێک هەبوون کە دەمودەست لەپڕێک بوونە کوڕێک.

ڕۆژێکیان لە تەورێزێ، پەنجا کیسـە شـەکرم کڕی، بەڵام هێشـتا وەرمنەگرتبوون، گران بوو. تەنانەت بەبێ ئەوەی دەسـتیان لێ بدەم، هەزار تمەنم قازانج کرد. هەڵبەت یەک دوو جاریش شـتومەکەکـانم بەقووندا دەکەوتن و زوو نەدەفرۆشـران. جـارێکیـان شـەمچەم کڕی، بەڵام بە زەحمەتێکی زۆر پاش بیسـت ڕۆژان توانیم بە تووتنیان بگۆڕمەوە. تووتنەکەم بردە ورمێ و مـاوەیەکی زۆریش

لەوێ عەلاف بووم، ناچار بە هێندێ زەرەر فرۆشـتمەوە. بەڵام لەسەر یەک، ئەو شتانە دەگمەن بوون.

بە یارمەتیی دەڵاڵێکی کڕینی مڵک و ماڵ، خانووەکەی ئاغای مەنگوڕیی بابی کاک ئەحمەد مەنگوڕیی هاوپۆلیم کە بەشـێکی سـەربەخۆ و جیای هەبوو و دوو ژووری بڕێک گەورە و هاڵێک و عەمبارێک بوو، بەکرێ گرت. وردە وردە دەسـتمان گەیشـتبووە دەممان. باب و کوڕ هەردووکمان کاسبیمان دەکرد.

کە پێکەوە دەڕۆیشـتین، کەس نەیدەناسـینەوە و پێیان وانەبوو باب و کوڕین. بابم ٢٠ سـاڵ لە خۆم بەتەمەنتر بوو. ڕوخسـارێکی گەش و سـوور و سـپی و تەڕپۆشـی هەبوو. ئەو هەلومەرجە لەبارانە وایان کرد، وردە وردە هێندێ فکری بکەونە سەری، کە بۆتان دەگێڕمەوە.

## دامەزران لە فەرهەنگ

زستانی ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی بوو. بەفرێکی قورسیش کەوتبوو. خەڵک بەفریر سەربانییان لە کۆڵانان کردبوو، بۆیە هاتوچۆ بە کۆڵاناندا ئەستەم ببوو. ماڵ بە کورسیی خەڵووز گەرم دەکران، دەگمەن ماڵێک سۆبەی هەبوو. کۆمپانیای نەوتیش ئەودەم لە تەنەکە"پیت"دا نەوتی دەفرۆشت. جا چونکە ئێمە کەسمان لەماڵەوە نەبوو و من و بابم هەردووکمان سەڵت بووین، بە ڕاستی گەرمکردنی ماڵێ زۆر ئەستەم بوو. ئینجا کورسییش عەیبێکی هەبوو، هەموو ژوورەکەی گەرمدا نەدێنا. دیارە لەبەر ئەو کێشانە بوو کە بابم بیری لەوە کردەوە یان ژنێک بۆخۆی بێنێ یان بۆ من. بەڵام زیاتر مشووری خۆی دەخوارد. منیش ڕازی بووم. بە ڕاستی پێویستیش بوو ژنێک لە ماڵێ هەبێ، هەم چێشتێک لێ بنێ و هەمیش ماڵەکە لەو کپی و بێدەنگی و کزەی سەرمایەدا گەرم دابێنێ. بەڵام بەر لەوەی لەسەر ئەو بڕیارە گرینگە ساغ بینەوە، ڕۆژێکیان هەواڵیان هێنا، کە لە ئیدارەی فەرهەنگی مەهاباد کاریان پێمە. پێم وایە پانزە ڕۆژێکی مابوو بۆ جێژنی نەورۆز. بەڕێوەبەری فەرهەنگی مەهاباد ئەو دەم ئاغای ڕەحیمی لەشکری بوو. هەر ئەو کەسەی کە دوو ساڵ لەوەپێش بۆ هاوینەگەشتەی ورمێ، سەرپەرشتمان بوو. بە ڕەحمەتی خوا بکەوێ، پیاوێکی تا بڵێی دڵ و دەروون پاک و میهرەبان بوو. ئەگەرچی خوێندەوارییەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام دەستوخەتی تا خودا حەز دەکا جوان بوو. جا ئەو دەمی، خەتخۆشی بۆخۆی بڕوانامە بوو. ئەو

مەسەلەیە، بیرەوەرییەکی پەیمانگەی مامۆستایانی ورمێی بیر خستمەوە. دووەم ساڵم بوو، کە ئاغای عەلی ئەسغەری حیکمەت، وەزیری فەرهەنگ هاتە سەردانی پەیمانگەکەی ئێمە. تەواوی مامۆستاکان لە پێش ڕیزی قوتابییانەوە ڕاوەستابوون و قوتابییەکانیش لە پشتەوەیان. یەکێک لە مامۆستاکان بە ناوی ئاغای بەرزگەر، مامۆستای ئەدەبیاتمان، پیاوێکی کورتەباڵا بوو. منیش ڕێک لە پشتەوەی وی ڕاوەستابووم. کاتێک ئاغای گونیلی بە ناو و پلەی خوێندنەوە ناوی مامۆستاکانی دەخوێندەوە و دەیناساند، هەمووشیان بەکالۆریۆسیان هەبوو، گەیشتە ئاغای بەرزگەر، لەبەر ئەوەی ناوبراو دیپلۆمی بوو نەک بەکالۆریۆس، تاوێک ڕاوەستا، بەڵام بەرزگەر دەرفەتی نەدا و دەمودەست گوتی من بەرزگەر دیپلۆمی پانزە ساڵ لەوەپێشی بواری ئەدەبیاتم. ئاغای حیکمەت لە تەوسەکەی تێگەیشت و بزەیەکی هاتێ.

ئیتر هەستام چوومە فەرمانگەی فەرهەنگ. چوومە هۆدەی ئاغای لەشکری. ئاغای لەشکری پاش چاکوخۆشی، گوتی، دەزانی قوتابخانەکانی مەهاباد ئەوە شەش مانگە داخراون؟ لە پارێزگاوە ئەمر هاتووە پاش جێژن بیانکەینەوە. لەو بارەیەوە لەگەڵ برادەرانی دیکەش قسە کراوە، تۆش قبووڵی بکە و پاش جێژن دەست بەکار بن. فەرمانەکانیش بەو زوانە دەردەکرێن. سەرەڕای ئەوەی لەو ماوەیەدا کاروکاسبییەکەم گەرم ببوو و باش لێی ڕاهاتبووم، بەڵام پێشوازیم لە پێشنیارەکەی کرد و

زۆریشـــم پێ خۆش بوو. هەرچەندە مامەڵە و کاســـبییەکە داهاتێکی باشـــی تێدابوو، بەڵام نازانم بۆچی لەگەڵ دڵ و دەروونم ســـازگار نەبوو و من بەڕاســـتی حەزم لێی نەبوو. لەڕلی خۆمدا گوتم یانی چی، یەکێک شـــەکر دەکڕێ و بەوی دیکەی دەفرۆشـــێ و ئەویش ئاوا و لە ڕاســـتیدا ئەو کاڵایە پاش چەند دەڵاڵ و فرۆشـــیار جا دەگاتە دەســـتی کڕیاری ســـەرەکی و هەر کامەش بە نۆرەی خۆیان شـــتێکی دەخەنە ســـەر. ئەودەمی خەڵکێکی زۆر بەبێ ئەوەی کارێکی باشـیان کردبێ، لەو ڕێیەوە قـازانجێکی زۆریـان دەکرد. ئینجـا ئەو ســـیســـتەمە نەک بەســـوود نییە، بگرە زۆری ش هەڵەیە و خەڵک تەمبەڵ و مشەخۆر دەکا. هەر بۆیە نانی مامۆستایەتیم ســـەرەڕای ئەوەی لەچاو ســـاتوســـەودا شـتێکی زۆر کەمیش بوو، بە بـاشـــتر زانی. هەڵبەت ڕووداوەکـان زۆر جـار لە دەرەوەی دەســـەڵاتی مرۆڤ ڕوو دەدەن و بەبێ پێشـبینی و هەر بە ڕێکەوت دێنە پێشـــێ و ئینســـان بەدەســـت خۆی نییە دەکەوێتە نێو شـــەپۆلەکەوە. دۆخ و هەلومەرجی ژینگە بڵێی و نەڵێی جاری وایە ڕەوتێکت بەســـــەردا دەســـــەپێنن، کە مەحاڵە بتوانی لێی ڕابکەی.

ئینجا پاش نەورۆزی ســـاڵی ۱۳۲۱، بوومە مامۆســـتای دواناوەندیی ئیرانشاری مەهابادێ. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە ئاغای عەبدولعەزیزی مەولەوی و مامۆســـتا هاوکارەکانیش: ڕەســـووڵ میکاییلی، هاشـم شـیرازی و هاشـم خەلیلزادە و سولْتانی وەتەمیشی بوون. من بە پلەی ۲ مامۆستا بووم و بە مانگی ۷۲ تمەن مووچە دامەزرام.

جا چونکە بڕیارەکان لە سەرەتای ڕەزبەری ساڵی ١٣٢٠ـەوە دەرچووبوون، مووچەی شەش مانگ پێشتریشیان پێ داین، کە کارمان نەکردبوو. داهاتوو، ئەخلاق و تایبەتمەندییەکانی هەر کەسێک، ڕاستەوخۆ پێوەندییەکی دانەبڕاویان لەگەڵ پیشەکەی ئەودا هەیە. مرۆڤ بە قسەکردن و هەڵسوکەوتی هەر کەسێکڕا تا ڕادەیەک بۆی ڕوون دەبێتەوە کابرا چ پیشەیەکی هەیە. بەختەوەریش بە هیچ شێوەیەک پێوەر و پێودانێکی ڕوون و لێبڕاوانەی نییە. زۆر جار یەکێک بە داهاتێکی مامناوەندی سەد هێندەی دەوڵەمەندێک بەختەوەرە. زانست و زانیاری گەورەترین پێوەری مەزنیی مرۆڤن. سامان خۆشبژێوی دێنێ، بەڵام دایمە هێمنی و ئاسوودەیی ویژدان لەگەڵ خۆی ناهێنێ.

کێشەیەکی کە لە کرانەوەی قوتابخانەی مەهاباددا هەبوو، دواکەوتنی قوتابییەکان بوو، بەتایبەتی قوتابییەکانی پۆلی سێ کە ئەمساڵ دەبوو لە تاقیکاریی سەرانسەریدا بەشدار بن. هەر بۆیەش پێویست بوو قوتابییەکانی شێلگیرانەتر دەرس بخوێنن و مامۆستاکانیش کاتێکی زیاتریان بۆ تەرخان بکەن. جا چونکە پێوەندیی هەردوولا پێوەندییەکی خۆمانە بوو، لە هیچ هەوڵێک درێخی نەدەکرا. ڕۆژانە کاتەکانمان پتر لە قوتابخانە بەسەر دەبرد، تەنانەت هێندێ جار فراوینیشمان هەر لەوێ دەخوارد. لەگەڵ قوتابییەکان تۆپێن و باسکەتۆپمان دەکرد. ئەگەرچی دەرفەت هەر هەبوو

بچمەوە بازاڕ و هاوینێ خەریکی ساتوسەودایێ بم، بەڵام وەشوێنی نەکەوتم. ڕۆژە گەرمەکانی هاوینێ بەسەردا هاتنەوە. هیچ شتێک نەبوو خۆی پێوە بخافڵێنین. چۆمی شارییش وشکی کردبوو، بۆ ئەوەی لانیکەم بچینە مەلەکردنێ.

لەبەر بێ کتێبخانەیی، دەرەتانی کتێبخوێندنەوەش کەم بوو و دەکرێ بڵێی ئەو پشووی هاوینەیە نە بۆ مامۆستاکان و نە بۆ قوتابییەکان هیچ سوودێکی نەبوو.

لەو سەروبەندەدا بوو، کە بابم بڕیاری دا ژن بێنێ. دەستی لەسەر کچەکەی حاجی مرادی بەیگی دانابوو. بێوەژنێکی گەنج بوو. منی لەگەڵ کۆمەڵێک خزم و کەس ناردە خوازبێنی.

شەوێ چووینە ماڵی حاجی مراد. پاش هێنانەگۆڕێی باسەکە و قسە و چەلەحانێکی خۆش، چونکە بابمی باش دەناسی، ئازی بوو. ئیتر چەند ڕۆژ دواتر چووینە مارەبڕینێ و بەبێ شاییکردن بووکەخانمان هێنایە ماڵێ. لەگەڵ هاتنی ئەو، کپی و بێدەنگییەکەی ماڵمان ڕەوییەوە و کاولاشەکە ئاوەدان بۆوە.

ڕاستیان کوتووە، ژن و ژیان. بە ڕاستی ماڵێکی ژنی تێدا نەبێ، هیچ خۆشییەکی تێدا نییە.

## کۆمەڵەی ژێکاف

هاوین ڕابرد و خوێندن دیسـان دەسـتی پێ کردەوە. وڵات هەر وا شـێوا بوو. نـاوچەکە بێخـاوەن بوو. دوانیوەڕۆیەکی مانگی ڕەزبەر لە قوتابخانەوە بەرەو ماڵ دەهـاتمەوە. فکر و خەیاڵ هەڵیانگرتبووم، کتوپڕ یەکێک سڵاوی لێ کردم. سەیرم کرد کاک حوسێنی فرووهەرە. پێم سـەیر بوو، چونکە قەت سـەر و سـڵاوێکمان پێکەوە نەبوو. ئاغای فرووهەر پاش چاکوخۆشـی گوتی کارێکی پێویسـتم پێتە. هەڵبەت تۆزێک نیگەران بووم، بەڵام زۆر زوو نیگەرانییەکەی ڕەواندمەوە. گوتی ئەمشـەو لەماڵی ئێمە کۆبوونەوەیەکمان هەیە. کۆمەڵێک دۆسـت و برادەر گەورەم دەکەن. هەڵبەت بەتەماین باسـی شـتێکی گرینگ بێنینە گۆڕێ. جەنابی مەلاقادری مودەڕیسـیش تەشـریف دێنن. من کە نـاوی ئەوم بیسـت، ئیتر نیگەرانیم نەما، چونکە دەمزانی، کارێکی چەوت بێ، ئەو خۆی لێ نادا.

وامان دانا سـەعات هەشـتی سـەر لە ئێوارێ بچمە ماڵیان، بەڵام هەر بۆم نەدەچۆوە سەر یەک، ئاخر باسـی چی دەکرێ.

لە کاتی دیاریکراودا لە دەرگای ماڵی ئاغای فرووهەرم دا. بۆخۆی دەرگـای کردەوە. بردمییە ژوورێـک. ئەم کەسـانە لەوێ بوون: مەلا قادری مودەڕیسـی، سـەدیق حەیـدەری، عەبـدولڕەحمـان ئیمـامی، محەمەد یـاهوو، ڕەحمـان زەبیـحی و فرووهەریش خۆی. جگە لە مودەڕیسـی و زەبیحی، ئەوانی دیکەم باش نەدەناسـی و

لە نێویاندا لە هەموان کەمتەمەنتر بووم. تاوێک دواتر ئاغای مودەڕیسی سەری قسەی کردەوە.

پاش شـــیکردنەوەی بارودۆخی ناوچەکە گوتی: ئێســـتا هەلێکی زێڕین بۆ ئێمە هەڵکەوتووە، کە بە مـافەکـانمـان بگەین. ئەرکی ســــەرشـــانمانە لەو دۆخەدا لە هیچ هەوڵ و تێکۆشـــــانێک ڕدێخی نەکەین. بە بەو بیروباوەڕەوە ئێمە بڕیارمـان داوە بە یارمەتیی یەکتر ڕێکخراوێک دامەزرێنین کە ئەم ئەرکە مێژووییەی پێ جێبەجێ بکرێ، هەر بۆیە (ڕووی لە من کرد) جەنابت بانگهێشـــت کراوی لەو هەنگاوە گرینگەدا لەگەڵمان بی و هەموانیش بە هەڵبژاردنی تۆ ڕازی بوون. هەڵبەت ئەگەر قبووڵیشـــی نەکەی، بە دەســـت خۆتە، بەڵام بەو متمانەیەی ئێمە بە ئێوەمان هەیە، ئەگەر لەگەڵمان نەبی، هەر وا بە دڵ و گیان هاوڕێ و هاوپەیمانمانی، جا چونکە ڕێکخراوەکەمـان نـاوی "کۆمەڵەی ژیـانەوەی کوردە" جارێ بەشـێوەی نهێنی کار دەکا، دڵنیاین کە لەقاوی نادەی. ئەگەر قبووڵیشت کرد، ئەوە برا و هاوڕێی ئازیزمانی.

چەند ســاتێک بێدەنگییەک باڵی بەســەر کێشــاین، گوتم ئەگەرچی پێشـــتر بیرم لەوە نەکردبۆوە و پێشـــم وا نییە شیاوی ئەوە بم لە ڕیزی ئێوەدا بم، بەڵام لە ناخی دڵمەوە و بە گیان و دڵ قبووڵی دەکەم و ئەوە گەورەترین شـــانازییە بۆ من. بوون و نەبوونم ئی میللەتی کوردە و تـا دەمرم لەگەڵتانم. ئاغای مودەڕیســـی هەســـتا و لە ئامێزی گرتم. پاشـــان ڕێوڕەســـی ســـوێندخواردن بەڕێوە چوو. ئاغای فرووهەر پەردەیەکی لە گۆشـــەیەکی ژوورەکە لادا. لە شـــوێنێکی وەکوو میحراب لەســـەر مێزێکی بچووک،

شمشیرێک و قورئانێک دانرابوون. من سوێندم خوارد و لەو ساتەوە منیش یەکێک بووم لە ئەندامانی کۆمەڵەی ژێکاف. هەموان باوەشمان بە یەکتردا کرد و پاشان یەک یەک ماڵی ئاغای فرووهەرمان بەجێ هێشت.

من چوومەوە ماڵێ. بەڵام ئەو شەوە تا بەرەبەری بەیانی خەم لێ نەکەوت. زیاتر بیرم لەو شتانە دەکردەوە کە سوێندم بۆ خواردبوون. وەفاداری بە کۆمەڵەی ژێکاف و فیداکاری لە پێناو دەستەبەرکردنی مافی دیاریکردنی چارەنووسدا شتێکی پێویست بوو، بەڵام پێملبوون و سوێندخواردن بۆ ئەوەی هەرچی پیاوی کوردە بە برای خۆم و هەرچی ئافرەتی وردە بە خوشکی خۆمی بزانم، شتێکی نائەقڵانی و ناپێویست بوو، ئەگەرچی ئەو بابەتە زیاتر ڕەگی لە ئایندا بوو، بەڵام تێکەڵکردنی لەگەڵ بیروباوەڕێکی سیاسی پێویست نەبوو؛ یان سوێندخواردن کە تا دەمرم ئەندامی حیزبی ژێکاف بم، ئەگەرچی ئەوەیان کێشە نەبوو، بەڵام بەپێچەوانەی ئازادییە تاکەکەسییەکان بوو و لەبەر ئەوەی ڕێی تێدەچوو مرۆڤێک لە ژیانی خۆیدا بە هەر هۆیەک بێ بیروباوەڕی بگۆڕێ و ڕێبازێکی دیکە هەڵبژێرێ یان پێی وابێ ئەو شێوازەی هەیە، ئامانجەکە نائەنگێوێ. بەو جۆرە ناچارکردنی کەسێک کە تا دەمرێ لەسەر بیروباوەڕێک بێ، جۆرێک دیکتاتۆری و سەپاندنی بیروباوەڕی سیاسییە. خاڵێکی کە بێ ئەملاوئەولا پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بکەمەوە، ئەوەیە کە من لە

ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ژێکاف نەبووم. چونکە لە هێندێ کتێباندا ناوی منیان وەک دەستەی دامەزرێنەر نووسیوە. هەڵبەت گومان لەوەدا نییە کە تا ئەودەمی من چوومە نێو کۆمەڵە، ئیتر لە من کەمتەمەنتریان لەنێودا نەبوو. من باوەڕم وابوو و ئێستاش وا بیر دەکەمەوە، کە بە قبووڵکردنی بیروباوەڕ و ڕێبازێک و بەشداربوون لە تاقم و دەستەیەکدا بیرم لە پلەو پایە نەکردووەتەوە و ناکەمەوە. تۆفیرێکی بۆ من نییە لەسەرەوە بم یان لای خوارێ. بەرپرس بم یان بەردەست، مەرجی سەرەکی خزمەتکردنەز بە ڕای من ئەو کەسانەی کە دەکرێ وەکوو دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژێکاف ناویان بێ، بریتی بوون لە "محەمەدی نانەوازادە، حوسێنی فرووهەر، عەبدولڕەحمان ئیمامی، ڕەحمان زەبیحی، قاسم قادری، مەلا عەبدوڵڵا داودی، محەمەد یاهوو، مەلا قادر مودەڕیسی، سەدیق حەیدەری و عەبدولڕەحمان کیانی. بەڵام خوا هەڵناگرێ تەواوی ئەو ڕێکخراو و دامەزرانەی کۆمەڵە، بەرهەمی بیر و مشووری میرحاجی کوردستانی ئەودیو بوو، کە دەوری هەرەگەورە و سەرەکیی لەو کارەدا هەبوو و هەر ئەویش بوو توانیی ئەو کۆمەڵە کەسە بانگ بکا و ئەو کارە گەورەیەیان پێ بکا.

خاڵێکی دیکە کە زۆر جێی داخە و یەکێکە لە حاڵە لاوازەکانی ئەو ڕێکخراوە، نەبوونی ئەساسنامە و مەرامنامەیەکی نووسراو بوو و لە ڕاستیدا ئەندامەکان تەنیا پوختەیەکی گشتیان لە ئامانج و بیروباوەڕەکانی دەزانی. سەرەتا هەوڵ دەدرا کەسانێک بکرێنە ئەندامی حیزب، کە لێیان دڵنیا بن، کەسانێکی گیانلەسەردەست بن و باوەڕیان

به ئـامـانج و هزرەکە هەبێ، بەڵام ئیتر وردە وردە لەلایەکەوە ڕێکخراوەکە لەو حاڵەتە نهێنییەی هاتە دەرێ و ئـاشـکرا بوو و لەلایەکی دیکەوە بە قبووڵکردنی کەسانێک بەبێ لێپرسینەوە لە کەسایەتی و پێگەکەیان، کۆمەڵە بـوو بە زۆر و بـۆر و زۆری نەبـرد هەمـوو کوردسـتانی تەنییەوە. ئینجا بە بوونە ئەندامی کۆمەڵێک سـەرۆک عەشـیرەت و دەوڵەمەند و ملکدار و شـێخی ناوچەکە، ئیتر جڵەوی ڕێکخراوەکە لە دەسـتی دەسـتەی دامەزرێنەران و هۆگرە ڕاسـتەقینەکانی هاتە دەرێ. تا وای لێ هـات دواتر نـاوی ڕێکخراوەکەیـان لە کۆمەڵەی ژێکافەوە گۆڕی و کردیانە حیزبی دیموکراتی کوردستان و ئەوەش ڕێک بەپێچەوانەی ئەو سـوێندە بوو کە پێشـتر خواردبوویان. هەڵبەت ئەو گۆڕینی ناوە لەسـەر پێشـنیار و ئەمری سـۆڤیەت بوو و هۆیەکەشـی ئەوە بوو، کە دەوڵەتی سـۆڤیەت بەتایبەتی حوکمەتی ئازەربایجان کە هەڵسـوورێنەری سـەرەکیی هەموو جۆرە چالاکییەکی سـیاسـی بوو لە ڕۆژئاوای ئێراندا، پێی وابوو بنیاتنەر و پێکهێنەری ئەو ڕێکخراوە میرحـاجی عێراقی بووە و لەوانەیە ئەو یەکێـک بێ لە پیـاوانی ئینگلیز. کەوابوو پێویسـت بوو لەپێشـدا ناوی حیزبەکە بگۆڕدرێ و دوای ئەوە بە بانگهێشتکردنی سەرکردە و دەستڕۆیشتووەکانی حیزبەکە بۆ سـۆڤیەت، دەیویسـت بەتەواوی حیزبەکە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

لەلایەکیشـــەوە جێی داخ و کەســـەر بوو کە خەڵکی سـیاسـەتمەدار و خوێندەوار و باشـمان نەبوو. بۆ گەیشـتن بە ئـامـانجی گەورە، تەنیـا بیروبـاوەڕ و فیـداکـاری بەس نییە، زیرەکی و ســـیاســـەتزانیی دەوێ، کە زۆر لە هێزی ســـەربازی و جەنگی دەکرێ کاریگەرتر بێ. وەک چۆن لە ڕووداوە سـیاسـییەکانی دواتردا دیتمان، قەوامولسـەڵتەنە چۆناوچۆن بە مانۆڕێکی سـیاسـی، هێزە سـەربازییەکانی سـۆڤیەتی لە ئێران دەرکرد و لە ئـاکـامی ئەو مـانۆڕە سـیاسـییەدا تەواوی چالاکییە سـیاسـی و نەتەوەییەکانی ئازەربایجان و کوردسـتانی پووچەڵ کردەوە. هەڵبەت ئەو پرسـانە پێویسـتیان بە باسـوخواسـی تێروتەسـەل و شـیکردنەوەی وردتر هەیە، کە ئەوەش کات و دەرفەتێکی دیکەی پێویستە. سەرەڕای هەموو ئەو شتانەش، بە ڕاستی دەکرێ بڵێی کۆمەڵەی ژێکاف بنەما و بناغە و دایکی خەباتی نەتەوەیی بوو لەو ناوچەیەدا. جێی خۆیەتی سڵاو بنێرین بۆ گیانی هەموو ئەو کەسـانەی لەو ڕێیەدا گیانی خۆیادیان لەدەسـت دا یان تووشـی دەربەدەری و زیندان و ئاوارەیی بوون و ئێستا لە خەوی تاهەتاییدان. ڕۆحیان شاد و یادیان بەرز.

خوالێخۆشـبوو محەمەدی نانەوازادە کە لە جەنگدا پلەی سەرهەنگیی وەرگرتبوو و بە کۆپتەر دەچووە بەرەی سەقز، لەگەڵ کۆپتەرەکە کەوتە خوارێ و گیانی لەدەست دا و ناوی خۆی بۆ تاهەتایە لە ڕیزی قارەمانانی میللەتی کورددا تۆمار کرد.

## مەرگی باب

لە ماڵێ، لەگەڵ بابم و زڕدایکم بەینم خۆش و ژیانێکی ئاسوودەم هەبوو. لە دواناوەندیش وێڕای دەرسگوتنەوە و قســـــەوباس و گەڕان لەگەڵ هاوکارەکانم خافڵابووم. بابم ماوەیەک بوو شوێنێکی نەبوو کاسبیی لێ بکا. زیاتر بەســـەر پێوە خەریکی ســـاتوســـەودا و مامەڵە بوو و بۆ کڕین و فرۆشـــتنێ هاتوچۆی شـــارەکانی دیکەی دەکرد. زســـتانی ســـاڵی ١٣٢١ بوو، کە بابم ســـەفەرێکی ورمێی کرد. بە دوای سەفەرەکەیدا بەفرێکی قورس کەوت و ڕێی مەهاباد ورمێ بەســـــترا. لە وەزعی ئاوادا، فەرمانگەی ڕێگەوبان هەتا بەو ئامرازە کۆن و ســـــواوانەی خۆی ڕێیەکانی دەماڵی، زۆری دەخایاند. بابم پاش چەند ڕۆژ مانەوە، لەگەڵ چەند هاوشـــــارییەکی خۆمان بڕیار دەدا لەگەڵ کامیۆنێک بێتەوە. بەو زستانە تووشە، لە پشتەوەی کامیۆن دانیشـــی، موســیبەتێکی گەورەیە، بەو حاڵەشــەوە لە نزیک قاوەخانەی مەیمەند، بیســـــت کیلۆمەترێک پێش ئەوەی بگاتەوە شـــــاری، کامیۆنەکە پەکی دەکەوێ و مســـــافیر بڕیار دەدەن بە پێیان بێنەوە مەهابادێ. لای عەســـرێ بابم شـــەکەت و ماندوو گەیشـــتەوە ماڵێ. بەڵام پرزەی لێ بڕابوو و دەیگوت ئازای ئەندامی دێشـــێ. ســـەرەڕای ئەوی پشـــووی دا و شـــەوێ لە بن کورســـی خەوت، بۆ سبەینێ تەواو وەزعی شڕ بوو و هەر هاواری ســـینگیی دەهات. تاقە پزیشـــکی بە ئەزموون فێربووی شـــار، ئاغای دکتۆر یۆناتانی هەرمەنیم هێنایە ســـەری.

ئەویش دەرمانی بۆ نووسی و هێندێ ڕێوشوێنی دانا، بەڵام خواردنی داودەرمان و ئاگالێبوون هیچ کاریگەریی نەبوو و هەر دەهــات خراپتر دەبوو. بەردەوام دکتۆریش دەهــات دەیپشــکنی. ئاخری پاش ســێ ڕۆژان دکتۆری لێی نائومێد بوو و گوتی، سیپەلکی ڕەش بوون و کار لەکار ترازاوە.

بەو زســتانەش خۆ هیچ ئامرازێکی هاتوچۆ نەبوو بیبەمە ورمێ یان تەورێز. ســەرەتای ڕەشــەممە بابی میهرەبان و ئازیزم لە باوەشــی خۆمدا گیانی ئەســپارد. دنیا لەبەرچاوم ڕەش و تاریک دەهات. ڕووداوێکی گەورە و تاقەتپڕووکێن بوو. بڕوام نەدەکرد. ئـاخر بـابم تەمەنێکی وای نەبوو، پیر نەبوو. ئەو بەڵایە چ بوو بەرۆکی گرتم. پار لەو سەروبەندەدا دایکی ئازیزمم لەدەســـــت دابوو، لە حاڵێکدا دیدارەوئاخری بووم و لەلای نەبووم. بەڵام ئەمســـاڵ چرکەبەچرکە مەرگی باوکمم بەچاوی خۆم دی. ئاگام لە دواهەناســــەکانی بوو. هیچ کەس جێی دایک و بابمی نەدەگرتەوە. من بێکەســـوکار کەوتبوومەوەز ماڵ و ژیان ئیدی مانایەکی نەمابوو.

حەفتەیەک لە خەم و پەژارەیەکی بێبڕانەوەدا تێپەڕی. ئیتر تاقەتم نەبوو بچمەوە ماڵە خۆمان. نەمدەزانی چ بکەم؟ زڕدایکم دووگیان بوو و لێم ببووە کەســێکی بێگانە. باوکمی وەبیر دێنامەوە. بیرم لەوە کردەوە، بە پێی شــــەرع چیی پێ دەبڕێ، بیدەمێ و بینێرمەوە مـاڵی بـابی. بۆ ئەو کـارەش، چەند ڕۆژ دواتر حاجی مراد و بابی زڕدایکم و میرزا عەلیی جیرانیان و کاک موتەلیبی میکایلیی مێردی خوشــکمم بۆ شــیو بانگ کردبوو. پاش شیوخواردن، باس و مەسەلەکەم تێ گەیاندن و گوتم پـاش بـابم، وەک جـاران نـاگوزەرێ. هەموان بۆیـان

سەلماندم. بۆ سبەینێکەی، زڕدایکمم بە کەلوپەلەوە چۆوە ماڵی بابی، لە حاڵێکدا هێشتا ساڵێک نەدەبوو هاتبووە ماڵی ئێمە. منیش هەرچی کەلوپەلی ماڵێ بوو، دام بە کاک حوسێن قاقی، کە لە حەراجکردندا شارەزا بوو و ئەویش لە مەیدانی ئاردی فرۆشتنی و پاش ئەوەی حەقی زەحمەت و ماندووبوونی خۆی لێ گێڕاوە، پووڵەکەی دامێ. منیش ماڵەکەی ئاغای مەنگوڕیم چۆڵ کرد و چوومە ماڵی خوشکم. خوشکم و منداڵەکانی خەمرەوێنم بوون. شەوی جێژنی ساڵی ١٣٢٢م بە لەدەستدانی بابم و لێکهەڵوەشانەوەی ماڵ و ژیانم تێپەڕاند. بۆ سبەینێکەی چوومە لای حاجی مراد و داوام لێ کرد شەوێ لەگەڵ گوڵان خانم تەشریف بێننە ماڵی خوشکم. جیران بوون. شەوێکی ناخۆش بوو. سەردانێک بوو، شیاوی جێژنی نەورۆز نەبوو، بەڵام چ دەکرا؟ من ڕیزبەندی فرۆشتنی کەلوپەلەکانی ماڵەوەمانم لەپێش حاجی مراد دانا، لەسەر یەک هەزاروسەدوپەنجا تمەنی کردبوو. سەد و پەنجا تمەنی ماریەی زڕدایکم و سەد و پەنجا تمەنیش کە وەک میرات پێی دەبڕا، بۆم نارد. نووسیمان و پیاوماقووڵان پەنجەمۆر و ئیمزایان کرد. نیوەی میراتەکەی کە مابۆوە، بۆ ئەو منداڵەمان دانا، کە لە زگی دایکیدا بوو و وامان دانا کوڕ بێ. ئەوەم ڕادەستی حاجی مراد کرد، کاسبیی پێ بکا و قازانجەکەی بۆ منداڵەکە خەرج بکرێ. بۆ ئەوەش پسوولەیەکم لە حاجی مرادی باپیری منداڵەکە وەرگرت. ئەوەش ڕێک شەوی دووی خاکەلێوەری ١٣٢٢ بوو.

# ڕۆیشتن بۆ تاران

زســــتان به هەموو تاڵی و ناخۆشـــییەکانییەوە تێپەڕ و بەهاریش بە هەموو جوانی و تەڕوتازەیی و گەشـــییەوە خەریک بوو تێدەپەڕی. وەک چۆن خەم و شادییەکان دێن و دەڕۆن و ئەوەی دەمێنێتەوە، ئەو بیرەوەرییـانەن کە لە لاپەڕەی خەیاڵدا بیچم دەگرن. ســـاڵی خوێندن تەواو بوو. پشوو هاوینە دەست پێ کرد. دەمێک بوو بڕیارم دابوو هەر پشوو دەستی پێ کرد، بچمە تاران. جا هاوسەفەرێکیشم بۆ پەیدا بوو. کاک مستەفای میکاییلی، کە پەیمانگەی سەربازیی تەواو کردبوو. ئەویش بەتەما بوو بچێتە تاران. پێش ئەوەی بڕۆم، زڕدایکم منداڵەکەی بوو. منداڵەش کوڕ بوو. ناومان نا ڕەحیم. هیچ نیگەرانی ئەو نەبووم، چونکە قەرار وابوو باپیری لەو ســـەرمایەی خســـتبوومە بەردەســـتی، خەرجی بکێشـــێ. چەند ڕۆژێک لە پووشـــپەڕ تێپەڕبوو، کە لەگەڵ ئاغای میکاییلی بەرەو تەورێز ڕۆیشتین.

ئەوەی پێم بوو، دەسـتێک نوێنوبانی سـووک و ماوورێک و جانتایەک بوو کە جلەکانمی تێدا بوو. ئێوارە گەیشـــتینە تەورێزێ. ژوورێکمان لە میوانخانەی شـــەبســـتەریدا بەکرێ گرت. بۆ تارانێ زۆر بەتاڵووکە نەبووین. شـــەوێ خەوتین و بەیانی پاش بەرچایی چووینە گەڕانی شـــەقامە خۆش و جوانەکانی تەورێز و لای باغی گوڵستان. کتوپڕ بانگەوازێک بە دیوارێکەوە ســـەرنجمی ڕاکێشـــا. تێیدا نووســـرابوو: دەوڵەتی تورکیا سەد خوێندکار بە خەرجی خۆی بانگهێشتی تورکیـا دەکـا بۆ خوێنـدن. خوازیـارەکـان ســـەردانی

باڵوێزخانەی تورکیا بکەن لە تاران. کونسولگەریی تورکیا لە تەورێز لە نزیک خۆمانەوە لە تەنیشـــت کلێســـای هەرمەنییەکـانەوە بوو. دەســـبەجێ چووینە ئەوێ و پرســـیمـان چی بکەین و چۆن دەبێ؟ گوتیـان ئەوە پێوەندیی بە باڵوێزخانەوە هەیە و دەبێ بچنە ئەوێ. ئەوە بوو بە کەڵکەڵەمان. بۆیە گوتمان وا باشـترە خێرا خۆمان بگەیەنینە تارانێ. بەشـکم بەختمان هێنای و سـەرکەوتین. بەو بیر و نیازەوە لە کونســـولگەری هاتینە دەرێ و لە قەیســـەریی گراند هۆتێل کە لەسـەر ڕێمان بوو، تووشـی کاک حوســێنی بەعیدی بووین، کە شـۆفێری فەرمانگەی قەند و شـــەکری مەهابادێ بوو. پاش چاکوچۆنی گوتی لەگەڵم نـایەنە تـاران؟ گوتمـان چۆن؟ گوتی، کـامیۆنێکی فەرمـانگەم پێیە و دەبێ بیبەمە تـاران. گوتم هەر لە خوامـان دەوێ. دەمودەســـت چووینەوە میوانخـانە و کەلوپەلەکانمان لەگەڵ وی بردە گەراج. کەلوپەلمان خستە پشـتەوەی کامیۆن و بۆخۆمان لەتەنیشـتی دانیشـتین و بەرەو تاران وەڕێ کەوتین. ئەی لەو ڕێککەوتە بەجێ و باشـــە. بەڵام ڕێگەی تاران خۆڵ بوو و کامیۆنەکە زۆر خاو و هێواش دەڕۆیشت.

شـــەوێ گەیشـــتینە قاوەخانەیەک. نزیک زەنجان بوو. کـاک حوســـێن کـامیۆنەکەی ڕاگرت و گوتی ئێرە گۆشـتاوێکی خۆشـی هەیە. دابەزین. داوای سـێ دیزەمان کرد. ئێمە خەریکی خواردنەوەی چا تۆخ و خۆشـــەکەی قاوەخانە بووین، کە یەکێکمان لێ وەژوور کەوت. ڕووی

لە خەڵکەکە کرد و گوتی، کەس تازە لە تەوریزەوە هاتووە؟ ئاغای بەعیدی وەڵامی داوە، بەڵێ. چی بووە. کامیۆنەکەی من لە دەرەوەیە. پرسیی، ئێوە هیچتان بزر نەکردووە؟ هەموو پێکەوە چووینە دەرێ و سەیری پشتەوەی کامیۆنەکەمان کرد. سەیرم کرد جانتاکەی من نەماوە. گوتم جانتایەکمان لێ بزر بووە. گوتی وایە. جانتاکەی لە کامیۆنەکەی خۆی دابەزاند و هێنایە نێو قاوەخانەکە. من ناونیشانی شتەکانی نێو جانتاکەم پێ دا. ئەویش جانتاکەی دامەوە. هەموو جلەکانمی تێدا بوو. گوتی، لە ڕێیە کە دەهاتم، سەیر دەکەم جانتایەک کەوتووە. ڕامگرت و هەڵمگرتەوە و خێراتر ملی ڕێیەم گرت. بەشکم بگەمە خاوەنی جانتاکە. باش بوو گەیشتمێ. زۆرم سپاس کرد. ویستم دەستخۆشانەیەکی بدەمێ، بەڵام لێی وەرنەگرتم. لەو دنیایەدا خەڵکی دەسپاک و شاییبەخۆ زۆرن. کابرا سەرەڕای ئەوەی هەر شۆفێرێک بوو و لەوانەبوو کامیۆنەکەش ئی خۆی نەبێ، بەڵام تەنانەت هەر سەیریشی نەکردبوو بزانێ چیی تێدایە. بەوە دەڵێن دەستپاکی و مەزنی، ئەی سڵاوت لێ بێ ئەی پیاوی ڕەوشتبەرز. ئەو ڕووداوەشم وەکوو هاتێک لێک داوە. شەوەکەی لە دەرەوەی قاوەخانەکە لە بن میچی ئاسمانە پڕ ئەستێرەکە نوستین. لە خەونمدا لەگەڵ چەند کەس لە پاپۆڕێکدام بەسەر دەریایەکی بێ بنەوە و بەرەو شوێنێکی نادیار دەڕۆین. لە هەر کەسێکم دەپرسی بۆ کوێ دەچین، کەس وەڵامی نەدەدامەوە. دەتگوت هەموو کەڕ و لاڵن. بەغاردان بەرەو گەمیەوانەکە چووم، ئەویش وەڵامێکی نەدامەوە. شەپۆلی دەریاکە بە تەوژم وەدیواری

کەشـــتییەکە دەکەوتن. لە ترســـان ڕاپەڕیم. خەریک بوو ڕووناکی دەکردەوە. سروەی بەرەبەیان لە ڕوومەتمی دەدا. تـــاوێـک دواتر هەموو بەخەبەر هــاتن. دەســـــت و دەموچاومان بە ئاوی ئەو جۆگەیە شـــوشـــت کە بەلای قاوەخـانەکەدا تێدەپەڕی و بەرچاییمـان خوارد و بەرەو تـاران وەڕێ کەوتین. کـامیۆن بە نەڕەنەڕ و گرمەگرم ســـینگی دەشـــتەکەی دەبڕی و دەڕۆیشـــت و ئێمەش چەنەمان گەرم داهاتبوو. سـەرەڕای ئەوەی جادەکە خۆڵ بوو و کامیۆنەکەش خاو دەڕۆیشـــت، بەلام دیتنی باغ و باغاتی پڕ میوەی سەر ڕێ و گوندی ئاوەدان و جوان و دیمەنەکان سەرنجڕاکێش و خۆش بوون.

شـــاری زەنجان و قەزوێنمان بەجێ هێشـــت و بۆ فراوین گەیشـتینە گەرەج. نیوەڕۆ بوو و هەوا گەرم. کاک حەســـەن ماشـــێنەکەی لە قاوەخانەیەکی دەم جادە و لە ژێر سێبەری چەند دارێک ڕاگرت. فراوینمان لەوێ خوارد و پشـوویەکمان دا و دیســـان وەڕێ کەوتینەوە. ســەعات ســـێی دوانیوەڕۆیە بوو کە گەیشـتینە گەراجی ئیتمینانی تاران لە شـــەقامی ســپا، نزیک مەیدانی حەســـەناباد. ئێمە پاش ســـپاســـێکی زۆر مالاواییمان لە ئاغای بەعیدی کرد. بـــار و بنەمـــان دا بە کرێکـــارێـک کە عـــارەبـانەیەکی بەدەســـــتەوە بوو، تا گەیاندینیە شـــەقامی موختاری لە شـــاپوور. یەکەم جار بوو هاتبووینە تاران و شـــارەزای هیچ کوێ نەبووین. ئادرەســـی عەبدوڵلای خوســـرەویمان پێ بوو، من دەمویســـت بەهۆی ئەوەوە هۆدەیەک بەکرێ

بگرین. چەند چوارڕێیانێکمان بڕی، کە گەیشتینە چوارڕێیانی موختاری، شەلالی ئارەقە ببووین. لە مەیدانی حەسەناباد کە تێپەڕین، بەسەر دەشتێکی بەیار و پانوبەرین و بەردەلێندا کەوتین. پێمان سەیر بوو لە پایتەختی وڵات و لە چەقی تاراندا شوێنی ئاوا هەبێ. لە کرێکارەکەم پرسی، ئێرە کوێیە؟ گوتی ئێرە مەیدانی سەنگلجە. ئیتر چوارڕێیانی موختاری نزیک مەیدانی ئاسنەڕێ بوو. لە کۆلانێکی شەقامی موختاریدا ماڵی ئاغای خوسرەویمان دۆزییەوە. بە یارمەتیی ئەو، ژوورێکمان لە نزیک ماڵەکەی خۆیان بەکرێ گرت. خاوەن ماڵەکە کابرایەکی بەننا بوو. هۆدەیەکی لە نهۆمی دووەمی ماڵەکەی مانگی بە پازدە تمەن پێ داین. بە یارمەتیی کرێکاری گۆرین کەلوپەلەکەمان بردە ژوورێ. خاوەنماڵ جگە لە ئێمە سێ کرێچیی دیکەشی هەبوو. یەکێکیان پیاوێکی پینەچی بوو، جیران ژووی ئێمە بوو، کە لەگەڵ ژنەکەی و دوو منداڵی لەوێدا دەژیان. دوو کرێچی دیکەش، هەر کام بە چەند منداڵەوە لە هۆدەکانی نهۆمی خوارەوەدا بوون. خاوەنماڵ بۆخۆشی لە دوو ژووری بەرانبەر ژوورەکەی ئێمەدا دەژیا. خۆی و ژن و دوو منداڵەکەی. ئیتر ماڵێکی قەرەباڵغ و پڕ دەنگ و دۆڵ بوو، بەڵام ئێمە بەڕۆژ لە ماڵ نەبووین. شەوێ دەهاتینەوە و ئەودەمیش منداڵ خەوتبوون، یان دەرفەتی بەدفەڕی و شەیتانییان نەبوو. بەیانیانیش کە وەدەر دەکەوتین، چونکە هیچ جۆرە کەرەستەیەکی چێشتلێنان و تەنانەت چالێنانیشمان نەبوو.

## دامەزران و کارکردن لە تاران

پانزەی پووشپەڕی ١٣٢٢بوو، کە گەیشتمە تاران. جا چونکە مەسەلەی چوون بۆ تورکیەمان زۆر بەلاوە گرینگ بوو، بۆ سبەینێکەی دەمودەست چووینە باڵوێزخانەی تورکیا لە شەقامی فێردەوسی، گۆشەی چوارڕێیانی ئەستەمبوڵ. چووینە نێو باڵوێزخانە و زۆر بە ئاسانی بردیانینە هۆدەی کارگێڕی باڵوێز. خۆمان ناساند و بۆمان ڕوون کردنەوە بۆچی چووین. ئاغای میکاییلی چونکە سێ ساڵان لە تەوریز دەرسی خوێندبوو، ئازەرییەکی باشی دەزانی. ئەگەرچی ئەو زمانە لەگەڵ تورکیی تورکیادا جیاواز بوو. کابرای کارگێڕیش پاش ئەوەی گوێی لێ گرتین، گوتی مخابن درەنگ هاتوون. ئێمە تا چەند ڕۆژێک لەوەپێش، سەد خوێندکارە پێویستەکەمان هەڵبژاردووە و ڕامانگەیاندووە. ئێستاش هیچ ناکرێ. ناچار بە هیوابڕاوی لە باڵوێزخانە هاتینە دەرێ.

ڕۆژان شتێکی وا نەبوو خۆی پێوە خەریک بکەین، جگە لە گەڕان و پیاسە بە شەقامەکانی شاردا. ئەودەم باشترین شەقامی تاران، لالەزار بوو. ئێمە زۆربەی ڕۆژەکان پاش بەرچایی بە پێیان وەڕێ دەکەوتین تا دەگەیشتینە مەیدانی تۆپخانە و لەوێش یان بە شەقامی فێردەوسی یان لالەزاردا تێهەڵدەبووین. بەشوێن کارێک شتێکدا نەدەگەڕاین. چونکە من مامۆستا بووم و لەگەڵ تەواوبوونی پشووی هاوینە دەچوومەوە سەر کارەکەی

خۆم واتە دەرسگوتنەوە. ئاغای میکاییلییش چونکە بەتەمای درێژەدانی خوێندنێ بوو، باشترین کار بۆ وی مامۆستایەتی بوو. هێندێ ڕۆژیش بە ئوتوبووس دەچووینە شەمیرانات، بەتایبەتی ئاو و هەوای ئەو لەو هاوینە گەرمەدا لەڕادەبەدەر خۆش بوو. ئاوێکی ساردی وەک چاوی قرژاڵ کە لە ترۆپکی چیاکەوە دەهاتە خوارێ و بە ئاوازێکی دڵبلاوێن بە نێو گابەرد و خڕ و دۆڵەکاندا تێدەپەڕی، هەر خۆش بوو سەیری بکەی.

کافتریا و ڕستورانتیان لەمبەرەوبەری جۆگەکە، کە ئاوەکەی بەخوڕ تێدەپەڕی دروست کردبوونز باشترین شوێن بوو سۆ سەیران و ڕابواردنی تارانییەکان.

بەتایبەتی ڕۆژانی هەینی و پشوو، شاخەوانی و هەڵگەڕان بە شاخ و داوێنی توچاڵدا خۆشترین دەموساتی گەنج و خێزانەکان بوو. ئەو ڕابواردنە بۆ ئێمە شتێکی تازە بوو. ڕۆژە گەرم و تاقەتبڕەکانی هاوینی بۆ ئێمە خۆش و شیرین کردبوو. بیریشمان لەوە دەکردەوە هەرچۆنێک بێ، لە تاران هەوڵی دۆزینەوەی کارێک بدەین. چەند جاران چووینە وەزارەتی پەروەردە، کە لە شەقامی ئەکباتان نزیک بەهارستانێ بوو. وەزارەتی فەرهەنگ حەوشەیەکی گەورە و پڕ لە داروبار و حەوز و نافوورەی زۆر جوانی هەبوو. بینا کۆنەکان هەموو نەقاشی و کاشیکاریی سەردەمی قاجار بوون، کە وێدەچوو یەکێکی بنەماڵەی قاجاری تێدا ژیابێ. بەرپرسی بەشی پەروەردەی سەرەتایی لەو وەزارەتخانەیەدا کەسێک بوو بە ناوی ئاغای ئەکرەمی. پیاوێکی زۆر باش و میهرەبان و بەسۆز بوو. کە چووینە لای و مەبەستی

خۆمانمان پێ گوت، بەوپەڕی دلۆڤانی گوتی زۆر باشــە. ڕووی لە من کرد و گوتی، تۆ بەو پێیەی بە فەرمی مامۆستای، کارەکەت ئاسانە. با بزانین بۆ ئاغای میکاییلی چیمان لە دەســت دێ. ســەرێکم لێ هەڵێننەوە. زۆرمان ســپاس کرد و بە ڕێزەوە ماڵاواییمان لێ کرد. جاری دووەم کە چووینەوە، هێندێ چا و سابوونی بۆنخۆشمان کە لەمەهابادەوە لەگەڵ خۆمان بردبوو، وەکوو دیاری بۆ برد. جا چونکە دیاریی شــوانەوێڵەی ئاڵەکۆکە و بێ مەبەســت، لێی قبووڵ کردین. ئینجا گوتی، کە هاتینەوە، بڕوانامەکانمان بێنین و ناونیشــانی خۆمانی بە وردی لەسەر بنووسین.

چەند ڕۆژ دواتر من عەرزیزەیەکم نووســی کە تێیدا داوام کردبوو بگوازرێمەوە تـاران. ئـاغـای میکـاییلیش داوای کرد دایمەزرێنن. وا دانرا ڕۆژی ١٥ی خەرمـانـان بۆ وەرگرتنەوەی جواب بچینەوە خزمەتی ئـاغـای ئەکرەمی. ئێمە ڕۆژانمـان دەبژاردن، تـا ئـاخری ڕۆژی پـانزەی خەرمـانـان هـات و بەیـانییەکەی بە جلوبەرگی پاکوخاوێن و ڕیشــی تاشــراو و قەڵافەتێکی ڕێکوپێکەوە چووینە وەزارەتـخـانە. چووینە ژوورەکەی ئـاغـای ئەکرەمی. زۆر بە موحیببەتەوە وەریگرتین و مزگێنیی داینێ کە کاری هەردووکمـان جێبەجێ بووە. هەر لەوێ ئەمرەکەمان وەرگرت. نەماندەزانی بە چ زمانێک سپاسی ئاغای ئەکرەمی بکەین. هەردووکمان وەکوو مامۆســتا لە قوتابخانەی ســەرەتایی مەولەویی تاران لە پشــت بازاڕی

قەوامودەولە لە شـەقامی شـاپوور دامەزرابووین، کە زۆر لە ماڵەکەی خۆمان دوور نەبووین. لە خۆشـــیان نەماندەزانی چی بکەین. لەپێشـــدا چووین شـــوێنی قوتابخـانەکەمـان دۆزییەوە. مووچەی من مـانگێ ٢٤٠ تمەن بوو. ئـاغـای میکاییلیش مانگێ بە ١٦٠ تمەن دامەزرابوو. ڕۆژێکیان پێش کرانەوەی قوتـابخـانە چووین. بەڕێوەبەرەکە لەوێ بوو. خۆمان پێ ناساند و لە سەرەتای ڕەزبەرەوە بە فەرمی لەو قوتـابخـانەیەدا دەســـتمـان بە وانەگوتنەوە کرد. جـا ئەو چاکەیەی ئاغای ئەکرەمی لەگەڵی کردین، زۆر گەورە بوو. دواتر تێچووی ســـەفەری مەهـابـاد بۆ تـارانیشـــی بۆ وەرگرتمەوە. ئەو هەمووە چـاکە و پیـاوەتییەی بەبێ چاوەڕوانی لەگەڵ کردین. هیوادارم خوا لە دنیا و قیامەتێ، پاداشتی ئەو پیاوە چاک و بە ڕوحم و دڵە بداتەوە.

هاوکارەکانی ئێمە، بە ژن و پاوەوە خەڵکێکی گەرموگوڕ و میهرەبـان بوون. بە تـایبەتی یەکێکیـان بە نـاوی ڕەزا زاهیدانی کە گەنجێکی خەڵکی ڕەشت بوو. ئیتر دواتر بووینە دۆســـتێکی بـاش. هەموو ڕۆژێ بە بـازارچەی قەوامـدا دەچووینە قوتابخانە. نیوەڕۆیانیش هەر لەو بازارە فراوینمان لە خواردنگەیەک دەخوارد، کە خواردنی گەرم و خۆش و بەتامی وەکوو کەباب و خۆرشـــت و برنج و فســـنجان و بنکرپلاو و کشمیش پلاوی هەبوو.

تاران بە ڕاستی شارێکی خۆش بوو. خەڵکێکی کەم، بەبێ قەرەباڵغی و دووکەڵ، ئاو وهەوایەکی لەڕادەبەدەر خۆش و تەنـدروســـــت. ئەگەرچی هـاوینـان گەرم دەبوو، بەڵام کوێســتانەکانی دەوری تاران وەکوو فشـم و شـەمیرانات و

کەرەج ودەماوەند بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە دەستیان دەڕۆیشت یان وەکوو ئێمەماڵبەکۆڵ بوون، زۆر تایبەت بوو. تارانی ئەودەمی لە ڕۆژهەڵاتەوە دەگەیشتە پردەدارینە و لە ڕۆژئاواوە حیشمەتودەولە و لە باشوورەوە ئاسنەڕێ و شەقامی مەولەوی و لە باکوورەوە ئاوی مەنگول و شەقامی شاڕەزا. جوانترین شەقامی شار، لالەزار بوو، کە لەبەر ئەوەی دووکانی جوانکاریی وەکوو فرۆشگای گەورەی پێداویستییەکانی ئاڕایشگا و کافتریان و ڕستوڕانت و سینەمای لێ بوو، یەکێک بوو لە باشترین شوێنەکانی شار و شوێنی گەڕانی گەنجان و خەڵکی دەوڵەمەند و ئەو خانمانەی خۆیان بە مۆدێرن دەزانی. ڕستوڕانت و کافتریای شمشاد یەکێک بوون لە باشترین و مۆدڕێنترین کافتریاکانی تاران. ڕۆژانی هەینی جاروبار بە "ماشێنی دوودی" دەچووینە شاعەبدولعەزیم کە زیارەتگەی سەرەکیی تاران و دەوروبەری بوو. لەوێ بە ڕیز کەباخانە کرابوونەوە. ئەو بازاڕەی دەچۆوە سەر زیارتگەکە، پڕ بوو لە کەبابخانە و خواردنگە. گەنج بوون و بە گوێرەی گەنجیەتیم دڵم بەو گەڕانانە خۆش بوو. بیرەوەریی شیرین و لەبیرنەکراوم لەو سەردەمی زۆر هەن. ژیانمان بە خۆشی تێدەپەڕی و زۆربەی کات بێکاریمان بە خوێندنەوە پڕ دەکردەوە. من خۆمم بۆ بەشداری لە تاقیکارییەکانی شەشی ئەدەبیدا ئامادە دەکرد. کۆتاییەکانی پاییزی ١٣٢٢ بوو، کە لە کۆمەڵەی

ژێکافەوە ئەرکێکم پێ ئەسپێردرا. گۆیا سێ ئەندامی دەستەی ناوەندیی ڕێکخراوەکەیان بە هێندێ بەڵگەنامەوە لە دەوروبەری سـڵدووز گرتبوو و هێنابوویاننە تاران. دەبوو شـوێنی گیرانەکەیان بدۆزمەوە و بشـزانم چۆنن و هەواڵیان بنێرمەوە. یەکەم شـوێنێکی سـەردانیم کرد، شـارەوانیی گشـتی بوو لە شـەقامی سـێی ئیسـفەند، بەرانبەر وەزارەتی دەرەوە. چونکە جگە لە ئیدارەی شارەوانی، زیندانیشی هەبوو بۆ ڕاگرتنی ئەو کەسانەی هێشتا لێپرسینەوەیان لێ نەکراوە، پاش پرسیار و گەڕانێکی زۆر و خەرجکردنی پارەیەکی باش، دەرکەوت بەو دواییانە سـێ کوردیان گرتووە و لە یەکێک لە هۆدەکانی نهۆمی یەکەمی شارەوانی بەتەنیشت هۆدەی لێکۆڵەرەوەکانەوە زیندانی کراون. بەرپرسـی پێوەندیداریانم دۆزییەوە. پێم گوتم یەکێک لە گیراوەکان برامە. هەر چاوێکم پێی بکەوێ بەسـمە. تەنیا چەند سـاتێک بمبەنە لای. پاش چەلەحانێیەکی زۆر، ئاخری ڕازی بوو سەعات ٣ی دوانیوەڕۆ کە فەرمانگە دادەخرا و فەرمانبەر دەڕۆیشـتنەوە، دەرگاکە بکاتەوە و من پێنج خولەک، زیاتر نا، چاوم پێی بکەوێ. کە دەرگا کراوە و چاویان بە من کەوت، سـەریان سـووڕ ما، پێیان وابوو منیش گیراوم. سـێ کەسـەکە بریتی بوون لە قادری و ڕەحمان زەبیحی و دڵشـاد. پێیان گوتم لە دۆخێکی مەترسـیداردان. بەڵگەیان پێ گرتوون، بەڵام هێشـتا دانیان بە هیچ شـتێکدا نەناوە. پرسـیم پارەیان پێویستە؟ گوتیان جارێ نا. ڕێکخراوەکەمانم لە ورد و درشـتی مەسـەلەکە ئاگادار کردەوە. بەڵام شـتێک هاتە گۆڕێ، کە سێ مانگ دواتر هەر سێکیان ئازاد کران.

## خانەی فەرهەنگی سۆڤیەت (ڤۆکس)

زستانی سالّی ۱۳۲۲ و بەهاری ۲۳ تەواو بوون. قوتابخانە داخران. من و ئاغای میکاییلیش بەتەما بووین بۆ پشووی هاوینێ بگەڕێینەوە مەهاباد، بەڵام کە چووین مالآوایی و مالّئاوەدانی لە ئاغای ئەکرەمی بکەین، پرسیی، بۆچی دەچنەوە مەهاباد؟ گوتمان لێرە بێکارین. هەواش گەرمە. گوتی کارێکم بۆ لەبەرچاو گرتوون. دەتاننێرمە وەزارەتی دارایی، دوانیوەڕۆیان لەوێ کار بکەن. بۆ زێدەکارش پوولّی چاکتان دەدەنێ. ئێمەش قبوولّمان کرد. ئاغای ئەکرەمی یادداشتێکی نووسی و پێی داین. بردمانە وەزارەتی دارایی لە شەقامی هۆمایۆن. لە فرۆشگای فێردەوسی شوێنی کاریان بۆ دەسنیشان کردین. هەموو ڕۆژێ دوانیوەڕۆیان دەچووین تا سەعات شەش فۆڕمی پرسیاری خەڵکمان بۆ دابەشکردنی کۆبۆنی خۆراک ڕێک دەخست. دانی بەیانییش خۆمان بۆ تاقیکردنەوەکان ئامادە دەکرد.

مابن ئەوێ سالّێ پەیمانگەکانی مامۆستایان، ڕێگەی بەشداربوونیان لە تاقیکردنەوەکانی شەشی دواناوەندییان نەدا. بەڵام ئاغای میکاییلی لە تاقیکردنەوەی کۆنکۆری پزیشکی بە پشکی سوپا بەشداریی کرد و بۆ پزیشکیی ددان وەرگیرا. ناوبراو لە کۆتایی خەرمانانا شوێنی خۆی گواستەوە بۆ خەوگەی خوێندکارانی کۆلێژی ئەفسەری و منی لەو هۆدەیەدا بەتەنێ بەجێ هێشت. بەو حالّەشەوە زۆر خۆشحالّ بووم کە دەرچووە. بە

ڕۆیشـــتنی وی تەنیا کەوتمەوە. بەڵام دۆســـتایەتیی ئاغای زاهیـدانیی هـاوکـاری قوتـابخـانەم دوورییەکەی میکـاییلیی قەرەبوو دەکردەوە. زۆربەی کات پێکەوە بووین. بۆ جێژنی نەورۆزی ســـاڵی ١٣٢٤ ئاغای زاهیدانی لەگەڵ خۆی بردمی بۆ ڕەشــت و زۆربەی شـــارەکانی باکووری ئێرانی پێشـــان دام. هەوای خۆش و سروشتی سەوزی باکوور، ئەگەرچی بارانەکەی خۆشی نەدەکردەوە، بەڵام بە ڕاستی ڕۆحی تازە کردمەوە. هەر بە ڕاســـتی ئەگەر بە گوێرەی پێویســـت بەو نـــاوچەیە ڕا بگەن، بە دڵنیـــاییەوە یەکێکە لە جوانترین شوێنەکانی دنیا.

لە تـاران پـاش تەواوبوونی دەرس، زۆربەی ڕۆژەکـان دەچووینە کافتریایەکی سەرەتای شەقامی سەعدی لە ژوور چوارڕێیانی موخبیرودەولە. کافتریایەکی بچووک و خاوەن بوو. شـــیر و قاوەیەکی خۆشـــیشـــی هەبوو. ڕۆژنامەیەکمان دەکڕی و تـا تـاریکـان لەوێ دادەنیشـــتین. ئەو کـافتریـایە هاوکات شوێنی باسوخواسی سیاسییش بوو. تەنانەت بەو کافتریای توودەییەکان بەناوبانگ بوو. پاش ڕووداوەکانی خەرمانانی ١٣٢٠، لەگەڵ تۆزێک کرانەوەی کەشی سیاسی (ئەویش هەر بەناو) لە ســـۆنگەی هەبوونی هێزە بیانییەکان لە ئێراندا، گەلێ حیزب و دەسـتە و تاقم پێک هاتبوون. بەڵام لە هەموان گرینگتر کە زۆریشـــــی لایەنگر هەبوو، حیزبی توودە بوو. نووســـینگەی ئەو حیزبە لە ســـەرەتای شـــەقامی فێردەوســـی بوو. دەرگا گەورەکەی ڕۆژ تا ئێوارێ لەســـەر پشـــت بوو و خەڵکی دیکەش بۆیان هەبوو بچن گوێ لەو وتـار و لێدوانـانە بگرن کە ســـەرکردەکانی ئەو حیزبە لە

حەوشـە گەورەکەیدا پێشـکەشـیان دەکردن. منیش چەند جارێک لەگەڵ ئاغای زاهیدانی چووم.

هێندێ جاران، حیزبی توودە لە تاران خۆپێشاندانیشی وەڕێ دەخسـت. ئەو دەمـی سـاعد مەراغەیـی سەرۆکوەزیران بوو، ڕۆژێکیان ئەندامانی توودە بە ڕیزی ڕێکوپێک لە شـەقامی ئەسـتەنبوڵ و شـابادەوە بەرەو مەجلیس کەوتنە ڕێ، دروشـمی بژی و بمرێ شـارەکەی تەنیبوو. دروشـمی بمرێ سـاعید، جوان و بە ڕوونی دەبیسـرا. لە مەجلیسـیش وتاری ئاگرین و بەکەفوکوڵ دەدرا و بـازاڕی ڕۆژنـامە گەرم بـوون. یەکـێـک لە سـەرنووسـەرەکان، ئاغای شـاهندە بوو، کە دەرچووی پەیمـانگەی مـامۆسـتـایـان و برادەری بەڕێوەبەری قوتـابخـانەکەی ئێمە بوو. نـاوبراو لە ڕۆژنـامە دوو لاپەڕەییەکەی "فەرمان"دا جارێ لە نالّی دەدا و جارێ لە بزمار. ئیتر هەواداری و لایەنگریی چەپەکان، نیشـانەی پێشکەوتن و ڕووناکبیری بوو.

ڕۆژێکـیـان لە بەردەم مەجـلیسـی شـووڕای میللی(پەرلەمان) خۆپێشـاندانێکی گەورە کرابوو، ئێمەش وەک خەڵکەکە چووبووینە سـەیر. لەلایەن خەڵکی جۆراوجۆرەوە وتاری زۆر سـەیر پێشـکەش دەکران، کە بە ڕاسـتی تێی نەدەگەیشـتین و نەمـانـدەزانی ئەو کۆبوونەوەیە بۆ چییە. لەو بەینەدا وتـاری ئـاغـای درەخشش کە مامۆستا بوو لە هەموان بەکەفوکوڵتر بوو. کتوپڕ لەلای باکووری مەیدانی بەهارسـتانەوە چەند

زرێپۆشـی سـەربازی پڕ لە چەکدار گەیشـتن. بوو بە تەقە. هەموو دوو لاقی دیکەشـــیـان قەرز کرد بۆ ڕاکردن. لەو جەنگەیەدا تیرێکی نەبەدی ســـینگی ئاغای خانەلیی پێ کا و دەمودەسـت کوشـتی. ناوبراو مامۆسـتایەکی لێقەوماو بوو. ئێمەش بە شـــەقامی شـــابادا ڕامان کرد. شــیرینیخانەی نەوبەخـت کرابۆوە، خەڵکێکی زۆر خۆیـان بەوێـدا کرد. خاوەنی شـــیرینی خانە دەرابەی دووکانەکەی داکێشـــا. خەڵـکەکەیـش هەلـیـان بە دەرفەت زانــی و کەوتــنە شیرینخواردن. لە چاوترووکانێکدا ڕاکردووەکان کە دەتگوت نەدی و بدین، چیی شـیرینی بوو خواردیان. کە تەقە بێدەنگ بوو و ئیدی هیچ دەنگێک نەما، خەڵک دەرابەیان هەڵداوە و بەسـپایی وەکوو دزی شـەوگەڕ بۆی دەرچوون. هێندێکیان لە ڕاکردنێدا شـیرینییان لە گیرفانی بەر دەبۆوە. ئاکامی ئەو خۆپێشاندانە و شەهیدبوونی گەنجێکی خێرلەخۆنەدیو، ئەوە بوو کە عەلی ئەمینی بوو بە ســـەرۆکوەزیران و محەمەدی درەخشـــش کرا بە وەزیری پەروەردە و شـــیرینیخانەی نەوبەختیش تاڵان کرا. بۆ ماوەیەک دنیا هێور بۆوە.

لەو دەنگەیەدا ئێمە هەر وەک جاران سـەردانی کافتریای بەهارمان دەکرد لە ســـەعدیی شـــیمالی. کاریشـــمان بە سیاسەتەوە نەبوو. ڕۆژێکیان لە کافتریای گۆرین ڕۆژنامەی ئیتلاعاتم دەخوێندەوە، بەسەر بانگەوازێکدا کەوتم، زۆر زۆر ســـەرنجمی ڕاکێشـــا. نووســـیبووی، دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستی، بە ڕەزامەندیی وەزارەتی دەرەوەی ئێران، چـل خوێنـدکـاری ئێرانی بە خەرجی خۆی دەبـاتە سـۆڤیەت بۆ خوێندن. خوازیاران دەتوانن بۆ زانیاریی زیاتر

سـەردانی خانەی فەرهەنگی سـۆڤیەت بکەن لە شـەقامی حـافز. ئەوەی لێی دەگەڕام، دۆزیبوومەوە. ڕۆچنەی هیوایەکم لێ دەرکەوتبوو. بۆ بەیانی خانەی فەرهەنگم لە شـەقامی حافز دۆزییەوە، کە گۆیا پێشـترماڵی کچەکەی موسەدیق بووە. لە حەوشەکەی ئەوێ، بانگەوازی ناردنی خوێندکارانیان لە تابلۆی ڕاگەیاندنەکە دابوو. بەڵگەنامەی پێویسـت، بریتی بوو لە ناسـنامە و بڕوانامەی خوێندن و فۆرمێک کە دەبوو پڕ بکرێتەوە. کەسـم نەدیت لەوێ داوخواز بێ. لە یەکێک لە ژوورەکاندا، ئەفسـەرێک بە یۆنیفۆرمی سەربازیی سۆڤیەتەوە بەرپرسی ناونووسین بوو. بە زمانی فارسـی و زاراوەی ڕووسـی هەموو شـتەکانی پرسـی و ناونیشـانی شـوێنی کار و ژیانمی لە تاران یادداشـت کرد و تەواوی ئەو بەڵگانەی لە فایلێک خسـت و لەسـەر فایلەکە بە زمانی ڕووسـی شـتێکی نووسـی و گوتی دە ڕۆژی دی سـەرێکیان لێ هەڵێنمەوە، کە لەوانەیە ئاکامەکەیم پێ ڕابگەیەنن. سپاس و ماڵئاواییم کرد، بەڵام تـا نیوەڕۆیە هەر لە حەوشـەکەی خـانەی فەهەنـگ مـامەوە، چونکە هەم بـاغێکی زۆر خۆش بوو، هەم حەزم لێ بوو بزانم کێی دیکە دێن و ڕایـان چییە. ئینجـا تۆزێکیش نیگەران بووم لەوەی بە بڕوانـامەی پەیمانگەی مامۆسـتایان وەرمنەگرن. ئەو ڕۆژە کەس نەهـات، بەڵام من هەموو ڕۆژێ دانی بەیـانیـان دەچووم. پشـووی هـاوینیش بوو، هیچ کـارێکم نەبوو. پێم وایە چوارەم ڕۆژ بوو کە دوو کەس سەردانیان کرد. یەکێکیان

گەنجێکی باریکەڵەی باڵابەرزی خەڵکی قووچان بوو بەناوی عەلی خواجووی، ئەوی دی گەنجێکی کورتەباڵای چاو بادامی بوو، کە زیاتر لە ژاپۆنی دەچوو نەک ئێرانی. لەگەڵ خواجووی قسەمان کرد. ئەویش دیپلۆمی دواناوەندیی نەبوو و پەیمانگەی پزیشکیاریی تەواو کردبوو و پێنج ساڵ بوو کاری دەکرد. وەکی دەیگوت، بە پێی یاسا کەسانی وەک وی مافی ئەوەیان هەبوو، لە ساڵی چوارەمی کۆلێژی پزیشکییەوە بخوێنن.

هەرچۆنێک بوو، جارێ ئەوەیان هیچی لە من زیاتر نەبوو. ئەوی دیکەیان، کورتەباڵاکە ئێمەی نەدواند، لەبنەوەبڕ دیار بوو، دواتر زانیم عەلی فێرنادی خوشکەزای دکتۆر یەزدیی ئەندامی ئۆرگانی ناوەندیی حیزبی توودەیە. ئیتر چەندەی خوێندبوو، دواتریش هەر باسی نەکرد. بەڵام دواتر من کەسم لەوێ هەر نەدی بێ بۆ ناونووسین، ئەوەش لەلایەک دڵخۆشی دەکردم، چونکە پێم وابوو ئەگەر داوخوازەکان زۆر بن، شانسی سەرکەوتنی من کەمتر دەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا نیگەران بووم نەکا ئەگەر بەگوێرەی پێویست خوازیار نەبوایە، لەوانەبوو ناردنی خوێندکار هەڵوەشێتەوە. ئینجا باشە بۆچی کەس خوازیار نییە، بەتایبەتی لە نێو لایەنگرانی حیزبی توودەدا. دیارە ئەودەمی خوێندن لە وڵاتێکی کۆمۆنیستی لایەنگرێکی ئەوتۆی نەبوو. بەتایبەتی لەبەر ئەوەی پاش تەواوکردنی خوێندنەکە، لە ئێرانێ بە ئاسانی کاریان پێ نەدەدرا، هەڵبەت بۆ من جیاواز بوو. من لە بارودۆخێکدا بووم کە بۆ درێژەدانی خوێندن، خۆم بە ئاو و ئاگرێدا دەکرد و بیریشم لە داهاتووەکەی

نەدەکردەوە، بەتایبەتی لەو تەمەن و دۆخەدا کە هیچ کەسێکم نەبوو تەگبیرێکی پێ بکەم و مشوورێکم لێ بخوا، وەکوو باڵندەیەکی تەنیا و بێ هێلانە وابووم، کە تەنیا یەک شتم بەلاوە گرینگ بوو، ئەویش سەرکەوتن لە خوێندندا، جا لە هەر جێیەک بێ و هەڵکەوێ. جا چونکە دەستیشم بە هیچ کوێ ڕانەدەگەیشت، ئەوەش بۆخۆی خوا گەیاندبووی. ئیتر بەو فکر و خەیاڵ و ئاواتانەوە ڕۆژانم دەژماردن بەشکم زووتر ئاکامەکەم لێ ڕوون بێتەوە.

چەند ڕۆژ دواتر گوتم نەکا شتەکە بکرێتە خزم خزمێنە. جا خۆ ئاوا بێ من کەسم نییە. لە حیزبی توودەشدا کەسم نییە هانای بۆ ببەم. کتوپڕ بە فکرمدا هات، باشترە بچمە لای سەدری قازی، نوێنەری مەهاباد لە مەجلیسی شووڕای میللی. ماڵەکەیان لە شەقامی مونیریەی تاران بوو. بۆ سبەینێکەی دوانیوەڕۆ چوومە ماڵیان. دەرکەوان دەرگای لێ کردمەوە و بردمییە ژوورێکی نهۆمی یەکەم. چەند دەقە دواتر جەنابی سەدر بەو قەڵافەتە گرانوسەنگین و بەویقار و هێمنەوە تەشریفی هێنا. حاڵ و مەسەلەی خۆمم بە تێروتەسەلی بۆ باس کرد. بەوپەڕی نیازپاکییەوە قبووڵی کرد کە سبەی لەگەڵم بێتە خانەی فەرهەنگ. سەعات ٩ی بەیانی پێکەوە چووینە خانەی فەرهەنگی سۆڤیەت. ژووری بەرپرسی ناونووسینەکەم پێشان دا.

وەژوور کەوت. ماوەیەکی پێ چوو، کە هاتە دەرێ، گوتی تەواو بوو. دڵنیا بە قبووڵ کراوی. زۆرم ســــپاس کرد و تا شـــەقام بەڕێم کرد. ســـواری پەیتوون بوو و چۆوە ماڵی خۆی. لە خۆشــیان خەنی و شــاگەشــکە ببووم. چەند ڕۆژ دواتر بۆ دڵنیابوون ســــەرێکم لە خانەی فەرهەنگ داوە و چوومە ژووری سەرکورد. هەر دیتمی، ناسیمییەوە و گوتی، خۆشحاڵ بە لە ڕیزی وەرگیراوەکاندای. پرسیم، خۆم ئامادە بکەم؟ گوتی بەڵێ تا پازدە ڕۆژی دی دابودەســـتوورەکە لە ڕێی وەزارەتی دەرەوەی ئێران تەواو دەبێ. گوتم کەوابوو لەو ماوەیەدا دەتوانم بچمەوە مەهاباد و ماڵاوایی لە خزم و کەس بکەم؟ گوتی بەڵام زۆر نەمێنییەوە، زوو وەرەوە. بە پەلە هاتمە دەرێ.

## دۆخی ناوچەکە

لە ماوەی دوو ڕۆژاندا، هەرچی کەلوپەلی ناوباڵەکەم بوو فرۆشتم و بەرەو مەهاباد وەڕێ کەوتم. لە ڕێیە پاش قەزوین، ئیتر ئاسایشی دەوڵەتی لێ نەبوو. لە هەموو شوێنێک ئەندامانی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان بە چەکەوە دەسووڕانەوە و جڵەوی ناوچەکەیان بە دەستەوە بوو. ڕادیۆ تەورێزیش یەکپشوو بە زمانی ئازەری هەواڵ و بەرنامەی بڵاو دەکردنەوە. گۆڕانکارییەکی بەرچاو بەدی دەکرا. پێکهاتنی حکوومەتی فیرقە و مەجلیسی نیشتمانی و زانکۆ و هێزی سەربازی و ئاسایش، بەشێک بوون لەو کارانەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان کردبوونی. لە شاری تەورێز لە جادە و ڕێگەوبانن کامیۆنی پڕ لە سەربازی سۆڤیەتی دەبینران. دەسەڵاتی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان تا نزیک میاندواو بوو. جا ئەوەندەی لەبیرم بێ میاندواو و دەوروبەری بەتایبەتی بەرەو بۆکان و مەهاباد بە دەست حیزبی دیموکراتەوە بوو. سەرۆکی سەربازگەی شاری میاندواو سەید محەمەدی ئیسحاقی بوو، کە پلەی سەروانیی هەبوو و لەوێ بە دەسەڵات بوو. گەنجێکی زۆر بە بیروباوەڕ و نەتەوەیی. فیداکار و چاونەترس بوو. من لە میاندواو چوومە نووسینگەی کارەکەی. کەیفم بە ئەخلاق و هەڵسوکەوت و جوامێرییەکەی هات. نازانم ئاخری چیی بەسەر هات، هەڵبەت هێندێ شتیان دەگوتن، بەڵام چونکە ڕاستییەکانم لێ ڕوون نین، لەوبارەیەوە هیچ ناڵێم.

ڕۆژی دووی خەرمانانی ساڵی ١٣٢٤ گەیشتمەوە مەهاباد. لێرەش ئاسەواری حوکمەتی تاران نەمابوو. شارەوانی بەدەست حیزبی دیموکراتەوە بوو و کاربەدەستەکانی هەموو کورد بوون. شارەکە لە ناوچەیەکی سەربازی دەچوو. خەڵکی چەکدار دەهاتن و دەچوون، بەڵام تەناهی و سەقامگیری بەسەر شارەکەدا زاڵ بوو. دیار بوو کەس نیگەران نییە لەوەی ئەو هەمووە چەکە بەدەست خەڵکەوەیە. خەڵکی بازاڕ و دووکاندار خەریکی کار و کەسابەتی خۆیان بوون. ئێرە سەربازی سۆڤیەتی لێ نەبوون. عەشایر سەرلەبەر کەوتبوونە گەڵ حیزب. ڕێکخراوی لاوانی حیزب یەکێک بوو لە ناوەندە هەرە سەرنجڕاکێشەکان. قەت وا نەبووە لاوان ئەوەندە بە کەفوکوڵ بن. هەرگیز نەبینرابوو لە کوردستان تەواوی چین و توێژەکان بە شاری و گوندی و عەشایرەوە ئاوا پێملی یەک کەس بن. بە ڕاستی قازی محەمەد پێشەوایەکی بێهاوتای کوردستان بوو.

دزی و ڕێگری و ملهوڕی و شەڕاشۆیی زۆر کەم ببۆوە. تاقە کێشەیەکی لە ناوچەکەدا هەبوو، ئەوە بوو خەڵک حەوجێیان بە هێندێ شتومەکی پێویست هەبوو، کە دەبوایە لە دەرەوەی کوردستانەوە دابین بکرێن، یەک لەوانە لەو ناوچەیە نەوت و بەرهەمەکانی دەست نەدەکەوت. سەرەڕای ئەوەی هیچ کام لە هەڵسووڕێنەرانی سەرەتای کۆمەڵەی ژێکاف لە ڕێکخراوە تازەکەی حیزبی دیموکراتدا دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام جۆرێک یەکیەتی و هاودەنگی لە سەرانسەری کوردستاندا هەبوو. حەمەڕەشیدخانیش بە

لایەنگرەکانی خۆیەوە گەڕابۆوە عێراق. ئەوە بوو بارودۆخی کوردستان بەتایبەتی مەهاباد لە خەرمانانی ساڵی ١٣٢٤دا.

حەفتەیەک پاش گەڕانەوەم بۆ مەهاباد ماڵاواییم لە دۆست و خزمان کرد و گەڕامەوە تاران. بە ئۆتوبووس چوومەم مەراغە و لەوێشەوە بە شەمەندەفەر هاتمەوە تاران. هێندێ شتی دیکە لەبارەی حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە مان، کە لە شوێنی خۆی ئاوڕیان لێ دەدەمەوە.

## شادیی پاش بێهیوایی

که گەیشـــتمەوە تاران، بۆ ســـبەینێکەی چوومە خانەی فەرهەنگی ســۆڤیەت. بێدەنگییەکی قورس بەســەر ئەو باغە خۆشـــە و هەیوان و بینـایەدا زاڵ ببوو، کە لێم ببووە زیارەتگایەک. چەندی چاوەڕێم کرد، کەسم لە حەوشە نەدی پرســیارێکی لێ بکەم. لەســەر تابلۆی ئاگادارییەکانیش هیچ بابەتێک نەبوو پێوەندیی بە ناردنی خوێندکارەکانەوە هەبێ. شــەرمم دەکرد بچمە ژوورەکەی ســەرگورد. زۆر چاوەڕێم کرد تا ئاخری ســەرگورد بەخۆی و فایلێک لە بن هەنگڵدا لە ژوورەکەی هـاتە دەرێ. هەر دیتمی، بەرەو لام هـات. من سڵاوم کرد. گوتی جارێ هیچ باس نییە وا دیارە لە سەرەوە کارەکان چەتیان تێ کەوتووە. بەڵام چاک دەبێ. بەوپەڕی بێهیواییەوە لە خـانەی فەرهەنـگ هـاتمە دەرێ و بەبێ ئامانجێکی ڕوون بە شــــەقامی نادریدا وەڕێ کەوتم. ماڵ و حاڵم لێ تێک چووبوو. ژوورێکم لە میوانخـانەی گەیلان لە پشت شارەوانیی تاران لە تۆپخانە بەکرێ گرت. لە هەمووش خراپتر کەســم لە داوخوازەکان نەدەدی لانیکەم دەردەدڵێکی لەگەڵ بکەم. لەو مـاوەیەدا هـاوڕێ و هـاوکـارەکەم، ئاغـای زاهیدانیشـــم لەکیس چووبوو. تەنانەت نەمدەزانی ئاخۆ لە تـارانە یان چووەتەوە ڕەشــــت؟ نەکا تەواوی ئەو هیوا و ئاوات و ئارەزوانەم لێ ببنە بڵقی سەر ئاو. هیچ شتێک لەوە ناخۆشتر نییە چاوەڕێ بی و نەشزانی چیت بەسەر دێ.

هەموو ڕۆژێ دەچوومە خـانەی فەرهەنـگ. بەڵام ڕێـک وەکوو دزان، بەســـپایی وەژوور دەکەوتم بۆ ئەوەی کەس

نەمبینێ. تاقەتی هیچ شـــتێکم نەبوو. لەخۆوە ســـەیری جامخانەی دووکانانم دەکرد.

خەڵک وەکوو سێبەر بەلامدا تێدەپەڕین. هۆشم بەسەر خۆمەوە نەبوو. ڕۆژێکیان لەو دۆخەدا لە نزیک کافتریای نادری یەکێک دەســـتی لەســـەر شـــانم دانا، ئاوڕم داوە ئاغای زاهیدانی بوو. گوتی ئەوە چیتە؟ بۆ وا دەرفکری؟ وەک خونچەیەک گەشـــامەوە. بە ڕاســـتی پێویســـتم پێی بوو. لە خۆشـــیان خەنی بووم. گوتم هیچ نییە. چووینە کافتریاکە، داوای دوو نســـکافەی کرد. گوتی پێم وابوو بەبێ ماڵاوایی ڕۆیشتووی.

گوتم ئاغای زاهیدانی چما دەکرێ من بەبێ ماڵوایی بڕۆم؟ خۆ هێشـتا دابودەسـتووری ئیداری تەواو نەبووە. ئیتر ســـیاســـەتە، هیچ دوور نییە دەوڵەتەکەی خۆمان پەژیوانیش بێتەوە و بە ناردنی خوێندکار ڕازی نەبێ. ئاخر ئێمە گەمەی دەستی سیاسەتین. ئەویش دەوڵەتێک کە بۆخۆی نەتوانێ ســـەربەخۆ بڕیار بدا. هەرچۆنێک بێ دانیشتین و زۆرمان قسە کرد و قەول و قەراری دیداری داهاتوومان دانا. من چوومەوە میوانخانە. خەم و پەژارە لەســـەر دڵم کەڵەکە ببوون. ڕەنگ بێ بەرەی ژیانی من هەر لە بنێڕا ڕەش چنرابێ. چەند ڕۆژێکی دیکەش تێپەڕی. کەفوکوڵەکان وردە وردە نیشـتنەوە و خەرمانان بەرەو کۆتایی دەچوو. نەمدەزانی چ بکەم، ئاخۆ هەر وا لە میوانخـانە وەمێنم یـان دیســـان ژوورێـک بەکرێ بگرمەوە. توانای بڕیاردانم نەمابوو. خوێندن دەســـتی پێ

کردەوە. وەکوو جاران چوومە قوتابخانەی مەولەوی. هەر پۆلەکەی جاران و منداڵە بەدفەڕەکانی جاران. دەتگوت جەستەیەکی بێگیانم، یان دارێکی ئاوی نەگاتێ، خەریک بوو وردە وردە وشک دەبووم. ئەی خۆزگە ئەو شتە هەر نەهاتبا پێش. خەریکی ژیانی خۆم بووم و، نەخشـــەیەکی خۆمم هەبوو و بەکاوەخۆ بەرەو ئەو بەڕێوە بووم. لەگەڵ ژیـانە ســـادە و بێ قڕەکەی خۆم ڕاهاتبووم، بایەک هەڵی کرد و بوو بە بۆران و تۆفان و هەموو شـــتێکی تێک دا. ژیان هەم زەرەری ماڵیی تێدایە و هەم زیانی مەعنەوی. دووەمیان لە یەکەمیـان زۆر بەهێزترە. خەســـاری مـاڵی لەوانەیە زوو قەرەبوو بکرێتەوە، بەڵام خەسـاری مەعنەوی و ڕۆحی زۆر بە ئاســـانی لەبیر ناکرێ. ڕەزبەریش تێپەڕی. یەکەم ڕۆژی مـانگی خەزەڵوەر بوو، شـــەوێ خەونی خۆش خۆشـــم دیتبوون. دەتگوت ئیلهامم پێ کرا ئەمڕۆ شـــتێک دەبێ. پاش تەواوکردنی دەرس لە قوتابخانە هاتمە دەرێ. بەبێ ئەوەی بیر لە فراوین بکەمەوە، چونکە زۆربەی کات نانی نیوەڕۆم لە بازاڕی قەوامودەولە دەخوارد، بە پەیتوون خۆم گەیاندە خانەی فەرهەنگی سـۆڤیەت. هەر گەیشـتمە بەر هەیوانەکە، ســـەیرم کرد چەند کەســـێک ڕاوەســـتاون و ئەو ئاگادارییە دەخوێننەوە کە لە تابلۆی ئاگادارییەکان درابوو. لە پشتەوەی ئەوانەوە خوێنـدمەوە: ئەو خوێنـدکـارانەی دەنێردرێنە ســـۆڤیەت، دووســـبەی، ســـێی خەزەڵوەر بۆ وەرگرتنی پاسـپۆرت و بلیتی فڕۆکە، سـەعات دەی بەیانی بێنە خانەی فەرهەنگ. تـابلۆکە نـاوی کەســـی لەســـەر نەبوو. بڕوام نەدەکرد. بڵێی خەو نەبینم. چوومە ژووری ســـەرکورد. هەر

دیتمی، بزەیەکی هاتێ و گوتی، پیرۆزە. دووسبەی وەرە پاسپۆرتەکەت وەرگرە و برۆ خۆت ئامادە بکە.

ڕۆژی چواری خەزەڵوەر سەعات هەشتی بەیانی دەفڕن. ئیتر دڵنیا ببوومەوە. لە حەوشەی خانەی فەرهەنگ هاتمە دەرێ. بە پیاسە و دڵێکی تژی لە خۆشی بەرەو شەقامی ئەستەنبوڵ ڕۆیشتم و لە کافتریای شمشاد فراوینێکی دەوڵەمەندانەم خوارد. دەمودەست پاش نانخواردن خۆمم گەیاندە قوتابخانە. لەوێ بەڕێوەبەر و ئاغای زاهیدانیم ئاگادار کردەوە و گوتم من لە دووسبەیڕا نایەمەوە قوتابخانە. ئەو ڕۆژە دوانیوەڕۆکەی وەکوو ڕۆژانی پێشوو وانەم گوتەوە، بەڵام باسی سەفەرەکەی خۆمم بۆ قوتابییەکان نەکرد. کە زەنگی کۆتایی پۆل لێ درا، منداڵ بە قیژە و دەنگەدەنگ چوونە دەرێ. چوومە نووسینگەی مامۆستاکان. بەڕێوەبەر بە هەموو مامۆستاکانی گوتبوو نەڕۆن. منداڵ لە حەوشەی قوتابخانە چووبوونە دەرێ. ئەو ناوە بێدەنگ و هێمن بوو. مامۆستاکان هەموو لە هۆدەی بەڕێوەبەر کۆ ببوونەوە. نەیاندەزانی چ باسە. چەند ساتێک دواتر بەڕێوەبەر گوتی: خوشکان و برایان، ئەمڕۆ یەکێک لە هاوکارە باشەکانمان، قوتابخانەکەمان جێ دێڵێ. هەڵبەت دەچێ درێژە بە خوێندنەکەی بدا. ئینجا بەرەو لای من هات و تۆقەی لەگەڵ کردم و لەباوەشی گرتم، بەڵام پێی نەگوتن دەچمە کوێ. جگە لە ئاغای زاهیدانی کە ئاگادار بوو، ئەوانی دی سەریان سووڕ ما.

هەموو بە داخ بوون. بەڵام خانمی ڕیاحی، مامۆستای پۆلی سێ چاوی پڕ ببوون لە فرمێسک. ئێمە زۆربەی کات لە قوتابخانە پێکەوە تێنسمان دەکرد. ئیتر ماڵاواییم لێ کردن. لەگەڵ ئاغای زاهیدانی وەکوو هەموو جارێ پێکەوە هاتینە دەرێ و بۆ تاهەتایە ئەو قوتابخانە و کۆڵانە تەنگەبەرەکانی و بازاڕەکەی قەوامم بەجێ هێشت. لە ڕێیە زاهیدانی پرسیی، خۆ بەیانی هیچ باس نەبوو. گوتم نیوەڕۆیە چوومە خانەی فەرهەنگ، لەوێ ئاگادار بوومەوە. گوتم هەم خۆشحاڵم و هەم ناڕەحەت. خۆشحاڵم کە دەبینم ئاخری سەرکەوتی و بۆ درێژەدانی خوێندن دەچیە وڵاتێکی زۆر پێشکەوتوو. دەچیتە دنیایەکی نوێ. بەداخم لەبەر ئەوەی دۆستێکم لەکیس دەچێ. پاش تۆ تەنیا دەکەومەوە. گوتم ئاغای زاهیدانی لە دنیای هاوڕێیەتیدا، ئەگەر ئیزن بدەی چەند شتێکت عەرز بکەم. گوتی بڵێ: گوتم یەکەم ئەوەی کە باشترین هاوڕێی مرۆڤ کتێبە. بە خوێندنەوەی کتێب هەرگیز هەست بە تەنیایی ناکەی. دووەم، هەوڵ بدە هەرچۆنێک بووە درێژە بە خوێندن بدەی. باشترین بوار بۆ جەنابت بە ڕای من کەونارانسی یان زمانی بیانییە، دەتوانی بە شێلگیری و وردە وردە لە یەکێک لەو بوارانەدا سەرکەوی. دەزانم، لە سایەی خواوە ئەو بەهرەیەشت هەیە، بەڵام تۆزێک هیممەت و خۆماندووکردنی دەوێ. هیوادارم تا دێمەوە، سەرکەوتنت بەچاو ببینم. سێیەم، ژن بێنە، چونکە ئەگەر ژنت هەبێ و مشووری ماڵ و ژیان بخۆی، ئەو قۆناغی بێسەروبەریی ژیانەش بەلاوە دەنێی. ئاگات لەو

میراتەش بێ کە پێت براوە. ماڵێکی ئەگەر بچووکیش بێ بکڕە، چونکە یەکەم مەرجی ژیانێکی ئارام، هەبوونی خانووە.

ورده ورده گەیشـــتینە تۆپخـانە. گوتم دەبێ بچین سـەرێک لە میوانخانە بدەین. هەر چووینە ژووری، لەبەر ئەوەی بەرپرسی پێشوازییەکە دەیزانی بەتەمام بڕۆم بۆ سـۆڤیەت، گوتی دوو کورد هاتوون و لەو خوێندکارانەن کە بەڕێ دەکرێن. پرسـیم لە کوێن؟ گوتی لە نهۆمی سـێیەم ژووری ۳۸، تەنیشـت ژوورەکەی خۆت. بە زاهیدانیم گوت با بچین بیانبینین. زۆر گرینگە. ئیزنمان وەرگرت و وەژوور کەوتین. دوو گەنج لەسـەر تەختی خەوەکەیان ڕاکشـابوون. هەر ئێمەیان دی هەسـتان. یەکێکیـان بەژن و بـاڵا بەرز و ئەوی دی وردیلەیەکی کورتەباڵای قژزەردی چاوشـین. بە ڕوخسـارییەوە دیار بوو زیرەکە. ئێمە خۆمان ناسـاند. باڵابەرزەکە گوتی من خەسرەو زولفەقاریم و ئەوی دیکەش گوتی ناوم مستەفا شـەڵماشـییە. هیچیانم نەدەناسـی، بەڵام لە مەهاباد بنەماڵەی شـەڵماشـیم دەناسـی. هەردووکیان گوتیان لە تەورێز ناویان نووسـیوە بۆ ئەوەی بەڕێی سـۆڤیەت بکرێن و وەرگیراون. دوێنێ پێیـان گوتوون بچنە تـاران. گوتم منیش لەو ژوورەی تەنیشـتتانم. سـبەی پێکەوە دەچینە خانەی فەرهەنگ. لەگەڵ ئاغای زاهیدانی هاتینە دەرێ. نـانی ئێوارەمـان پێکەوە خوارد. گوتم ئـاغـای زاهیدانی سـبەی نیوەڕۆیە لە میوانخانە چاوەڕێت دەبم فراوین پێکەوە بکەین. گوتی ئیزن لە بەڕێوەبەر

وەردەگرم، دوانیوەڕۆ ناچمەوە قوتابخانە. ســـبەینێ لەگەڵ هــاوســـەفەرە تــازەکــان چووینە خــانەی فەرهەنــگ و پاســـپۆرتەکانمان وەرگرت. قەرار دانرا بەر لە ســـەرعات هەشـتی سـبەی بەیانی لە شـەقامی ئەسـتەنبوڵ، سـووچی لالەزار لەبەردەم ئاژانسی سەفەری سۆڤیەت بین.

## فڕین بۆ بادکوبە

پاش وەرگرتنی پاسەپۆرتەکەمان، پێکەوە چووینە شەقامی لالەزار. من دەستێک کۆت و شەلواری نوێ و جووتێ پێڵاو و باولی و جانتایەکی دەستی و هێندێ کەلوپەلم کڕی. پێکەوە گەڕاینەوە میوانخانە. ئاغای زاهیدانییش هات. پاش نانی نیوەڕۆ، کاک جەعفەر و ئیسماعیل شافعی کە لە تارانێ دەیانخوێند، هاتنە لامان. هەموانم بۆ نانی ئێوارێ دەعوەت کرد. بەرەبەری سەعات یازدەی شەوێ بوو کە لە ڕستوڕانت هاتینە دەرێ. لە شەقامی نادری تابلۆیەکی نیۆن سەرنجی ڕاکێشاین. نووسرابوو، یاریی داولنا لەوسەری کۆڵان. هەوای تاران هێشتا خۆش بوو. گەیشتینە سەری کۆڵان، ڕستوڕانتێکم دێ، کە دەرگای حەوشەکەی کرابۆوە و مێز و کورسیی تێدا دانرابوو و خەڵکەکە خەریکی یاریی داولنا بوون. کە چووینە ژوورێ، بەڕێوەبەری یارییەکە لە حاڵێکدا گەردوونەکەی دەخولاندەوە، بە دەنگی بەرز ڕایگەیاند، دوا خولی یارییەکە دەست پێ دەکا. براوە جگە لەوەی هەرچی تا ئێستا کۆ بووەتەوە، جێ ئیستیکانێکی زیوینیش بە خەڵات وەردەگرێ. من لە ڕستوڕانتەکە هەرچی پێم بوو بۆ برادەرانم خەرج کردبوو. تەنیا پێنج قڕانم پێ مابوو، کارتێکی داولنام پێ کڕی. برادەرانیش یەکی چەند کارتێکیان کڕی. یارییەکە دەستی پێ کرد. بەڕێوەبەری یارییەکە گەردوونەکەی دەخولاندەوە و هەر جارێ گۆیەکی بچووکی ژمارەکراو لە گەردوونەکە

دەهاتە دەرێ و ئەویش بە دەنگی بەرز ژمارەی سەر گۆیەکەی دەخوێندەوە. یاریکەر بەو لۆبیایانەی لەسەر مێزەکە هەڵڕژابوون، ژمارەی کارتەکانی خۆیانیان پڕ دەکردەوە. بەڵام هێشتا دە خولەکێک لە خوێندنەوەی ژمارەکان تێنەپەڕیبوو، کە من کارەتەکەمم پڕ کردەوە و هاوارم کرد داولنا. هەموو سەریان سووڕ ما و لە هەموانیش پتر هاوڕێکانم. کارتەکەمم بردە لای بەڕێوەبەرکە و ئەویش ژمارەکانی لەگەڵ کارتەکەم بەراورد کرد و گوتی وەڵڵا ڕاستە. ٧٥ تمەن و جێ ئیستیکانێکی زیوی دامێ و گوتی پیرۆزت بێ.

من هاتمەوە و لەگەڵ هاوڕێیان لە ڕستوڕانتی داولنا هاتینە دەرێ. سەیر ئەوە بوو ڕێک ئەو دەمەی من هیچ پێویستم بە پارەی خۆمان نەبوو، بردبوومەوە. هەرچەندی حەولیان دا، یەک قرانیشم لەو پارەیە خەرج نەکرد. گوتم دەبێ حیکمەتێکی تێدا بێ.

بۆ سبەینێ پێش سەعات ٨ چووینە نووسینگەی ئاژانسی سەفەری سۆڤیەت. ئاغای زاهیدانیشم لەگەڵ بوو. بە مینی پاسێک بردیانینە فرۆکەخانەی مێهراباد. پاش دابودەستووری ئیداری و گومروک و ماڵاوایی لەو تاقە کەسەی کە بەڕێی کردبووم، یانی کاک ڕەزا زاهیدانی، لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی سۆڤیەتی سواری فرۆکە بووین. یەکەم جار بوو سواری فرۆکە دەبووم. فرۆکەکە بەسەر کۆمەڵێک شار و دەریای شینی خەزەردا فڕی و نزیک نیوەڕۆیە لە شاری بادکوبە نیشتەوە. ئێمە، شەش کەسەکە دابەزین. لە نێو پێشوازیکەرەکاندا دوو کەس لە تەنیشت یەکەوە

ڕاوەستابوو، یەکێکیان چوارشانە و بەخۆوە و ئەوی دی کورتەباڵا. لە کاتی ناساندندا دەرکەوت یەکەمیان سەرۆکی پانسیۆنەکەی ئێمە و دووەمیان جێگری بوو. سەرۆکی خەوگەکە، ئاغاری نۆریۆڤ و جێگرەکەشی ئاغای مەمەدۆف هەردووکیان ئازەربایجانی بوون. مەمەدۆف بە لەهجەی ئازەری فارسیی قسەی دەکرد.

بەو جۆرە تازە لەوێ زانیم کە ئێمە لە شاری بادکوبە دەمێنینەوە و دەخوێنین. لە حاڵێکدا ئەو ئاگاداررییەی لە تارانێ بڵاو ببۆوە، گوتبووی لە مۆسکۆیێ دەخوێنن. لەوانەشە لەبەر ئەوە شوێنی خوێندنەکەیان گۆڕیبێ، چونکە زۆربەی خوێندکارەکان ئازەربایجانی بوون. ئێمە شەش خوێندکارە میوانەکەیان بردە ژوورێک. چا و شیرینییان بۆ هێناین. سەعاتێک دواتر بە مینیبووس بردیانین بۆ نێو شاری. لە ڕێیە مەمەدۆڤ مۆدێل و بینا گرینگەکانی شاری پێ ناساندین. ئێرە پارکی کیرۆڤە و ئەوە بینای مۆزەخانەی نیزامی و ئەوەیان سینەمای سەربازییە. شەش کەسەکە برتی بووین لە: عەلەی خواجەوی خەڵکی قووچان، عەلی فێرناد خەڵکی تاران، جەوانبەخت لە ئیسفەهانەوە و من و خەسرەوی زولفەقاری و مستەفا شەڵماشییش لە مەهابادەوە.

لە شەقامەکانی شاری، شەمەندەفەر و مینیبووسی کارەبایی دەهاتن و دەچوون. ئەو شتانە بۆ ئێمە سەرنجڕاکێش بوون. چونکە هێشتا لە تاران ئەو دوو ئامرازەی ڕاگواستن نەبوو. ئیتر مینیبووسەکەی ئێمە

لەپێش بینـایەکی یەک نهۆمی ڕای گرت. مەمەدۆڤ گوتی: ئێرە خەوگەی ئێوەیە. بینـای ژمـارە ٣٦، لە شـەقـامی سـۆلنتسـیڤای باکۆ، خەوگەی ئێمە بوو. بینایەکی یەک نهۆمی چەنـد پلیکـان لە ڕووبەرەی شـەقـامەکە بەرزتر. لەوسـەری پلیکانەکانەوە بەر لە دەرگای وەژوورکەوتن، ئاوێنەیەکی بالآنوێن. نووریەف لەگەڵ کۆمەڵێک کاربەدەستی خەوگەکە لەبەر دەرگا ڕاوەسـتابوون. ئێمە وەسـەر کەوتین و سـڵاومان کرد. فەرمانبەرەکان بە تورکی وڕووسـی بەخێرهـاتنیـان کردین. نووریەف بردینی بۆ هۆڵی پانسیۆنەکە. دواتر دوو هۆدەی پانسیۆنەکەی بۆ ئەو شەش کەسـەمان تەرخان کرد. سـێ کەس لە ژوورێکدا. من و خەسـرەو و فێرنـاد کەوتینە ژوورێک. دوو ڕۆژ ئیزنیـان نەداین بێینە دەرێ. مەمەدۆڤ دەیگوت چونکە شـارەزای دۆخی شـارەکە نین، باش نییە بەتەنێ بچنە دەرێ. لەوانەیە ئێرەتـان لێ ون بێ. ڕۆژی سـێیەم هـاوڕێ مەمەدۆڤ ئاگاداری کردینەوە خۆمان بۆ چوونەدەرێ ئامادە بکەین.

مینیبووس لەبەر دەرگای پانسـیۆنەکە چاوەڕێمان بوو. لەگەڵ ئەو سـوار بووین. لەپێشـدا ئێمەیان بردە مۆزەی نیزامی. لە دەرگای وەژوورکەوتنەکەیدا پەیکەرەی نیزامیی شـاعیر دانرابوو. سـەعتێک پتر لە مۆزەخانەکەدا سـەیری ئاسـەوار و کتێبە دەسـتنووسـەکانی نیزامیمان کرد. دوای ئەوە چووینە پارکی کیرۆڤ.

پـارکێکی تـا بڵێی جوان لەسـەر گردێک کە دەیڕوانییە دەریای خەزەر. مەمەدۆڤ دەیگوت: کیرۆڤ یەکێک بووە لە خەباتگێڕانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، کە لە شەڕ لەگەڵ سوپای

قەیسەردا شەهید بووە. پەیکەرەکەی لە مەفرەقی ڕەش دروست کرابوو و دەستی ڕاستی بەرەو دەریای خەزەر ڕاداشتبوو. بۆ نیوەڕۆیە هاتینەوە پانسیۆنەکە. شەوێیش بردیانین بۆ ئۆپێرا. بە ڕاستی بینای ئۆپێراکە لە هەموو ڕوویەکەوە سەرنجڕاکێش بوو. بەتایبەتی ئەو لۆژانەی کە لە نهۆمی دووەم و سێیەم بوون. ئۆپێرای کوێرئۆغڵی بە زمانی ئازەری نمایش دەکرا. ئێمە لە یەکێک لە لۆژەکانی نهۆمی سێیەم دانیشتین. ئامفی تیاتری ئۆپێرا پڕ بوو لە خەڵک.

ئەودەمی لە تاران ئۆپێرا نەبوو. تاقە یەک تەماشاخانە لە شەقامی لالەزار هەبوو بە ناوی تیاتری جووتیار، لە حاڵێکدا هەر ئەو دەم لە باکۆ جگە لە ئۆپێرای ئازەری، ئۆپێرایەکی ڕووسی و سێرکێکی گەورە و دەیان یانە و تیاتر و یانەی سەما و گۆرانی هەبوو. جگە لە پارکی کیرۆڤ، لە هەموو گەڕەکێکیش پارک هەبوو، لە حاڵێکدا لە تاران تازە خەریک بوون مەیدانی سەنگلجیان دەکرد پارکی شاری.

حەفتەیەک دواتر، بیست خوێندکاری دیکەش لە تەورێزەوە هاتن و گەیشتنە لای ئێمە. ئەوانە چواریان خەڵکی ورمێ و ئەوانی دیکەیان خەڵکی تەورێز بوون. دوو خانمیشیان لەگەڵ بوو، کە یەکێکیان ناوی مونیر و ئەوی دی ناوی ئەکرەم بوو.

پاش تەواوبوونی ژمارەکەمان کە لەسەر یەک ٢٦ کەس بووین، ڕۆژێک پاش نیوەڕۆ سەرۆکی کۆلێژەکان

و زانکۆی باکۆ لەگەڵ میرزا برایمۆڤی وەزیری فەرهەنگی ئازەربایجانی سۆڤیەت هاتنە پانسیۆنەکەمان، بۆ ئەوەی بواری خوێندن و شوێنی کۆلێژەکانمان بۆ دەستنیشان بکەن. لەپێشدا میرزا برایمۆڤ بە کورتی باسی پێوەندییە مێژوویی و کولتوورییەکانی میللەتی ئێران و ئازەربایجانی کرد و ئینجا داوای لە خوێندکارەکان کرد هەر کام وێڕای خۆناساندن، بڵێ حەزی لە چ بوارێکی خوێندنە. خوێندکار قسەی خۆیان کرد. لە نێو ٢٦ خوێندکاردا دوو لە کوڕەکان، واتە فێرناد و مێعمارزادە بواری یاسا و دوو کوڕی دیکە، نیعمەتوڵڵاهی بواری نەوت و پەرویز بواری ئەندازیارییان هەڵبژارد. ئەوانی دی هەموو کۆلێژی پزیشکییان هەڵبژارد. میرزا برایم بە سەرسوورمانەوە پرسیی، سەرەڕای ئەو هەمووە بوارە باشەی خوێندن کە لە وڵاتەکەی ئێمەدایە، بۆچی زیاتر بواری پزیشکیتان هەڵبژاردووە، لە حاڵێکدا لە مەملەکەتی ئێمە زیاتر خانمەکان لەو بوارەدا دەخوێنن.

یەکێک لە خوێندکارەکان هەستا و گوتی، ڕاست دەفەرمووی، لە وڵاتی ئێمە دەبێ هەر وابێ. ئاخر هەموو بوارەکانی خوێندن گرینگ و بەسوودن و کۆمەڵ پێویستی بە هەموانە. بەڵام ئێمە دەچینەوە ئێران. دیارە هەر پزیشکییەکە بەکاری ئێمە دێ و سوودی بۆمان هەیە.

بۆ وێنە ئەو برادەرە کە بواری یاسای هەڵبژاردووە، بەو پێیەی یاسای ئێوە لە یاسای ئێمە جیاوازە، کە بگەڕێتەوە چ قازانجێکی بۆی دەبێ؟ یان ئاغای نیعمەتوڵڵاهی کە نەوتی هەڵبژاردووە، وەختێک کۆمپانیای نیشتمانیی نەوتی ئێران بەدەست ئینگلیزەکانەوەیە، ئاخۆ لە ئێران کاری دەست

دەکەوێ؟ میرزا برامیۆڤ قسەکانی هاوڕێ خوێندکارەکەمانی بۆ سەرۆکی کۆلێژەکان وەرگێڕا. پێیانەوە دیار بوو تێ گەیشتوون و قانع بوون. چونکە هەموو سەریان بۆ لەقاند. وا دانرا سبەی بچینە کۆلێژەکانمان و ناو بنووسین و دابەشمان بکەن. ئیتر وایان ڕێک خست لە سبەینێوە دوو مامۆستا بێنە پانسیۆنەکەمان بۆ ئەوەی فێری ڕووسی و ئازەریمان بکەن، بۆ ئەوەی ئەگەر بێکار بووین فێری ئەو دوو زمانە بین. ئینجا چونکە مانگێک لە خوێندن تێپەڕیبوو، وا دانرا لە کۆلێژەکان زێدەپۆلمان بۆ پێک بێنن. بۆ ئەوەی دەرسە دواکەوتووەکانمان بۆ قەرەبوو بکەنەوە.

## كۆلێژی پزیشكیی بادكوبه

بەبێ ئەوەی لە ئاستی خوێندن و خوێندەواریی هەر كام لە خوێندكارەكان بكۆڵنەوە یان تاقییان بكەنەوە، هەر گەیشتینێ بۆ سبەینێكەی، هەر ٢٢ كەسەكەمان لە ساڵی یەكەمی كۆلێژی پزیشكیی بادكوبەدا ملمان لە خوێندن نا. لە نێو ئێمەدا كەمیان دیپلۆمی سروشتییان هەبوو، بەڵام ئەوانی دی یان دیپلۆمی ئەدەبی و بیركارییان هەبوو، یان لە بنێڕا لە خوار دیپلۆمەوە بوون، وەكوو خۆم، كە دەرچووی پەیمانگەی مامۆستایان بووم، یان ئاغای خواجەوی كە پزیشكیاریی تەواو كردبوو.

هەڵبەت ئاگام لەوانی دی نەبوو. لەوانەیە لە ئێمەیان نزمتریش لەگەڵیان بووبێ. بۆ كۆلێژ شتەكە زۆر سادە بوو، یان خوێندكار دەیتوانی وانەی پۆلێك فێر بێ و لە تاقیكردنەوەكاندا سەركەوێ یان نەكەوێ، كۆلێژ و مامۆستاكان زۆریان گوێ لەوە نەبوو. ئەوە خوێندكار خۆی بوو كە لە هەڵبژاردنی بوار و دەرچوون و هەڵكشاندا زەرەری دەكرد. خوێندكاریش هەبوون، كە سەرەڕای ئەوەی دیپلۆمی سرووشتییان هەبوو، بەڵام حەزیان لەو بوارە نەبوو و باش دەرسیان نەدەخوێند. بەڵام من و خواجەوی زۆر شێلگیرانە دەمانخوێند و لە تاقیكارییەكانی یەكەم ساڵی كۆلێژدا سەركەوتنمان بەدەست هێنا.

ئینجا قۆناغی كۆلێژی پزیشكی لە ئازەربایجانی سۆڤیەت پێنج ساڵ بوو. ساڵی یەكەمی كۆلێژ شەشسەد خوێندكار دەیانخوێند كە كرابوونە دەستەی ٤٥ كەسی و ٣٠ كەسی.

له وانه‌ی ئه‌زمموونی و کرده‌ییدا هه‌ر تاقمه و پۆلی جیای هه‌بوو، به‌ڵام له وانه تیۆری و زانستییه‌کاندا هه‌ر شه‌شسه‌د که‌سه‌که له هۆڵ یان ڕاڕه‌وه‌که‌دا به‌سه‌ر پێوه ڕاده‌وه‌ستان. ته‌واوی وانه‌کان له بینایه‌کدا نه‌ده‌خوێنران. بۆ هه‌ر چه‌ند وانه‌یه‌ک، بینایه‌کی تایبه‌ت هه‌بوو. هه‌ر به‌و مه‌به‌سته ڕۆژانه له‌م بینایه‌وه ده‌چووینه ئه‌وی دی. دۆخی مێز و کورسیی پۆله‌کانیش زۆر باش نه‌بوو. به‌ڵام به ڕاستی مامۆستاکان له ڕووی زانستییه‌وه زۆر شاره‌زا و ئینجا زۆریش دڵسۆز و دلۆڤان بوون. له یه‌که‌م ساڵی کۆلێژدا ئه‌و مامۆستایه‌ی کیمیای پێ ده‌گوتین، پیاوێکی ئازه‌ربایجانی بوو، چه‌ندی بڵێی پیاوێکی باش بوو، که به منی ده‌گوت، گالاوی، چونکه زمانی ڕووسی پیتی "ح"ـێی تێدا نییه و له‌بری ئه‌وه یان "گ" یان "خ" به‌کار دێنن، جا ئه‌ویش به گاڵته و پێکه‌نینه‌وه به‌و ناوه بانگمی ده‌کرد.

دوانیوه‌ڕۆیانیش له پانسیۆن، خه‌ریکی فێری زمانی ڕووسی و ئازه‌ری بووین. ته‌واوی کتێبه‌کانی کۆلێژیشمان له کتێبخانه‌ی کۆلێژ به ئه‌مانه‌ت وه‌رده‌گرت، به‌ڵام ده‌بوایه کتێبه‌کان جوان و خاوێن ڕاگرین و له کۆتایی ساڵدا بیانده‌ینه‌وه کتێبخانه. مانگی دواتر یه‌کی ده‌ستێک جلوبه‌رگی تازه‌یان بۆ دوورین. نه قوماشه‌که‌ی زۆر باش بوو، نه دroomانه‌که‌ی.

هه‌موو مانگێکیش کۆلێژ، یه‌کی دووسه‌د ڕۆبڵ مووچه‌ی ده‌داینێ، که به‌و پاره‌یه ده‌چووینه سینه‌ما و تیاتر. ورده ورده فێری ئه‌لفوبێی زمانه‌که ده‌بووین و

ئیتر دەمانتوانی کتێبە دەرسییەکان بخوێنینەوە. بە ڕاستی مامۆستاکانیش زۆر دڵسۆز بوون و لە هیچ یارمەتی و دەسگرتنێک دریخییان نەدەکرد. مامۆستای وانەی ئاناتۆمیمان پرۆفیسۆر بلێکشیف بوو. پیاوێکی زۆر کورتەبالا و ناوبانگێکی خۆشیشی هەبوو. بەڵام هاوسەرەکەی سێ هێندەی خۆی دەبوو. خوێندکارە ئێرانییەکانیان کردبووە سێ دەستە و بەپێی ناوچە تێکەڵیان کردبوون. زۆربەی خوێندکارەکانیش ژن بوون. بۆ وێنە لە گرووپەکەی ئێمەدا کە بیست و پێنج کەس بووین، تەنیا شەش کەس نێرینە و ئەوانی دی هەموو مێیینە بوون.

لە پانسیۆنیش وەزعمان باش بوو. سێ جەمە خواردنمان هەبوو. ژووری خەوەکانمان، چەند ژنێکی پاکەوان جوان جوان پاکیان دەکردەوە و جێوبانەکانیان بۆ ڕێکوپێک دەکردینەوە. بەرپرسی چێشتخانەکەش خاتوونێکی هەرمەنی بوو، بەڵام لە دایک دلۆڤانتر بوو. ئامرازی هاتوچۆ بۆ کۆلێژیش شەمەندەفەرێکی کارەبا(تراموا) بوو، کە بە شەقامی بەردەم پانسیۆنەکەی ئێمەدا ڕادەبرد.

شەوانەش زۆربەی جار لە کۆلێژەکان کۆنسێرت و بالماسکێ و سەماو و گۆرانیگوتن هەبوو و ئێمەشیان بانگهێشت دەکرد. ئەگەرچی پێویستی بە بانگهێشتیش نەبوو. هەموو خوێندکارێک دەیتوانی بچێ. ئینجا ئێمە سەمای ئەورووپاییشمان نەدەزانی. مامۆستایەکیان بۆ هێنباینە پانسیۆن فێری ئەوەشمان بکا. بە جۆرێک کە پاش ماوەیەک سەمای تانگۆ و ڤالس و فۆکستێرت و ئەو شتانەش فێر

بووین. ئەوە شـتێکی ئاسـایی و باو بوو و نەزانینەکەی لەو شوێنانە عەیبە بوو.

بۆیە خوێندکاری ئافرەت لە کۆلێژەکان زۆر بوون، چونکە لەلایەکەوە دووەم جەنگی نێودەوڵەتی لەئارادا بوو و پیاو ژمارەیان زۆر کەم ببۆوە، لەلایەکی دیکەوە پیاوان زیاتر لە بوارەکانی تەکنیکیدا دەیانخوێند. بەڵام خاڵێکی سـەرنجڕاکێش ئەوە بوو، بە ڕاسـتی خەڵکی ئەو وڵاتە زۆریان حەز لە خوێندن بوو و تەقریبەن زۆرینەی خەڵک دەیانخوێند.

جا چونکە هەموو کار و پیشـەکان حکوومی بوون و چەندی کەسـەکە لە خوێندنەکەیدا سـەرکەوتووتر بوایە، دەسـکەوتی باشـتری دەبوو. هەر بۆیە ئاسـتی ڕۆشـنبیرییەکە زۆر بەرز بوو، بەو حاڵەشـەوە، دۆخی ژیـانی خەڵکیش زۆر بـاش نەبوو. هەڵبەت دۆخی مامۆسـتایانی زانکۆ و هونەرمەندان لە توێژەکانی دی باشـتر بوو. سـەرەڕای ئەوەی بە ڕواڵەت حکوومەتەکە کۆمۆنیسـتی بوو و دەبوایە تاکی کۆمەڵ وەک یەک و بە یەکسانی سوودمەند بن، بەڵام بە کردەوە وا نەبوو و لەو نێوەدا ئەوانەی ئەنـدامی حیزبی کۆمۆنیسـت بوون، ئیمتیازی کەموێنەیان هەبوو. هەر بۆیەش ئەندامەتی لە حیزبدا یان خوێندن لە پۆلەکانی حیزبیدا تایبەتی بۆ کەسـانی دەگمەن بوو. جاروبار کە دەچووینە هوتێل ئینتۆریست، تەنانەت بۆ نموونەش جارێک کەسێکی چینی کرێکار و تەنانەت لەوەش ژوورترم نەدی. هیچ پیشەیەکی

ئازاد نەبوو. هەموو پیشــــە یان کـارەکـان ڕاســـتەوخۆ لەبەردەســـتی دەوڵەتدا بوون یان لە ڕێی ســـەندیکاکانەوە بەڕێوە دەبردران. ســەرتاشـی و پینەچیەتی و بەرگدروون و فرۆشـــگاکان هەر هەموو لەژێر چاودێریی ســـەندیکادا بوون. ئەندامانی ســـەندیکاکان بەگوێرەی کارەکەی خۆیان مووچەیان وەردەگرت، کە دەچووینە سەرتاشخانە، لەپێشدا سەردانی سندووقمان دەکرد و دەیانپرسی چیمان دەوێ؟ سەرمان کورت دەکەینەوە یان ڕیش دەتاشین؟ بە گوێرەی کارەکە پارەمان لە ســـندووقەکە دەکرد و پســـوولەمان وەردەگرت و دەچووینە یەکێک لە ســـەرتاشـــخانەکان، کە کورســـیی بەتاڵی هەبوو، پســـوولەکەمان دەدایێ و ئەویش کـارەکەی بۆ دەکردین. جـاری وابوو جگە لە پســـوولەکە پارەیەکیشمان دەدایێ سەرتاشەکە. لە کافتریا و ڕستوڕانت و فرۆشـگاکانیش، بە گشـتی دۆخەکە هەر ئاوا بوو. ڕۆژانی یەکشەممە کە پشووی فەرمی بوو، بازاڕێک لە قەراغ شاری هەبوو، خەڵکی کەلوپەلی شـــەخســـیی خۆیانیان دێنا لەوێ دەیـانفرۆشـــت. بەو بـازاڕە دەگوترا کۆبینکـا. هێـندێ ژن بۆخۆیان لە ماڵەوە شـــەرابیان دروســـت دەکرد و دەیانهێنا لەو بازاڕە ڕووســـییە دەیانفرۆشـــت. ئەوانەی ماشـــێنی خۆیانیان هەبوو، شەوانە بە دزییەوە کرێیان دەکرد.

هەرچۆنێـک بێ یەکەم ســـاڵی کۆلێژی پزیشـــکی بەخێروخۆشـــی تەواو بوو. من لە هەموو دەرســـەکـان دەرچووم. نمرەی تاقیکاری ٢ و ٣ و ٤ و ٥ بوو.

نمرەی ٢ دەکەوت. ٣ دەردەچوو. ٤ باش و ٥ زۆر باش بوو. ئەوانەی لە هەموو دەرسێکدا ٥ـیان وەردەگرت، پێیان

دەگوتن ئەعلاچی و بە ڕووسی پێیان دەگوترا ئاتلی چنیک و ئەو کەسانە لە درێژایی ساڵەکەدا چل ڕۆبڵ زیاتریان لەوانی دیکە مووچە وەردەگرت.

لەگەڵ تەواوبوونی تاقیکارییەکان و هاتنی وەرزی هاوین، لە مانگی پووشپەڕێدا بردیانین بۆ پلاژەکانی دەم دەریای خەزەر لە گوندی مێردکان. مێردکان ئاو و هەواکەی لەشاری خۆشتر بوو. بینا و باڵەخانە و دەرمانگە و بنکەی تەندروستییان لە دەم دەریاکە دروست کردبوو بۆ پشوودان و ڕۆژانی حەسانەوەی ئەو کەسانەی کە دەزگای میری چاوی لێیان بوو. بەو جۆرە شوێنەشیان دەگوت کورۆت، یانی شوێنی چارەسەر بە ئاوی دەریایی و کانزایی. کۆمەڵێک گۆرانیبێژ و سەماکەر و هونەرمەندیش لە شارە جیاجیاکان و کۆمارەکانی دیکەی سۆڤیەتەوە بەتایبەتی بە شارۆی مۆسکۆوە هاتبوونە مێردکان.

هەموو شەوێ بەرنامەی سەما و گۆرانی و شانۆ تا سەعات ١٢ شەوێ بەردەوام بوو، بەڵام ڕێک سەعات ١٢ی شەو زەنگی بێدەنگی و خەو لێ دەدرا و لەو سەعاتەدا دەرگای خەوتنگەکانیان دادەخست. ڕۆژانی پشووش لە باکۆ و مەڵبەندەکانی دیکەوە بە شەمەندەفەری بچووک خەڵک دەهاتنە دەم دەریای مێردکان و هێندە قەرەباڵغ دەبوو دەرزیت هەڵاویشتبایە وەعەرزی نەدەکەوت.

وەرزش و ڕابواردن و دەریـا و گەنجیەتی، تەواوی ئەو نیعمەتـانە ئەودەم ویکڕا بۆ ئێمە دابین ببوون. وێنەی زۆر سـەرنجڕاکێشـی ئەو سـەردەمم هەن، کە گەلێ بیرەوەریی خۆش و دڵبزوێنم لێ زینـدوو دەکەنەوە. پـانزە ڕۆژی پشـــوومان لە مێردکان تێپەڕی و هاتینەوە شـــاری. بەڵام هێشـــتا چەند ڕۆژێک تێنەپەڕیبوو، کە ئاگاداریان کردینەوە خۆمان ئامادە بکەین بگەڕێینەوە ئێران و هاوینەکەی لەوێ بین. ئەو هەواڵە زۆر لە ڕۆژانی مێردکان خۆشتر بوو.

## گەڕانەوە بۆ ئێران

ئەو هەواڵە تەواوی خوێندکارەکانی لە ڕادەبەدەر دڵخۆش کرد. خوێندن لە یەکیەتیی سۆڤیەت و ئاشنابوون لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی ئەوێ، وڵاتێک کە جگە لەو خەڵکە دەگمەنەی بۆخۆیان متمانەیان پێیان هەبوو، کەسی دیکە نەیدەتوانێ بچێتە ئەوێ، شتێکی زۆر سەرنجڕاکێش و هاتنەوەش لەوێوە لەوە سەرنجڕاکێشتر بوو. بڵێی و نەڵێی گەڕانەوە بۆ نیشتمان و دیتنی بارودۆخی ناوچە پڕ لە کێشە و ڕووداوەکان و دیداری یاران و خزم و کەس، دەسکەوتێکی گەورە بوو.

دیار بوو بۆیە ئیزنی هاتنەوەیان پێ دابووین، چونکە تەواوی خوێندکارەکان یان لە کوردستانەوە هاتبوون یان ئازەربایجانی بوون و لە هەردوو ناوچەکەش حیزبە سیاسییەکان و حکوومەتەکان سەر بە سۆڤیەت و جێی متمانە بوون. هەڵبە بەو مووچە کەمەی مانگانە پێیان دەدایین، نەماندەتوانی دەست و دیاری بۆ خزم و هەڤاڵان بکڕین. بەڵام لەو ماوەیەدا من کامێرایەکم کڕیبوو. بەتەما بوو کە هاتمەوە تەورێز، بیفرۆشم و بە پوولەکەی هێندێ دیاری بۆ خوشکم و منداڵەکانی بکڕم. بە شەمەندەفەر لە باکۆوە هاتینە جوڵفا. سەفەری بەکۆمەڵ بە ڕاستی خۆشە. ڤارگۆنێکیان بۆ ئێمە تەرخان کردبوو. هەڵپەڕکێ و گۆرانی و گاڵتە و جەفەنگ تا شارە سنوورییەکەی جوڵفا خافڵاندینی. پاش هێندێ وردە دابودەستووری سەرسنوور، چووینە نێو جوڵفای ئێران. هەڵبەت جوڵفا

بە دەســت فیرقەی ئازەربایجانەوە بوو. لە جوڵفاوە دیســان بە شــەمەندەفەر بەرەو تەوریز وەڕێ کەوتین. ڕێک دەتگوت لە دنیایەکی دیکەوە هاتووینە دنیایەکی تر. لەو دنیا هەموو شــتێک بەدەســـت دەوڵەتەوە بوو، لە بنیادەمەوە بگرە تا کەلوپەلەکــان، بەڵام لـێرە بەپـێـچەوانەوە هەر دەتـگـوت دەوڵەتیش نییە. هەموو شـتێک سـەربەسـت و بەرهەڵدایە. لە وێسـتگەی تەوریز، هەر لە شــەمەندەفەر دابەزیین، کۆمەڵێک کــاربەدەســـتی حکوومەتی دیموکراتی ئــازەربــایجــان پێشوازییان لێ کردین.

ئێمە سێ کوردەکە، من و خەسرەو و ئاغای شەڵماشی و چوار کەســـی خەڵکی ورمێیان بردە گراند هۆتێلی تەوریز. ئەوانی دی خەڵکی تەوریزێ بوون. ئێمە ســـێ ڕۆژ لە تەوریزێ ماینەوە. هەموو ڕۆژێکش بەرنامەیەکمان هەبوو. ســێیەم شــەو، خوێندکارەکانیان بۆ نانی ئێوارێ بانگ کردە مەجلیســـی میللی فیرقەی دیموکرات. لەوێ ســـەرکردەکانی فیرقەمان دیتن. ســـەید جەعفەری پیشـــەوەری و بەڕێزان شەبستەریی سەرۆکی مەجلیس و غوڵام یەحیا و محەمەدی بیریای وەزیری فەرهەنگ و چەند کەســـێکی دیکەش لەوێ بوون. لە پێشـدا بەڕێز پیشـەوەری و ئینجا شـەبسـتەری بە زمانی ئازەری چەند قســەیەکیان کرد. ئینجا چووینە ســـەر ســـفرە. مێزێکی ڕازاوە و خواردنی جۆراوجۆر. لە ســـەر مێزیش هێندێ دروشم بە خۆشیی فیرقەی دیموکرات دران. کتوپڕ یەکێک لە خوێندکارە ئازەرییەکانی هاوڕێمان بە دەنگێکی بەرز و بە زمانی فارســی گوتی بژی محەمەد ڕەزا شای پالەوی، شای ئێران. دوو گەنجی دیکەش چەپڵەیان بۆ

لێ دا. هەڵبەت مەبەستی ئەو خوێندکارە و دوو کەسەکەی کە پشتیوانییان لێ کرد، ئەوە بوو، کە وەفاداریی خۆیان بۆ حکوومەتی ناوەندی دەربڕن و بڵێن فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانیان بەلاوە گرینگ نییە. بە دڵنیاییەوە ئەو کارە، بەرنامە و پیلانێکی لەپێشدا داڕێژراو و پێشبینیکراو بوو. ئەو کەسە و دوو کەسەکەی دی پێشتر خۆیان بۆ ئەو دروشمە ئامادە کردبوو. ئەو سێ کەسە دەسبەجێ لە هۆڵەکە چوونە دەرێ. کەسیش پێشی نەگرتن. ئەگەر هەڵەم نەکردبێ، سێ کەسەکە بریتی بوون لە جەلالی و مەجیدی فرووغ و مەسعوودی بێهجەت. هەموو سەریان سوور مابوو. کەس چاوەڕوانیی ئەو دروشمانەی لە مەجلیسدا نەدەکرد. وردە وردە لە سفرە کشانەوە و مەجلیس شێوا. ئێمە چووینەوە گراند هۆتێل و تا درەنگانێک هەر باسی ئەو ڕووداوەمان کرد. سبەینێ من کامێراکەمم فرۆشت و هێندە دەست و دیاریم کڕی و لەگەڵ بەڕێزان زولفەقاری و شەڵماشی بەرەو مەهاباد وەڕێ کەوتین. گۆیا ئەو سێ کەسەش کەڕەی بەیانی لە تەورێزێ وەدەر دەکەون و خۆیان دەگەیەننەوە تارانێ. ئەو کارە جا بە ئەمر کرابێ یان هەر خۆڕسک کردبێیان، بوو بە هۆی ئەوەی هەر سێکیان بەبێ هیچ ڕێوشوێنێک لە زانکۆی پزیشکیی تاران درێژە بە خوێندن بدەن. سیاسەت وەکوو یاریکردنە بە ئاگر. جارێ لەوانەیە کەسێک لە دەم ئاگرەکە چێژ لە گەرماکەی وەرگرێ و جاریش لەوانەیە پێی بسووتێ و ببێتە خەڵووز و

خۆڵەمێش. بەڵام ئەوەی سەرم لێی سوورِ ما ئەوە بوو، بۆچی فیرقە هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو.

لە میاندواوەوە ئیدی بە دیتنی پێشمەرگەی کورد، ڕواڵەتی ناوچەکەش دەگۆڕدرا. لێرە دەتگوت خەڵک بۆ پەسلان و ڕابوونەوەیەک ئامادەن. لێبڕاو و بێترس، ئەو شتەی کە لە ئازەربایجان نەمدی. بە دڵنیاییەوە دەمارگرژی نییە. ئەوەی دیتوومە ئەوە دەنووسمەوە. لەو ماوەیەدا کە لە مەهاباد بووم، نە بە ئاشکرا و نە بە نهێنییش هیچ دژایەتییەکم بەدی نەدەکرد.

مەلا مستەفا بارزانی بە داروودەستە و لایەنگرە چەکدارەکانی خۆیەوە هاتبووە گەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستان. هاتنە ڕیزی خەباتی کوردەکان دژی ڕژێمی پاشایەتی لە وەها دۆخێکدا گەورەترین لەخۆبوردوویی و فیداکاری و پێویستی بە دووربینییەکی قووڵ هەبوو. من سڵاو دەنێرم بۆ ڕۆحی ئەو مەزنە مێرە، کە لەو دۆخ و هەلە زێڕینە ڕەخساوەدا مێرانە وازی لە زێد و شوێنی خۆی هێنابوو و هەموو عێڵ و هۆز و هێزی سەربازیی خۆی خستبووە ئیختیاری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە. ئەوە وانەیەکی مەزن بوو بۆ خەڵکی کورد و کوردی نێو وڵاتەکانی دیکەش. ژیر، ئاماژەیەکی بەسە.

ئەو بیروباوەڕ و یەکگرتووییەی لە مەهابادێ دیتم، لە ئازەربایجان بەدی نەدەکرا. حکوومەتی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان سەرلەبەر جڵەوەکەی بەدەست حکوومەتی ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە بوو. لەحاڵێکدا لە کوردستان وا نەبوو.

سـێ ڕۆژ پاش گەڕانەوەم بۆ مەهاراد، جەنابی قازی محەمەد، پێشەوا و ڕێبەری حیزبی دیموکراتی کوردستان لە دەفتەری حیزب، کە شوێنی شارەوانیی ئێستا بوو، ئەمری کۆبوونەوەی کردبوو. ئێمەش لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار بووین. قازی محەمەد خۆی و سەرکردەکانی حیزب و مەلا مستەفای بارزانی لە بێلای ساختومانەکە بەرانبەر مەیدانی چوارچرا، (کە دواتر قازی هەر لەوێ لە سێدارە درا) ڕاوەستابوون. من و دوو کەس لە هاوسەفەرەکانیشم لەوێ بووین.

لەپێشدا جەنابی قازی محەمەد چووە سەر مینبەر و بەو ڕاوێژە هێمن و خۆشەی، وتەیەکی پێشکەش کرد. ئینجا داوا لە من کرا، قسە بکەم.

منیش پاش شەرحی بارودۆخی خوێندن لە سۆڤیەت و چۆنیەتیی هەڵسوکەوتی بەرپرسان و مامۆستایانی زانکۆ، هیوام خواست بتوانین زوو بگەڕێینەوە نیشتمانی خۆمان و خزمەتی هاونیشتمانە کوردەکانی خۆمان بکەین. ئینجا پێشنیارم کرد، ئەو هەلە بکەنە دەرفەتێک و کۆمەڵێک لاوی کورد بۆ خوێندن بەرێی سۆڤیەت بکەن. پاش کۆتایی کۆبوونەوەکە جەنابی قازی محەمەد لوتف و گەورەیی نواندن و بە ژەنەڕاڵ مستەفا بارزانیی ناساندین.

ئەو شتەی لەو دانیشتنەدا لێم ڕوون بۆوە ئەوە بوو، کە خەڵکی هەموو کوڕ و کۆمەڵێکی مرۆیی بڵێی و نەڵێی دەکەونە نێو باهۆزی پرسە سیاسییەکانەوە و نە

دەشــتوانن خۆی لێ لابدەن و نە لە مرۆڤیش دەوەشــێتەوە لەبەری ڕا بکــا. بەڵام بە هیوای ئەو ڕۆژەی کە هەموو کۆمەڵێک بەبێ دەمارگرژی و دوژمنایەتی ئامانج و ئاوات و ئـارەزووەکـانی یەکتر هەڵســـەنگێنن و تێیـان بگەن و ناکۆکییەکان بەبێ زوڵم و زۆر چارەسەر بکەن.

ئیدارەی شـارەکە بە مامە غەنی خوسرەویی شـارەدار و سەید پیرەی نیزامیی بەرپرسی شارەوانی ئەسپێردرابوو. لە قوتابخانەکان بە زمانی کوردی دەرسیان دەخوێند.

هەڵبەت لە تەشـکیلات و ڕێکخسـتنی حیزبدا کەمایەســی زۆر هەبوو. بەڵام چ دەکرا؟ لەبەر نەبوونی کادری لێوەشاوە و خوێندەوار، ئەویش لە دەســپێکی هەوڵێکی گەورەدا، لەوە باشتر هەڵنەدەسووڕا و نەدەکرا چاوەڕوانیی زیاتریشت لێی هەبێ. بەڵام من بـاوەڕم وابوو، مـادام داخوازییەکە هـاتۆتە گۆڕێ و کارەکە کراوە، باشـتر وایە بە پارێز و مشـوورەوە کــار بکرێ و بیر لە دواڕۆژیش بکرێتەوە. بە دڵنیـاییەوە ســـوپای ســـۆڤیەت تا هەتایە لە ئێران نامێنێتەوە. جەنگی نێودەوڵەتان تەواو بووە و ئاڵمانی نازی بەزیوە. درەنگ یان زوو هێزە بیانییەکان دەبێ لە ئێرانێ بچنە دەر. ئینجا ئەگەر دەوڵەتی تـارانیش نەیتوانیبـایە دەریـان بکـا، ئەوا هێزەکـانی ئینگلیز و ئەمریکا و دەســـتەکانیان ئەوەیان دەکرد. ئەوان بەهیچ جۆرێک ڕازی نەدەبوون سـوپای سـۆڤیەت لە ئێرانێ وەمێنێ. کەوابوو دەبوایە حیســـابی ئەو ڕۆژەش بکرێ. ئەو کەســانەی شــارەزای شــەترەنجن، دەزانن یاریزانەکە دەبێ چەنـد جـووڵەی دواتـری خـۆی و چەنـد جـووڵەیەکـی بەرانبەرەکەشـــی پێشـــبینی بکا، بۆ ئەوەی "مات" نەکرێ.

دۆڕاندن لە شەترەنجدا زۆر گرینگ نییە، بەڵام لە گۆڕەپانی سیاسەتدا زیانی گیانی و ماڵیی زۆری لێ دەکەوێتەوە.

مخابن حیزبی دیموکرات ئەوەی بیری لێ نەکردبۆوە، ئەوە بوو کە چی بکەن تا لە دوارۆژدا خەباتەکە نەدۆڕێنن. جا ئێستا بۆ ئەوەی هەودای بیرەوەرییەکانم نەپسێ، ئەو باسە بۆ دەرفەتێکی دی هەڵدەگرم.

ئاخری ڕۆژی سێی خەرمانانی ساڵی ١٣٢٥ پاش ماڵاوایی لە جەنابی قازی و سەرکردەکانی دیکەی حیزب و خزم و دۆستان، هەر سێکمان بەرەو تەورێز وەڕێ کەوتین. لە پێشدا سەردانی کونسولخانەی سۆڤیەتمان کرد. پێیان گوتیان تا خوێندکارەکانی دیکەش ئامادە دەبن، بچینە گراند هوتێل. پاش سێ ڕۆژ مانەوە لە تەورێز و کڕینی هێندێ دیاری، بە قەتار بەرەو جوڵفا کەوتینە ڕێ. چوار کەس لە خوێندکارەکان کەم ببوونەوە. سێ کەسیان ئەوانە بوون کە لە مەجلیسی میللی دروشمیان بۆ شا دا و یەکێکیشیان خاتوو مونیرە بوو. بەڵام خانمێکی تازەمان ڕەگەڵ کەوتبوو. ناوی زبێدە سەدریە بوو، خوشکی حەمە حوسێن سەدرەیە و دەسگیرانی کاک ئەمین. من پێشتر زبێدەم لە مەهاباد دیتبوو. ناوبراو ژنخوشکی بەڕێز سەریعولقەلەم بوو، کە لە ئیدارەی مەهاباد کاری دەکرد.

لە تەورێز جگە لە دەست و دیاری بۆ هاوڕێکانم، جانتایەکیشم پڕ لە خەنە پێ بوو. چونکە لە باکۆ خەنە

دەست نەدەکەوت و شتێکی بەنرخ بوو. لە جولفای سۆڤیەت بەبێ پشکنین و ڕێوشوێنی گومرکی سواری شەمەندەفەر بووین. ڕۆژی دەی خەرمانان گەیشتینە باکۆ و ڕاستەوخۆ چووینەوە نشینگەکەی جارانمان. هیچ شتێک نەگۆڕابوو. بەڕێزان نۆریەڤ و مەمەدۆڤ و کرێکارەکان هەموو لەوێ بوون. کیسەیەک خەنەم دا بە بەڕێوەبەری چێشتلێنەرەکان، کە خاتوونێکی تا بڵێی میهرەبان و دڵسۆز بوو. بۆ ئەوانی دیکەش هەر کەسە و بە گوێرەی خۆی شتێکم بردبوو.

پاش گەڕانەوە دەرکەوت، سێ کەسمان لێ زیاد بوون. یەکێکیان گەنجێکی قەڵەوەی کورتەباڵای تارانی و ئەوی دی پیاوێکی سیوپێنج ساڵەی ئازەربایجانی کە لەهجەی ڕێک وەکوو باکۆییەکان وابوو. سێیەمیشیان مێرمنداڵێکی تا بڵێی جوان و ژیکەڵە.

من گەنجی ئەوەندە جوانم بە قەلافەتی شەرقی و ئەورووپی نەدیتبوو. ناوبراو کوڕی سەرلەشکر جەهانبانی بوو. وەکوو ڕووسییەکان زمانی ڕووسیی دەزانی. دەیانگوت دایکی ڕووسی بووە. قەول وابوو ناوبراو لە بەشی نەوت بخوێنێ. هەر جارێکیش لەگەڵمان دەهاتە کۆڕ و کۆمەڵان، هەموو کچە جوانەکان وەکوو پەپوولە لە دەوری دەگەڕان و دەیانویست لەگەڵی ئاشنا بن. سەعدی خوای لێخۆش بێ، لە بارەی جوانییەوە فەرموویەتی: "تۆزە جوانییەکت هەبێ هەزار سامانی بەقوربان بێ و ڕوخساری جوان مەرهەمی دڵی بریندار و کلیلی دەرگا داخراوەکانە.

## هاتنی حەمەحوسێن خانی سەیفی قازی

## بۆ باکۆ

کاتێک چووینەوە خەوگەکەمان، دەتگوت هاتووینەوە ماڵی خۆمان. هەموو شتێکی لە سەرڕاوە. هێشتا چەند ڕۆژێکی هاوین و دەرفەتی چوونە سینەما و تیاتر مابوو، چونکە لەگەڵ دەسپێکردنەوەی دەرس، ئیتر دەرفەتمان بۆ ئەو جۆرە شتانە نەدەما.

هەرچۆنێک بێ هاوین کۆتایی هات و خوێندن دەستی پێ کردەوە. ئەو بێدەنگییەی بەسەر بینا و باڵەخانەکانی کۆلێژدا زاڵ ببوو، شکا. لە قۆناغی دووی کۆلێژی پزیشکی بووم، بڕیارم دابوو ئەمساڵ لە پار باشتر و شێلگیرانەتر بخوێنم. شانس تاقە جارێک لە دەرگات دەدا، دەبێ ئەم هەلە بقۆزمەوە. بەڵام کەس ئاگای لە گەمەی چارەنووس نییە.

کۆتاییەکانی ڕەزبەر بوو، ڕۆژێکیان لە کۆلێژەوە دەگەڕامەوە پانسیۆنەکەمان. لەبەر دەرگا، دەرکەوانەکە کە پیرەپیاوێکی چاویلکەلەچاوی ڕووس بوو، گوتی ئاغای نووریەف کاری پێتە. پێش ئەوەی بچمەوە ژوورەکەی خۆم، چوومە نووسینگەی ناوبراو/. گوتی باش بوو هاتی. نانی نیوەڕۆت خواردووە؟ گوتم نەخێر. گوتی کەوابوو بڕۆ خێرا نانەکەت بخۆ و بە ماشێنەکەی من بچووە هوتێل ئینتوریست. پرسیم چ باسە لەوێ؟

گوتی، یەکێ لە مەزنانی کورد هاتووە و لەوێیە، بە تەلەفۆن ئاگاداریان کردمەوە بچیتە لای.

بە پەلەپەل نانی نیوەڕۆم خوارد و بە ماشـــێنی هاوڕێ نووریەف چوومە هوتێل ئینتۆریســـت، وەپێشـــم کەوتن بۆ هۆدەی ژمـــارە ١٢٠. ئیزنم وەرگرت و وەژوور کەوتم. ژەنەڕاڵ حەمەحوسێن خانی سەیفی قازی لەوێ بوو. سڵاوم کرد. لەبەرم هەستا، بەو بەژن و باڵا چوارشانە و ڕوخسارە گەشـــەیەوە لە ئامێزی گرتم. بەخێرهاتنم کرد. پرســـیم کەی تەشـــریفتان هێناوە؟ فەرمووی ئەمڕۆ بەیانی. لە زەنگی دا. گارسۆنێک هاتە ژوورێ. پێی گوتم پێی بڵێم چا بێنێ. هوتێل ئینتۆریســـــت دەیڕوانییە دەریـای خەزەر. دیمەنێکی زۆر تـایبەتی هەبوو. ئەو هوتێلە جاران تـایبەتی خەڵکی بیانی و پایەبەرزەکان بوو. تاقە هوتێلی شـاری بادکوبە بوو. پرسـیم ئەی بۆچی زووتر تەشـــریفت نەهێنا بۆ ئەوەی ســـوودێکی زیـاتر لە مەلەی دەریـا وەرگری؟ فەرمووی دەرفەت نەبوو. ئێســـتاش بۆ چارەســـەر هاتووم. زۆر قەڵەو بووم، دەڵێن ئارترۆزمە. بەتایبەتی لاقم زۆر دێشێن. لە تەورێزێ چوومە خەســـتەخانەی ســۆڤیەت. ئەوان بەڕێی ئێرەیان کردم. قەول وایە بچمە کیلاڤدۆســـکی، شـــوێنی گەڕاوان. جارێ چەند ڕۆژێـک لە بـادکوبە دەبم. گوتم قوربـان، هـاوڕێیـانیش بە دیتنت دڵخۆش دەبن. گوتی، نا جارێ هەر خۆت لەگەڵم بە، دوایی ئەوانیش دەبینم. دوو ڕۆژ نەچوومەوە پانســـیۆن و کۆلێژیش. شەو و ڕۆژ لەگەڵی بووم. هەموو ئەو شوێنانەی شـــاری کە شـــیاوی دیتن بوون، وەکوو ئۆپێرا و تیاتر و ســـێرک و تەنانەت پارکەکانی نێو شـــار و مۆزەخانە و

کۆلێژەکان، پێشـــانم دا. فراوین و شـــیویشـــمان پێکەوە لە ڕســــــتورانتە خۆش و جوانەکەی هوتێلەکە دەخوارد. خواردنەکـانیـان زۆر خۆش بوو. بەتـایبەتی تـاوەکەبـاب. شـــــەوانە ئۆرکێســــــترایەکی بچووکیش لە ڕســــــتوڕانتی هوتێلەکە مۆسـیقای لێ دەدا. سـێیەم ڕۆژ لەگەڵی چوومە فڕۆکەخانە. بەڕێزیان بەرەو کیلاڤدۆسکی ڕۆیشت. بەڵام ئەوە دوادیدارمان بوو. ئەو ماڵاوایی تاهەتایی کرد و من ئیتر نەمـدیتەوە. بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێ، مرۆڤێکی چەندە خاکەڕا و دڵپاک بوو.

زۆر خێرا، دوو ڕۆژ دواکەوتنەکەی خۆمم تێ هەڵێناوە. ڕووداوێکی دیکە کە لە پاییزی ئەوێ ساڵێدا ڕووی دا، هاتنی کۆمەڵێک گەنجی کورد و ئازەربایجانی بوو، کە بۆ ڕاهێنانی ســـەربازی هێنابوویاننە باکۆ. لەگەڵ زولفەقاری و شەڵماشی چوومە سەردانی هاوشارییەکانی خۆمان لە ســــەربازگەی باکۆ. هەموویان ئاشـــــنا و هاوپۆلییەکانی جارانمان بوون. جگە لە دوو کەســــیان. بەڕێزان ســــەید عەبـدولعەزیزی گەیلانیزادەی کوڕی حـاجی ســـــەیـد عەبـدوڵڵا ئەفەنـدی و ڕەحیمی ســــــەیفی قـازیی کوڕی خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات و برای حەمەحوسێن خانی ســــــەیفی قازی. هەردووکیان لە حیزبی دیموکراتدا پلەی سەروانی و یۆنیفۆرمی سەربازیی حیزبیان پێ درابوو.

بیســـتبووم ســـەید عەبدولعەزیز ئەفســـەری ســـوپای عێراق بووە، هەر بۆیەش پلەی ســـەروانییەکەی ئەو جێی ســـەرســـووڕمان نەبوو، بەڵام نەمدەزانی بەڕێز ڕەحیمی

سـەیفی قازی ئەو پلەیەی چۆن وەرگرتووە. دیارە بنەمای هەموو ڕێکخراوێک لەسـەر ئەو شـتانە هەڵدەچنرێ. هەرچۆنێک بێ، بەپێی ئەو ڕووداوانەی دواتر ڕوویـان دا، مشتومڕ لەسـەر ئەو شـتانە بێفایدە بوو. جگە لەوەش، ئەوە شـتێک نەبوو، کەسـانێک بە ناچار کۆمەڵێک پۆسـتیان داگیر کرد، کە جێی سەرسووڕمان بوو. ڕووداوێکی دی کە ئەوێ سـاڵێ ڕووی دا، هەموو ئەو شـتانەی تێکەوە پێچا و لەگەڵ خۆی ڕای دان.

## ڕووداوەکەی ٢١ سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٥

قەوامولسەلتەنەی سەرۆکوەزیرانی ئەو کاتی ئێران، بەو مانۆڕە سیاسییەی بەکاری هێنا، واتە دانی گفت و بەڵێنی هەڵێنجانی نەوتی شیمال بە سۆڤیەت، دەراوی بۆ چوونەدەرەوەی سوپای سۆڤیەت لە ئێران خۆش کرد. ئەگەرچی ئەو سوپایە لەبەر ئەوەی جەنگ کۆتایی پێ هاتبوو و بەپێی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان هەر دەبوو لە ئێران بچێتە دەرێ، بەڵام فرتوفێڵی قەوام بوو بە هۆی ئەوەی تەواوی نەخشەکانی سۆڤیەت لە ئێراندا پووچەڵ ببنەوە. بە شێوەیەک کە سۆڤیەت تەنانەت دەرفەتی ئەوەشی بۆ نەڕەخسا کە پشتیوانی لە حیزبەکانی سەر بەخۆی بکات و ئەو حیزب و ڕێکخراوانەش بەسەردا کەوتن و نەک نەیانتوانی لەسەر پێی خۆیان بوەستن، بگرە مانەوە و بەرگریکردنەکەیان پێچەوانەی سیاسەتی سۆڤیەت بوو.

هەر بۆیەش، ئەگەرچی بەرگەی هێزی دەوڵەتی ناوەندییان هەر نەدەگرت، بەڵام دەبوو زۆر خێرا مەیدانەکە چۆل بکەن و بە ڕای من لەوەدا ئەمریشیان پێ کرابوو. بۆیەش لەگەڵ چوونەدەرەوەی سەربازانی سۆڤیەت لە ئێران، سوپای ئێران بە هەموو هێزەوە بەرەو ئازەربایجان داگەڕا و لە ٢١ی سەرماوەزدا ڕێکخراوی کاتیی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لێک بلاو بوو.

هێزەکانی حوکمەت ئازەربایجانیان گرت. سەرکردەکانی فیرقە لەگەڵ کۆمەڵێک بە ڕواڵەت فیدایی میللەت بەرەو ڕووگەکەی خۆیان تێیان تەقاند. ڕووگەیەک نەک بۆ ئەوان نەبووە پەناگە، بگرە چارەڕەشیشی کردن. زۆری نەخایاند، میر جەعفەری پیشەوەری بە ڕووداوێکی دروستکراوی ترۆمبێل کوژرا. گوتیان بەشکم لە لەناوچوونی دامەزرێنەری فیرقە، ئاوێک بە ئاگردا بکرێ و، دەوڵەتی سۆڤیەت بتوانێ ئیمتیازی هەڵێنجانی نەوتی شیمال وەرگرێ. جا سەیر ئەوەیە ئەو سەرکردە ڕاکردووانە کە نەیانتوانیبوو لە ئێران شتێک بکەن، لە خاکی سۆڤیەتدا نووسینگەیەکیان کردەوە، بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی کۆمەڵێک دیموکراتی ڕاکردووی بێ خانە و لان بگرنە ئەستۆ و بە بە ناو، درێژە بە خەباتەکەیان بدەن.

بەڵام دۆخەکە لە کوردستان تەواو جیاواز بوو لەگەڵ ئازەربایجان. سەرکردەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان هەر هەموویان و لەسەرووی هەموویانەوە، مەزنە پیاوی مێژوو قازی محەمەد نەک ڕایان نەکرد، بگرە خۆشیان کردە بەلاگێڕی میللەتەکەیان. ئەی سڵاوت لێ بێ ئەی حەماسەخوڵقێن و نموونەی بوێری و مێرایەتی. قازی محەمەد و سەدرولئیسلام، ئەو مرۆڤە دڵودەروونپاکە و حەمەحوسێن خانی مایەی شانازییان لە مەیدانی چوارچرا لە سێدارە دا. ئەوانی دیکەشیان لە بەندیخانە توند کردن. ئێوە ڕۆیشتن، بەڵام تا کورد و کوردستان ماوە و تا لە دنیادا ناوی جوامێری و مێرایەتی بمێنێ، ناوی ئێوەش بەنەمری و زیندوویی دەمێنێ. ئینجا حەماسەی مەردازایی

مەلامستەفا بارزانی و هاوڕێیانی چیرۆکێکە، زۆر مەزنتر لە حەماسە. لێگەڕێ با خەڵکی دیکە بێن و وانەی نەتەوەپەرستی لەو پیاوە ناودار و ئازایانەوە فێر بن. لەگەڵ کۆمەڵێک ژن و منداڵ و لاو و پیر بە چەکوچۆڵێکی سادەوە و بە پێیان و جلوبەرگێکی شڕەوە، چیا و کوێستانەکانیان بڕی و بە نێو سێ سوپای گەورەی سێ وڵاتی ئێران و تورکیە و عێراقدا، شتێکە لە سەرووی حەماسەوە.

هەژار لە کوێی، ئەو جوامێرییانەت بۆ ئێمە نەنووسیەوە و بۆت نەهۆندینەوە. حەیفێک و هەزار مخابن، ئەی خۆزگە مەلا مستەفا ڕووی لە سۆڤیەت نەکردبایە. ئەی خۆزگە پەنای بردبایەتەوە بەر مێشە و دارستان و ئەشکەوتەکان. ڕووداوەکەی ٢١ی سەرماوەزی ساڵی ٢٥، ڕۆژی تاقیکاری بوو بۆ ئەوانەی خۆیان بە نەتەوەپەرست و داشدیاری میللەت دەزانی. ڕاکردووەکانی فیرقەی ئازەربایجانیان لە گوندەکانی دەوروبەری باکۆدا نیشتەجێ کرد. دەوڵەتی سۆڤیەت، لەو کاتەدا کە جەنگی جیهانی تەواو ببوو، زۆری پێویست بە کرێکاری حەساوە هەبوو، نەشیدەزانی ئەوانە قەت دەستیان لە ڕەش و سپی نەداوە، لە تەڕی خواردوویانە و لە وشکی بۆی خەوتوون. ئەوانە ئەهلی ڕەزم نەبوون، بەڵکو ئەهلی بەزم و ڕێکخراوبازی بوون.

هاتنی ئەوانە بۆ باکۆ، دۆخەکەی لە ئێمەش شێواند. ئیتر ئێمەی خوێندکار و ئەو گەنجانەش کە لە فێرگەکانی

سەربازی بوون، قەدر و قیمەتمان نەما. بەتایبەتی ئەو گەنجانە ئیتر خوێندنی سەربازییان بۆچی بوو؟ هەر پێویست نەبوو. گەنجە کوردەکانی سەربازگە بە سەرپەرشتیی بەڕێز غەنی بلووریان بەتەمابوون بگەڕێنەوە ئێران. هەوڵەکانی دەوڵەتی ئازەربایجانی سۆڤیەت بۆ پەژیوانکردنەوەیان بێسوود بوو. ئاخری جگە لە شەش کەسیان، هەموویان گەڕێنرانەوە ئێران. سێ کەسە، بەڕێزان حیسامی و گەرمیانی و سەید کەریمی ئەیوبی بوون، کە ئامادە نەبوون لەگەڵ ئەوانی دیکە بگەڕێنەوە ئێران، بەڵام نەمانزانی بۆچی دوور خرانەوە؟ لەبەر ئەوەی بەڕێز قازی و سەید عەبدولعەزیز مەترسیی گیران و دادگاییکردنیان لەسەر بوو، نەگەڕێنرانەوە ئێران و لەگەڵ بەڕێز گەلاوێژ هێنایاننە پانسیۆنەکەی ئێمە. من زۆرم پێ خۆش بوو ئەو چەند کوردەیان هێنا، بەتایبەتی کە بوونی سەید عەبدولعەزیز بۆ من نیعمەتێکی گەورە بوو. زۆر جار پێکەوە دەچووینە گەڕان و پێکەوە بووین، ئەگەرچی ئەو نزیکایەتی و هاوڕێیەتیە دواتر بۆ من نرخی زۆر بوو.

هێشتا بەهار دانەهاتبوو و بەفری کوێستانان نەتوابۆوە، کە بیستم مەلا مستەفا و عێلی بارزان گەیشتوونەتە سۆڤیەت.

پێشوازییەکی گەرموگوڕیان لێ کرا، هەموویانیان لە کالخۆز و کارگە و کێڵگەکاندا وەبەر کار نا. تەنانەت ژنەکانیشیان بێکار نەکرد. ڕەحیمی سەیفی قازی بە یارمەتیی غوڵام یەحیا هەرچۆنێک بوو لە قوتابخانەی حیزبی جێی خۆی کردەوە و لە مووچە و دەرەتانە باشەکان

خۆی پشـکدار کرد و ورده ورده حەزی ســەرکردایەتیی کوردە ئاوارە و دەربەدەرەکان و ئێمەی خوێندکاری کە ئیتر کەس ڕووی نەدەداینێ، کەوتە ســــەر. هەبوونی ژەنەڕاڵ بارزانی لەو کارەدا بۆ وی کۆســـپێکی گەورە بوو. ئینجا بەینیشی لەگەڵ سەید عەبدولعەزیز خۆش نەبوو.

لەو نێوەدا بەڕێزان حیســـــامی و ســــەید کەریم و گەرمانیشـــیان هێنایە پانســـیۆنەکەی ئێمە. وەکی ســـەید کەریم دەیگێڕاوە، ئەوەندەیان نامە بۆ ســــتالین و بێریا نووســــی و لەبەری پـاڕانەوە، تـا لە دوورخراوەیی هێنایاننەوە و هێنایاننە لای ئێمە.

ورده ورده سەرپەرشتیاریی ئێمەی نێو پانسیۆنەکەیان کە نۆ کەس بووین، بە ڕەحیماغا ئەســــپارد. ئەو بوو بە دەمڕاســــتمان. هەڵبەت بۆ ئێمە فەرقێکی نەبوو، ئینجا خۆ ئەو لە ئازەربایجانییەک هەر باشـــتر بوو، بڵێی و نەڵێی کورد بوو، لەوانە بوو هەســـتێکیشـــی هەبێ، بەڵام چونکە دایکی ئازەری بوو، زیاتر لەگەڵ ئەوان بوو تا ئێمە. ئیتر ئەودەم ڕەحیماغا گەنجێکی ســـادە بوو و ئەگەر کارێکی چەوتیشـــی کردبایە، ئەوە لە بن ســـەری غولام یەحیا و ئەوانی دیکەدا بوو، کە ئاخری چزووەکەی خۆشـــیان لە کوردە ڕاســـتگۆ و دڵســـۆزەکان وەشـــاند و پێوەیان دان. دواتر باسی دەکەم. لەبیرم نەبوو باسی ئەوەش بکەم، کە ئەو دەمی ئەو لاوە کوردانە هێنران بۆ فێرگەی سەربازی، بەڕێز ســـولتانی وەتەمیشـــیشـــیان لەگەڵ بوو. بەڵام ئەو نەچووە سەربازگە، بەڵکوو هێنایانە پانسیۆنەکەی ئێمە و

بەوەوە بووینە دە کەس. هەڵبەت لەو هاوڕێیانە، تەنیا ئەو سێ کەسەمان من و زولفەقاری و شەڵماشی، پاسپۆرتمان هەبوو. ئەوانی دیکە چونکە لەلایەن حیزبی دیموکراتەوە نێردرابوونە بادکوبە، پاسپۆرتیان نەبوو. ئینجا ئێمە خوێندکاری پزیشکی بووین، ئەوانی دی یان لە دواناوەندی دەیانخوێند، یان لەبەر بێ بڕوانامەیی، لە پۆلی خوارەوە بوون. ئەی خۆزگە بەهرە و توانای ئەوەشیان هەبوایە فەلسەفەی ماتریالیسی و وانەکانی مارکس و ئینگلس و لینین فێر بن، نەک دەرسی پاشقولدان.

هەرچۆنێک بێ، بەهاری ١٣٢٦ تێپەڕی و ساڵی خوێندنیش تەواو بوو. بەپێی بەرنامەی ساڵی ڕابردوو، بردیانین بۆ مێردکانی دەم دەریا. من نێوانم لەگەڵ ڕەحیم زۆر خۆش کردبوو، ئەویش زیاتر حەزی لێ بوو لەگەڵ من بێ. چونکە ئەو دوانەمان ئەو کاتی لە ورمێ دەمانخوێند یەکترمان دەناسی و هاموشۆمان هەبوو و گەلێ جاران لە مزڵەکەی وی مابوومەوە و نانم خواردبوو. بەڵام نازانم بۆچی کتوپڕ لەگەڵ تەواوبوونی هاوین و دەسپێکردنەوەی خوێندن، لاپەڕەکە هەڵگەڕایەوە. ئیتر ڕەحیماغا تەواو ساردوسڕ بوو، تەنانەت لە پانسیۆنیش بە دەگمەن دەمدی. هەر جارێکیش دەمپرسی ئەرێ ڕەحیم لە کوێیە، دەیانگوت لای غولام یەحیایە. هەر جارێکی لەگەڵ سەید عەبدولعەزیزیشی باسی ئەو مەسەلەیەم دەکرد، دەیگوت اللهم محافز. وردە وردە باسی ئەوە داکەوت کە بارزانییان لە ئازەربایجانەوە بردووەتە شوێنێکی دی. کەس نەیدەزانی بەڕاستی چ باسە.

## ناردنەوەمان بۆ ئێران

سێیەمساڵی کۆلێژی پزیشکیم دەخوێند. وانەکانی ئەو ساڵە زۆر خۆش بوون. لەگەڵ بەڕێز خواجەوی لەو سەعاتانەدا کە دەرسیشمان نەبوو، دەچووینە خەستەخانەی سماشکا و سەیری نەشتەرگەرییەکانمان دەکرد و لە ڕاستیدا فێر دەبووین. بێ ئەوەی نیگەرانی گەمەی ڕۆژگار و نامەردیی ئادەمیزاد بم، شێلگیرانە خەریکی فێربوونی دەرس بووم. جا تازە کچێکی ڕووسی هاوپۆلیی خۆمم ناسیبوو، کە لەبەشی زمانی ڕووسیدا دەیخوێند. هاموشۆی ماڵیان و ناسینی دایک و باوکی، ئەوەندەی دیکە خوێندنەکەیان لەبەر شیرین کردبووم. مانگی خەزەڵوەر بوو، ڕۆژێکیان دوانیوەڕۆ لە کۆلێژەوە دەهاتمەوە پانسیۆن، هەواڵیان هێنا، گوتیان ئاغای قازی گوتوویەتی ئەمڕۆ سەعات ٥ لە ژوورەکەی وی کۆ دەبینەوە. دەی باشە، ئەو لە قوتابخانەی حیزب دەیخوێند و دەبوو لە ئێستاوە کۆڕ و کۆبوونەوە سیاسییەکان ڕێک بخات. سەعات بوو بە پێنج و ئێمە هەموو لە ژوورەکەی وی کۆ بووینەوە.

ئێمە، ئەو کەسانە بووین: سەید عەبدولعەزیز، گەلاوێژ، زولفەقاری، شەڵماشی، حیسامی، گەرمیانی، ئەیوبی، وەتەمیشی، حەلەوی و ڕەحیمی قازی.

ئاغای قازی کە لە ڕاستیدا بەرپرس و پێکهێنەری کۆبوونەوەکە بوو، گوتی: برادەرینە، ئەرکی ئێمەی کورد کە ئێستا لە وڵاتی سۆڤیەتین، درێژەدانی خەباتە. ئێمە

نابێ بهێڵین ئەو ئاڵایەی شەهیدەکانمان هەڵیانکردبوو، بکەوێتە عەرزی. بەڵام لەم بارودۆخەدا کە ئێمە لە زێد و نیشتمانمان دوورین، یەکەم هەوڵێکی کە دەتوانین بیدەین، دەرکردنی ڕۆژنامەیەکە بە زمانی کوردی. ئیمتیازی ئەو ڕۆژنامەیەش بۆخۆم وەرمگرتووە. دەبێ بە یارمەتیی یەکتر دەری بکەین. کەس نەیگوت نا، هەڵبەت بۆ ناگوتنیش نەدەبوو، ئەگەرچی تەنانەت یەک کەسیشمان خوێندەواریی کوردیمان نەبوو و توانای نووسین و ئامادەکردنی وتارمان نەبوو.

ئاواش هەموومان ڕازی بووین، دیار بوو پێشنیارەکەی ئاغای قازی بە دەنگی هەموان پەسند کرا. ئینجا ڕووی لەو سێ کەسەمان کرد "من و زولفەقاری و شەڵماشی"، گوتی برادەرینە ئێوە دەبێ پاسپۆرتەکانتان بدڕێنن، بۆ ئەوەی وەک ئێمە بن. ئێمە هەر چاوەڕێی پێشنیارێکی ئاوا نەبووین. ئاغای زولفەقاری گوتی ئەرێ دەکرێ بفەرمووی بۆچی؟ ئینجا ئەو پێشنیارە، قسەی خۆتە یان سەرکردەکانی سۆڤیەت ئەمرێکی وایان دەر کردووە؟ گوتی فەرقی نییە. من گوتم ئەو پێشنیارە سادە نییە، پێویستی بە باس و بەڵگاندنە. ئێمە دەبێ بزانین بۆچی دەبێ وا بکەین؟ ئێمە لە یەکەم ڕۆژەوە دەوڵەت سۆڤیەت بۆ خوێندن هێناوینی بۆ ئێرە و پاسپۆرتەکانیش بۆخۆی بۆی دابین کردووین. پێت وانییە دڕاندنی پاسپۆرتەکەمان بە مانای ئەوە بێ کە بڕیارمان داوە نەچینەوە ئێران؟ دیارە نە دەوڵەتی سۆڤیەت لە ئەوەڵەوە وەها چاوەڕوانییەکی لە ئێمە هەبووە، نە ئێمەش بەو مەبەستە هاتووینە ئێرە. جگە لەوەش، سۆڤیەت خۆی چ

پێویستییەکی بە ئێمەیە کە لێرە بین؟ نە پێویستیان بە کادری پزیشکییە، نە ئێمەش ئەوەندە بلیمەتین. ئەگەر مەبەستیشت ئەوەیە ئێمە لەگەڵت کار بکەین، دەی ئەوە قبووڵمان کرد، کەوابوو ئەم پاسپۆرتانەی ئێمە ئەگەر سوودێکیان نەبێ، زیانێکیان هەر نابێ.

لەبری ئەوەی ئاغای قازی وەڵامێکی قایلکەرمان بداتەوە یان جۆرێک شتەکەمان بۆ ڕوون بکاتەوە، گوتی، هەر ئەوەیە کە پێم گوتن، ئیتر کەیفی خۆتانە. ئیدی هەستا و کۆبوونەوەکە کۆتایی هات. سێ چوار ڕۆژێکی پێوە چوو. لەو ماوەیەدا من ئاغای قازیم لە پانسیۆنەکە نەدی و دەمویست بەتایبەتی لێی بپرسم مەسەلە چییە و ئەو پێشنیارەی بۆچی دا؟ بەڵام هەر نەمدۆزییەوە. تەنانەت شەوانەش نەدەهاتەوە پانسیۆنەکە. ڕۆژی چوارەم بوون لە خواردنگەکە بەرچاییمان دەخوارد. نووریەف هات و گوتی هەمووتان لە هۆڵی کۆبوونەوەکان کۆ بنەوە. لە کاتی بەرچاییدا هەموو لە یەکتریان دەپرچی، چی بووە؟ چ باسە؟ بەڵام کەس نەیدەزانی. لە هۆڵەکە کۆ بووینەوە، هەڵبەت جگە لە ئاغای قازی و چەند کەسێکی دی. نووریەف لە نووسینگەکەی هاتە دەرێ. کاغەزێکی بەدەستەوە بوو. نێوچاوان گرژ. گوتی ئەوانەی ناویان دەخوێندمەوە، ئێران داوای کردوونەتەوە بیاننێرینەوە. حکوومەتیش بە ناچاری ڕازی بووە. کەوابوو دەمودەست کەلوپەلەکانیان کۆ بکەنەوە و ئامادە بن. ناوبراو ناوی چوار کەس لەو قوتابییە ئازەرییانەی خوێندەوە کە

خانەی فەرهەنگی سۆڤیەت هێنابوونی بۆ بادکوبە و هەموو پاسپۆرتیان پێ بوو، لەگەڵ ناوی من و خەسرەوی زولفەقاری. هەموو متەقیان لێ بڕابوو. کەس ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو. ڕووداوێکی تا بڵێی ناخۆش بوو و ئێمەش پێی حەبەسابووین. کەس زمانی نەدەگەڕا. نووریەف چۆوە ژوورەکەی. تۆ بڵێی دەوڵەتی ئێران داوای کردبێتەوە؟ باشە بۆچی؟ ئەی ئاغای قازی بۆچی ون بووە؟ نەکا ئەو لەگەڵ غولام یەحیای مەلعوون ئەو نەخشەیەی داڕشتبێ. جگە لە ئاغای شەڵماشی کە سەر بە توودە و دووان لە ئازەربایجانییەکان، تاقمەکەی ئێمە کەسی نەمایەوە. تازە ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ، کە ئەگەر بە ڕاستی دەوڵەتی ئێران داوای ئێمەی کردبێتەوە، باشە بۆچی ئەو چەند کەسەشمان لەگەڵ نین؟ بە دڵنیاییەوە ئاغای قازی ئاگادار بوو، بۆیە پێی گوتین پاسپۆرتەکانتان بدڕێنن. دەی باشە ئەگەر وایە، بۆچی بە ئاشکرا پێی نەگوتین. دەنگی ماشێنێک هات، کە لەبەر دەم پانسیۆنەکە ڕای گرت. کرێکارانی پانسیۆنەکە بە سەرسوورمانەوە لەبەر دەرگای چوونە دەرەوە کۆ ببوونەوە. دەتگوت ڕاوەستاون سەیری گوللەبارانکردنی کۆمەڵێک بێتاوان دەکەن، ئاوا سەیریان دەکردین. تەنانەت دەرفەتی ماڵاواییکردنیشمان لە هاوشارییەکانی دیکەمان نەبوو. سەید کەریم و حیسامی و گەرمیانی و گەلاوێژیش دیار نەبوون. لەو نێوەدا هەر سەید عەبدولعەزیز بوو کە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بەڕێی کردین.

ڕاوچیی دڵڕەق هێلانەیان لێ تێک دابووین. بە دڵێکی شکاو و پڕ لە خەمەوە سواری ئۆتوبووس بووین. مۆری

بێـدەنگی لە زاری ئێمە و دەوروبەرییەکـانمـان درابوو. بردیانینە وێستگەدەریایەکی بادکوبە و سواری پاپۆڕێکیان کردین کە لەوێ ڕاوەستابوو. کە دوایین کەسمان سوار بوو، پـاپۆڕەکە هۆڕنێکی درێژی لێ دا و وەڕێ کەوت. ئێمە مـاینەوە و پـاپۆڕێک و دەریـای شـــین و بێبن و ئاســمانی شــین. دەتگوت خەون دەبنم. بڕوام نەدەکرد. دەمدی هەرچی ئاوات و ئارەزوومە بووەتە بڵقی ســـەر ئـاو. ئـاخر چۆن شـــتی وا دەبێ؟ ئەی بەرهەمی ئەو هەمووە زەحمەت و خوێندنە؟ باشـە دەکرێ ئاوا سـووک و ئاسان گاڵتە بە چارەنووسی مرۆڤێک بکرێ؟

مەگەر دەوڵەتی سـۆڤیەت بە ویســت و حەزی خۆی نەیبردینە وڵاتەکەی؟ تۆ بڵێی من هەڵەیەکم کردبێ؟ یاســایەکم شـکاندبێ یان تووشـــی خیانەتێک بووبێم؟ چ شـــتێک بووە هۆی ئەو بێبەزەیی و زوڵم و جەورە؟ ئاغا خواجەوی هاتە لام، وەک بارێزە فرمێسکی هەڵدەوەراندن. ناحەقی نەبوو. خۆ ئەو نە کورد بوو و نە ئازەربایجانی. دەســـتی لە کاروکاســـبی بەردابوو و دوو ســـاڵ ونیوی تەمەنی خۆی دانابوو. بەو فکر و خەیاڵانەوە و بەو گیانە ماندووەمەوە کە لە ماوەی چەند ســـەعاتاندا وەکوو بەڵایەکی لابەلا بەســەرمدا هات، خەوم لێ کەوت و قووڵ خەوتم. لە خەونمدا پاپۆڕەکەمان خەریک بوو وەردەگەڕا و من کەوتوومەتە نێو دەریاکەوە. کتوپڕ دەسـتێک پرچی گرتم و فرێی دامە بەستێنەکە.

بە ترسەوە ڕاپەڕیم. ڕاست بوو، پاپۆڕەکەمان گەیشتبووە بەستێنی بەندەرئەنزەلی. دایانبەزاندین. باڵندە بەسەرمانەوە دەفڕین و لوور دەبوون و خۆیان بە ئاوەکەدا دەکێشا و نێچیری خۆیان دەڕفاند و دوور دەکەوتنەوە. ئەوەندە دوور کە ئیتر دەبوونە خاڵێک و نەدەبینران.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت دڵنیام ئەگەر ئاغای قازی پێی گوتباین، بێت و پاسپۆرتەکانمان نەدڕێنین دەماننێرنەوە بۆ ئێران، لانیکەم لەبەر خوێندنەکەشم بوایە، بەدڵنیاییەوە پاسپۆرتەکەمم دەدڕاند.

# لەسەر خاکی ئێران

دواتر چەندی هەوڵم دا و لێم کۆڵییەوە و چەندین سەعاتان بیرم لەوە کردبایەتەوە، ئاخری نەمزانی مەسەلەی ئەو پاسپۆرتە چی بوو؟ کێ و چ بەرپرسێک ئەو ئەمرەی کردبێ؟ بۆچی؟ بەڵام هەر کەس ئەوەی داڕشتبێ، لەوپەڕی بێئاوەزی و بێ سیاسەتیدا کردبووی. ڕێک وەک ئەوەیە، یەکێک منداڵێک گەورە بکا، زەحمەتێکی زۆری بۆ بکێشێ و خەرجێکی زۆری بۆ بکا و دوایی بەبێ هیچ تاوانێک و لەخۆوە، لە بیابانێکدا بەرەڵڵای بکا و بڕوا. هەرچۆنێک بێ، ئەگەر ئەو بڕیارە بڕیاری دەوڵەتی سۆڤیەتیش بووبێ، چونکە من لە زمانی ئاغای ڕەحیمی قازییەوە بیستم، دڵنیام ناوبراو لە بنج و بناوانی ئەو بابەتەدا بووە و دەشیتوانی پێم بڵێ و پێی نەگوتم. ئاواش قەت لێم بە دڵ نەگرت و لێم ڕوون بوو لەم دنیایەدا هەر کەسە و بیر لە خۆی و بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکاتەوە و زۆر کەس لە سۆنگەی ئەو شتانەوە پێش دەکەون و بە پۆست و پلەوپایە دەگەن. دەمزانی خەڵکی سادە و ڕاستگۆ و بێ فرتوفێڵ قەت شانس ناهێنن. من قەت ڕقم لە ئاغای ڕەحیمی قازی هەڵنەگرت، چونکە پاش ڕووداوەکانی شۆڕشی ئێرانیش کە هاتەوە مەهاباد، چوومە سەردانی و تەنانەت بۆ پرسێکی یاسایی و خێزانی پەنای بۆ هێنام و چیم پێ کرا بۆم کرد. هەڵبەت لە شوێنی خۆی دەگەڕێمەوە سەر ئەو باسە.

لەســـەر نـامەردی و کـاڵوکرچیی دەوڵەتی یەکیەتیی سـۆڤیەت هەر ئەوەندە بەسـە، کە ئەو فیرقەی ئازەربایجانی دامەزراند و گەورەی کرد و تـا ئەو جێیەی هێنـا، کە چیی نەمـابوو لە ئێرانی جوێ بکـاتەوە. کتوپڕ ئەویش، لەبەر خاتری بەرژەوەندیی ئیمپریالیسـتی، پشـتی لەو فیرقەیە کرد و دیتمان چیی بەسەر هات.

ئیتر گەیشـتینە بەندەرئەنزەلی. کاربەدەسـتانی گومروک بەوپەڕی مـیهرەبـانییەوە پێشـــوازییـان لێ کردین. نەماندەزانی چی بکەین. ئاخۆ هەر کەسە و ئازادە ملی ڕێ بگرێ و بڕوا یـان دەبێ هەر پێکەوە بین؟ دیـارە دەبوو پێکەوە بین و پەرشـــوبڵاو نەبین. چونکە ئێمە کۆمەڵێک خوێنـدکـار بووین و دەبوو هەوڵێـک بـدرێ، تـا درێژە بە خوێندنەکەمان بدەین. ئێمە خۆ گەشـتیار و تاجر نەبووین، کە بڵێی پاش سەفەرەکەمان هەر کەسە و بەلایەکدا بڕۆین. جگە لەوەش خۆ ئێمە هیچ کـامـمـان پـارەی ئێرانمـان پێ نەبوو. ناچار یەکێک لە هاوڕێکانمان چووە لای سـەرۆکی گومرک و پێی گوت داخوا دەبێ چی بکەین؟ ئەویش گوتبووی دەبێ چـاوەڕێ بکەن. ئێمە پێوەنـدیمـان بە پارێزگارییەوە کردووە. قەول وایە وەڵام بدەنەوە. نیوەڕۆ داهات و هەر لە بەندەرەکە نانی نیوەڕۆیان داینێ. دەتگوت پەنابەرین و پەنامان بردووەتە بەر وڵاتێکی دی. دوانیوەڕۆ ئۆتوبووســـێک لەبەر دەرگـای نووســـینگەی ئیدارەی بەندەرەکە ڕای گرت. کاربەدەســتێکی پارێزگای ڕەشـــت هاتبوو. سواریان کردین و لەوێوە یەکسەر بەڕێی تارانیان کردینەوە. خەرجی ڕێ و کرێی پاسـەکەشـیان دا. شـەوێ

بەڕێگەوە بووین، کاتێک گەیشتینە تاران، تەواو ڕووناکی کردبۆوە. ئیدارە تازە دەکرانەوە. ئوتوبووسەکە لەبەردەم وەزارەتی دەرەوە لە شەقامی سێی ئیسفەند ڕای گرت. داوامان لە شۆفێرەکە کرد چەند ساتێک ڕاوەستێ. دوو کەس، بەڕێزان میعمارزادە و سەدرییەمان وەکوو نوێنەر ناردە وەزارەتی دەرەوە. نیو سەعاتێکیان پێ چوو، هاتنەوە. کاربەدەستێکیشیان لەگەڵ بوو. کابرا بە شۆفێرەکەی گوت بڕوا لە پێش هوتێل گەیلانی نوێ بەرانبەر شەقامی سێی ئیسفەند لە شەقامی فێردەوسی ڕایگرێ.

ئەو کاربەدەستەی لە وەزارەتی دەرەوەڕا لەگەڵمان هاتبوو، هاتە نێو هوتێلەکە و بە بەڕێوەبەرەکەی گوت ئەو برادەرانە میوانی وەزارەتی دەرەوەن و تا ئاگادارتان دەکەینەوە، خەرجی مانەوە و خواردنیان لەسەر وەزارەتخانەیە. پێم وایە کاربەدەستەکە، یەکێک بوو لە فەرمانبەرانی بەشی دابودەستووری وەزارەتخانە و بەڕێوەبەری هوتێلەکە دەیناسی. دوو دوو و سێ سێ لە ژوورێکیان دانان. میعمارزادە گوتی: وەزارەتی دەرەوە قبووڵی کردووە خەرجی پازدە ڕۆژی ئێمە بدا و لەو ماوەیەشدا کاروباری درێژەدان بەخوێندنەکەمان جێبەجێ بکرێ. هەڵبەت ئەو بەڵێنە زۆر هیوابەخش بوو و خەم و پەژارەی سەر دڵمانی ڕەواندەوە.

قسەکانی نووریەفم بیر کەوتنەوە کە دەیگوت دەوڵەتی ئێران داوای کردووە بتانئێرینەوە، بەو جۆرە و بەپێی

ئەو هەڵسوکەوتەی تا ئێستا لەگەڵمان کراوە، دیار بوو ڕاستی دەکرد.

دەکرا هەر واش بێ، چونکە دەوڵەتی ئێران، تا ڕادەیەک لە تەواوی ئەو ئێرانییانە ناڕازی و نیگەران بوو کە لە ئازەربایجانی سۆڤیەت بوون، جا ئێستا کە نەیدەتوانی بە فەرمی داوای ڕاکردووەکان بکاتەوە، داوای ئێمەی کردبۆوە کە پاسپۆرتمان هەبوو و دەوڵەتی سۆڤیەتیش ناچار بووە داوا بەجێ و ڕێیەکەی لێ قبووڵ بکا. ئەگەرچی دەوڵەتی ناوبراو دەیتوانی بە ڕاشکاوی بابەتەکەمان لەگەڵ باس بکا، بۆ ئەوەی ئەگەر حەزمان لە گەڕانەوە نەبێ، بەرپرسانی سەرووتر ئاگادار بکاتەوە. هەرچۆنێک بوو کارەکە کرابوو، تەنیا ئاواتمان دەخواست وا نەبێ زیانێک بە خوێندنەکەمان بگەیەنێ. من بۆ سبەینێکەی هەستام چوومە وەزارەتی فەرهەنگ. وەختێک دۆسییەکەی منیان لە بەشی کارگێڕی هێنا، لەسەری نووسرابوو بەهۆی بەجێهێشتنی شوێنی خزمەتەکەم، پیشەکەم لێ وەرگیراوەتەوە. ئەودەمی زانیم بەڕێوەبەری قوتابخانەی مەولەوی چ نامەردییەکی گەورەی لەگەڵ کردووم. جا هەر بۆیەش چوومە وەزارەتی فەرهەنگ، کوتم ئەگەر بە هەر هۆیەک کۆلێژ وەرینەگرتینەوە، بتوانم بچمەوە سەر خزمەتەکەم و هەر نەبێ سەرچاوەی داهاتێکم هەبێ و ئەگەر کێشەیەکیش نەهاتە پێش و توانیم لە کۆلێژی پزیشکی درێژە بە خوێندنەکەم بدەمەوە، دیسان سەعاتەکانی کاری مامۆستایەتی و وانەکانی کۆلێژم پێکەوە ڕێک بخەمەوە. بەڵام ئەو بڕیاری

لێ وەرگرتنەوەی پیشە بەهۆی بەجێهێشتنی شوێنی کار، گرفتارییەک بوو، کە کاتێکی زۆری دەویست تا پێیان هەڵوەشێنمەوە. ئێمە ٢٦ خوێندکار، تووشی چارەنووسێکی سەیر ببووین. هەڵبەت لەو نێوەدا هیچیان بارودۆخیان وەک من نەبوو. هەر کام کەسوکار و خزمێکیان هەبوو و دەیانتوانی لانیکەم بۆ ماوەیەکیش بێ یارمەتییەکیان لێ وەرگرن. بەڵام من کەسم نەبوو هانای بۆ ببەم. هەموو ڕۆژێ سەردانی وەزارەتی دەرەوەم دەکرد. دە ڕۆژ تێپەڕی و هیچ باس نەبوو، تا کاربەدەستێکیان کە بنیادەمێکی دڵسۆز دیار بوو، ڕاستگۆیانە گوتی برادەرینە هیچ چاوەڕوانی کەسێکی دەوڵەت مەبن. چونکە پێیان وایە دەوڵەتی سۆڤیەت بە ئانقەست ئێوەی ناردووەتەوە تا بچنەوە نێو کۆلێژەکان و کاریگەریتان لەسەر قوتابییەکان هەبێ و پیلانێک بگێڕن. ئەی هاوار، خۆ لە هەر دوو دینەکە بووین. لە ڕۆژنامەکانیشدا بابەتی جۆراوجۆر لەسەر چەند خوێندکارێک لەوانەی لەگەڵ ئێمە بوون نووسرابوو، کە بەڵێ ئەندامی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانن و تەنانەت تاوانیشیان کردووە. ڕۆژ بە ڕۆژ کارەکەمان خراپتر دەبوو. ترس دایگرتبووم. نەکا مەسەلەی کۆمەڵەی ژێکافیش لەسەر من ساغ بکەنەوە و لە ڕێگەی ڕیشدا سمێڵیش دانێم. خوا هاوار، ئەو دنیایە چیی لێ هاتووە، لەوێ پێیان گوتین ئێران داوای کردوونەوە، لێرەش دەڵێن سۆڤیەت بە ئانقەست

ئێوەی ناردووەتەوە. وەک بڵێی ئێمە لەو ماوەیەدا هەر وانەی مارکسیزم و لینینیزممان خوێندبێ. مەگەر لە بادکوبە کونسولگەریی ئێرانی لێ نەبووە؟ دەی ئەوە چ مانایەکی هەیە؟

پانزە ڕۆژەکە تێپەڕی. بە فەرمی لە وەزارەتی دەرەوەڕا پێیان ڕاگەیاندین، کە لەم ڕێکەوتەوە خەرجی هوتێلەکە لە ئەستۆی خۆمانە. هەر ئەو ڕۆژە وێکڕا هەستاین چووینە مەجلیس. ئەوێ ڕۆژێ نوێنەرەکان کۆبوونەوەیان هەبوو. چووینە نێو حەوشەی مەجلیسی شوورای میللی لە مەیدانی بەهارستان. پاش کۆتایی کۆبوونەوەی مەجلیس قسەمان لەگەڵ نوێنەرانی ئازەربایجان و کوردستان و حیزبی توودە کرد. هەموان بەڵێنی هاوکارییان دا، بەڵام ئێمە بڕیارمان دا لە مەجلیس نەیەینە دەرێ، لەوێ پەنامان گرت. چووینە نێو یەکێک لە هۆدەکانی نهۆمی یەکەم، کە دەیڕوانییە شەقام. حەفتەیەکی ڕێک لەوێ ماینەوە. لە دەرەوەی مەجلیسەوە خواردنێکی باشیشیان بۆ دێنان. مەئموورینی ئینتزامی(ئاسایش)ی مەجلیس زۆر بە ڕوویەکی خۆشەوە لەگەڵمان ڕەفتاریان دەکرد.

## بڕیارێکی مەترسیدار

حەوشەکەی مەجلیس تا بڵێی بەرین و خۆش بوو. لەو یەک حەفتەیەدا پاش بیر و ڕاوێژێکی زۆر، هەر چوار کەسمان، من و زولفەقاری و سەدری و شەهریاری ساغ بووینەوە، ئەگەر هیچ ئاکامێکمان وەرنەگرت، بە قاچاغ بگەڕێینەوە سۆڤیەت. بەڵام بۆ ئەو کارەش پێویستمان بە پارە بوو. ئاغای ســــەدریە گوتی من حەواڵەیەکم لە ورمێوە بۆ هاتووە، دەچم لە بانک وەردەگرم. نوێنەرانی مەجلیس بە بەڵێن و قســـەی خۆش لە مەجلیس دەریانکردین. چاریش نەبوو. ئاغای زولفەقاری چووە ماڵی پووری کە لە تاران دەژیان. ئەو سێ کەسەشمان چووینەوە هوتێل گیلانی نوێ، بەڵام دامانننا دوو ڕۆژ دواتر سەفەرە پڕ مەترسییەکە بگرینە بەر.

بەڕێز ســــەدرییە هەســــتا چووە بانک و پارە حەواڵەکراوەکەی وەرگرت. ئەو دەستی باش دەڕۆیشت. باوکی لە ورمێ دەرمانخانەی هەبوو. دوو ڕۆژ لە هوتێل ماینەوە. لەو ماوەیەدا ئاغای ســــەدرییە توانیی یەکێک بدۆزێتەوە کە ئەویش یەکێکی لە "گونبەد" پێ ناساندبووین بۆ ئەوەی ڕێگەمان پێشـــان بدا. ڕۆژێک پێش ئەوەی ئەو چوار کەســـــەمان وەڕێ بکەوین، باوکی خەســــرەو زولفەقاری هاتە تاران، بۆیە خەســــرەو نەیتوانی لەو سەفەرە سەرچڵییەدا لەگەڵمان بێ.

سێ کەسی، بۆ سبەینێ بەرەو بەندەر شا و لەوێوە بەرەو گورگان وەڕێ کەوتین و لەوێشـــەوە چووینە

گونبەد. شەوێ لە میوانخانەیەکماینەوە. بۆ سبەینێ محەمەد حوسێن، ئەو پینەچییەی دۆزییەوە وا لە تاران پێیان ناساندبووین. باسەکەی لەگەڵ هێنا گۆڕێ و ئەویش بە سێ هەزار تمەن قبووڵی کرد یەکێکمان ڕەگەڵ بخا و بمانپەڕێنێتەوە ئەودیو. زیاتر لە چوار سەعات ڕێگەمان بڕی. حەفتەیەکی مابوو بۆ جێژنی نەورۆز. هەوا هێشتا سارد بوو. بەڵام بەفر نەمابوو، تا چاو هەتەری دەکرد دەشت و چۆلەوانی و بێدەنگییەکی مەرگهێن و پڕ لە دڵەخورپە بەسەرماندا زاڵ بوو. ڕێنوێنەکەشمان قسەی نەدەکرد. جاروبار بە چەند قسەیەکی بێسەروبەر وەڵامی پرسیارەکانمانی دەداوە. شەکەت و ماندوو، شەلاڵی ئارەقە بووین. ئاخری لە دوورەوە ڕەشماڵێکمان لە چەقی ئەو چۆلەوانییەدا بەرچاو کەوت. ڕێنوێنییەکە گوتی، گەیشتینێ، ئەمشەو دەبێ لێرە پشوو بدەین. چەند سەگ بۆمان هاتن، بەڵام تورکمانێکی باڵابەرزی ڕیشدرێژ تێیان خوڕی. سەیەکان دوور کەوتنەوە. ڕێنوێنەکەمان چووە لای، دیار بوو یەکتریان دەناسی. بە تورکمانی کەوتنە قسەکردن پێکەوە. باڵابەرزەکە خوڵقی کردین بۆ نێو ڕەشماڵەکە. چەند سەر ئەسپ و بزن و مەڕ لەولاوە دەلەوەڕین. چەند منداڵێکی پێخواسیش لەگەڵ مریشکەکان خەریک بوون و ڕاویان دەنان. لە نێو ڕەشماڵەکەدا دوو ژنی یەکی تۆزێک بەساڵداچوو و یەکی گەنج دانیشتبوون تەشییان دەڕست. لبادێکی گەوریان ڕاخستبوو. بێشکەی منداڵ و نوێنوبان و شمەکی دیکەشی تێدا بوو. ژنەکان دەسبەجێ هەستان چایان وەسەر نا. سێ کووپ چای تۆخیان لەپێش داناین،

کە لەبەر تـاڵـیـیـان نەدەخـوراوە. حـاجـی قـوربـانـی خانەخوێمان باسی عەرشی و قورشی لەگەڵ کردین.

بەتـایبەتی لە کەمیی خۆراک و مەڕ و خوری. کـاتی شیو هات. خانمەکان قازانێکی گەورەیان لەسەر کوچکاور دانا، بۆ ئەوەی چێشـــتی نیوەڕۆیە گەرم بکەنەوە. ئینجا سـفرەیان لە نێو ڕەشـماڵەکەدا ڕاخسـت و لالەیەکیشـیان داگیرســـاند. چونکە خەریک بوو تاریک دادەهات و دوو کوڕیژگە و کچۆڵەیەک و دوو خانم و ئەو سێ کەسەمان و ڕێنوێن و خانەخوێ هەموو لە ســـفرەیەکی پڕ لە نانی تازە کۆ ببووینەوە. سفرەکە کەوڵ بوو.

خانمەکان دوو دەفری مســـیی گەورەشـــیان هێنا، یەکێکیان لە پێش ئێمە پیاوەکان و ئەوی دیکەیان لە پێش خۆیان و منداڵەکان دانا. خواردنی ئەو شـــەوە گۆشـــتاو بوو. دەفرە مسـینەکەی پێش ئێمەیان پڕ کرد لە گۆشـتاو. خانەخوێش هێندێ وردکەنانی تێ کوشـی. کەوچ و شـت لەگۆڕێ نەبوو. هەر کەسە و بە لەتێک نان، پارووەکی لە نێو قاپە مســـینەکە هەڵدەگرت و دەیخوارد. ســـەرەڕای ئەوەی هیچ ڕێوشوێنێکی پاکوخاوێنی و تەندروستیی تێدا ڕەچاو نەکرابوو، بەڵام چونکە برســـی بووین، ئەوەندە خۆش و بەتام بوو، هەر نەبێتەوە. ئینجا چا تۆخەکەشمان بەســـەردا کرد. بۆ کاروباری ئاودەســـتیش دەمانتوانی بچینە دەرەوەی ڕەشـــماڵەکە. جا محەمەد حوســـێن کە دەیویسـت بچێتە دەرێ، سـەیەکان پێی وەڕین و نەیوێرا. تا خانەخوێ ئێسک و پاشماوەی خواردنەکەی بۆ بردن،

ئینجا کوڕیژگەیەکی لەگەڵ محەمەد حوسێن ناردە دەرێ. سەعات ٩ نەببوو، گوتیان با بخەوین. ئێمەش پێمان خۆش بوو، چونکە بە ڕاستی ماندوو ببووین. ڕێیەکی زۆرمان بڕیبوو. منداڵ لە گۆشەیەکی خێوەتەکە و خانم و خانەخوێ لەتەنیشت یەکتر و ئەو چوارەشمان بەبێ ئەوەی جلەکانمان داکەنین، بە دوو بەتانی کە خانەخوێ پێی دابووین، لە تەنیشت یەکتر ڕاکشاین. بەڵام بەر لەوەی بخەوم، بە محەمەد حوسێنم گوت خۆزگە هەر ئەمشەو ڕۆیشتباین. مەگەر دەکرێ بە ڕۆژی ڕوو ناک سنوور ببەزێنین؟ گوتی نازانم لەوانەیە وایان پێ باش بێ. ئیتر باشتر وایە ئێستا بخەوین، شەکەتین، بزانین سبەی چۆن دەبێ.

دەمودەست خەوتین. دەمێک بوو ئاوا نەنوستبووم. بەیانی بە حەپەی سەگەل و دەنگی منداڵان بەخەبەر هاتین. یەکەم شتێکی هەستم کرد، ئەوە بوو ڕێنوێنەکە دیار نەبوو. هەستاین هاتینە دەرەوەی خێوەتەکە. هەوایەکی ساماڵ و فێنک. خانەخوێ لە دەرەوە ڕاوەستابوو. گوتمان کوا ڕێنوێنەکەمان؟ گوتی بەیانی زوو ڕۆیشت. هەموو شتێکی بە من گوت. نان و چا بخۆین دەڕۆین. سەرمان سووڕ ما. ئێمە پێمان وابوو خانەخوێیەکەمان، یانی حاجی قوربان بەڕێمان دەکا. چووینە سەر کانییەک لەو نزیکانە و دەموچاومان شوشت. تۆزێک هاتینەوە سەرخۆ. هێندێ خۆمان خاوکێش کرد. ئینجا خانەخوێ بردینییەوە ڕەشماڵ بۆ بەرچایی، کە نان و پەنیر بوو. ئەی لەو خەڵکە سادە و بێ پێچ و پەنا و میواندارە. نان و کەرەی تازە و پەنیری مەڕ. بە حەز و

حەژمەتەوە خواردمان. دەستخۆشیمان لە خانمەکان کرد و پووڵمان بە منداڵەکانیش دا. خانەخوێ دوو ئەسپی هێنا. خۆی و محەمەد حوسێن سواری ئەسپێک بوون و من و شەهریارییش سواری ئەسپەکەی دیکە و وەدوویان کەوتین. نازانم ئەسپی داماوی بەستەزمان چۆن ئەو دوو کەسەی دەتوانی، کە یەکێکیان قەڵەو و ئەوی دیکە باڵابەرز بوو.

دیمەنێکی سەرنجڕاکێش بوو. لەو چۆلەوانییەدا تا چاو هەتەری دەکرد ئاوەدانیی تێدا نەبوو. باشە بۆ کوێ دەچین؟

هێندێ لەو فیلمانەم بیر کەوتنەوە کە لە تاران دیتبوومن. ئێمە ڕێک لەو کەسانە دەچووین کە بەشوێن زێڕدا دەگەڕێن. محەمەد حوسێن لە حاجی قوربانی پرسی، باشە ئێستا ئێمە بۆ کوێ دەچین؟ ئەویش گوتی زۆرمان نەماوە. محەمەد حوسێن خەریک بوو وردە وردە وەقسەی دێنا. لێی پرسی، سنووری سۆڤیەت کوێیە و چۆن دەمانپەڕێنییەوە؟ حاجی قوربان سەری لەو پرسیارە سووڕ ما و جۆرێک ئاوڕی لە ئێمە داوە، چیی نەمابوو بەر بیتەوە. گوتی، ئەوە دەڵێن چی؟ ئەمن وا دەتانبەم مەڕتان بۆ بکڕم. مەگەر ئێوە بازرگان نین و نەهاتوون مەڕ بکڕن؟ محەمەد حوسێن دەسبەجێ زانیی ڕێنوێنەکە خەڵەتاندووینی و کڵاوی لەسەر حاجی قوربانیش ناوە. هەر بۆیە بەیانی بەر لەوەی ئێمە هەستین، ئەو تێی تەقاندبوو. محەمەد حوسێن گوتی ئێمە

هاتووین مەڕ بکڕین، هەر وا پرسیم. ئەرێ باشە پێت نەگوتین ئەو شوێنەی دەچین دوورە یان نزیک؟ گوتی سەعاتەڕێیەکە. محەمەد حوسێن ئاماژەیەکی پێ داین، تێی گەیشتین کە دەبێ زوو خۆمان لەو گێچەڵە قوتار بکەین. سەرمان دابووی لە بەرد. محەمەد حوسێن هێندێ قسەی لەگەڵ حاجی قوربان کرد و ئینجا ڕووی لە ئێمە کرد و گوتی، ئەرێ ئێوە جزدانی پووڵەکەتان هێناوە؟ گوتمان نەخێر. گوتی، ئەی ئەگەر وایە بۆچی لەخۆوە ڕێیەکەمان دوور بکەینەوە. دەبێ بچینەوە شاری و پووڵ بێنین. ئەگینا خۆ ناتوانین مەڕ بکڕین. حاجی قوربان سوور هەڵگەڕا. خەریک بوو دەهری دەبوو، کە محەمەد حوسێن دەرفەتی نەدا، دەستی لە گیرفانی نا و دووسەد تمەنی داین و گوتی زۆرمان زەحمەت دای، دەبێ بمانبووری.ماڵت ئاوەدان بێ بۆ میوانداریيەکەشت. ئێمە دەچینەوە شاری و بە گیرفانی پڕەوە دێینەوە لات. حاجی قوربان بە دیتنی پووڵەکە هێور بۆوە، ئەگەرچی بڕواشی نەدەکرد، بەڵام خۆ زەرەری نەکردبوو. گوتی کەیفی خۆتانە، هەر کات هاتنەوە لە خزمەتتاندام. پووڵەکەی خستە نێو گیرفانی فشوفۆڵی عابا تورکمانییەکەی و هەوساری ئەسپەکەی دیکەی لێ وەرگرتین و بەکوێدا هاتبوو گەڕاوە. ئێمەش بە پێیان وەڕێ کەوتین. کاتێک حاجی قوربانمان لێ ون بوو، لەو چەقی چۆلەوانییەدا دانیشتین.

ئەو ڕووداوە هەم دراما بوو هەم کۆمێدیا. ئێستا نەماندەزانی دەبێ چی بکەین و بەرەو کام لا بڕۆین. داخوا زۆر لە سنوور دوورین یان کەم. ئینجا زۆریش نیگەران

بووین، نەکـا ڕێنوێن و پینەچییەکە ڕێـک کەوتبێن کە ئاشـــکرامان بکەن. هەم پارەیەکیان لە ئێمە وەرگرتووە و هەمیش خزمەتێک بە ژاندارمەکان بکەن. محەمەد حوسێن گوتـی، چـونکە بەبـێ ڕێـنوێـن پەڕینـەوە بـۆ ئەوبەر مەترســـیدارە، باشـــتر وایە جارێ بگەڕێینەوە شـــارێ. بەوپەڕی بێهیوایی و ســـــەرکزی و تێشـــــکاوی بەرەو ڕۆژئاوا وەڕێ کەوتین. لە دوورەوە ســـوار و شـــوانێک دەرکەوتن، بەڵام هەر ئەو تارماییانە مایەی ترس بوون. چونکە ئێمە کەسانێکی ئاسایی نەبووین، ئێمە دۆخەکەمان زۆر لە خەڵکی دی ناســـکتر بوو. بە دڵنیاییەوە ئەگەر تێ کەوتباین، زۆر شـتی دیکە دەهاتە گۆڕێ، کە ئیتر ئاســان نەبوو لێیان دەرباز بین. ئاخری گەیشتینە سەر جادەیەکی خۆڵ. دیـار نەبوو ئەو جـادەیە لەکوێوە دەچێتە کوێ. سەعاتێکی ڕێک لە دەم جادەکە دانیشتین. چارمان نەبوو. تـا لە دوورەوە تەپوتۆزێک هەســــتا. ســــەیرمـان کرد کـامیۆنێک بەرەولامـان دێ. هـاتینە نێوەنـدی جـادەکە و دەســـتمان هەڵێنا. ناچار بوو ڕایگرێ. کامیۆنەکە ڕایگرت. چووینە پێشـــی و بە ئەدەبەوە پرســـیمان دەچێتە کوێ؟ گوتی دەچمە گورگـان. داوامـان لێ کرد، کرێمـان لێ وەرگرێ و ئێمەش ببا. قبووڵی کرد. ئاغای ســـــەدرییە لە پێشـــەوە و ئێمەش لە دواوە ســـوار بووین. ســـەرەڕای ئەوەی لە تۆز و خۆڵی ڕێیەکە بێبەش نەبووین، بەڵام ڕازی بووین، چونکە ڕزگاری دەکردین. هەڵبەت من ڕازی نەبووم بچینەوە تاران، بەڵام ناچار بووم بە قســەی دوو

هاوسەفەرەکەم بکەم. ئینجا هیچ پارەشم پێ نەبوو. هیچ بەلا و نەگبەتییەک لە نەداری گەورەتر نییە. دەڵێن بنیادەمی بێ پارە ئیمانیشی نییە.

بەرەبەری ئێواری گەیشتینە گورگان. دابەزین. لە برسان خەریک بوو قڕمان بێ. محەمەد حوســێن باقی پوولەکەی ژمارد. شــتێکی وای پێ نەمابوو. گوتی با لەپێشــدا بچینە میوانخانەیەک، چونکە لەوانەیە پێشــەکی کرێیەکەمان لێ وەرگرن، دوایی ئەگەر شــتێک مایەوە، نانێکیش دەخۆیان. چووین. ژوورێکیان داینێ شــەوێ بە شــەش تمەن. محەمەد حوسێن پێی دا و دە تمەنی پێ مابوو. چووینە کەبابخانەیەک و سێ نەفەر کەبابمان داوا کرد. بە حەوت تمەن هەم تێرمان خوارد و هەم جێی خەومان هەبوو. کەوتینە پیاســەکردن ئاخۆ چی بکەین و چی نەکەین؟ ســەدرییە گوتی جارێ دەچینەوە تاران بزانین چ باسە. ئینجا دیسان داوای پارە لە بابم دەکەمەوە. ئەمجارەیان ڕێی ئازەربایجان تاقی دەکەینەوە. شەو بوو. چرای شەقام و دووکان داییسان. لە نێو ڕســتوڕانتەکە خەڵکێکی زۆر دانیشــتبوون نانیان دەخوارد. کتوپڕ محەمەد حوســێن گوتی، دۆزیمەوە. ئیتر وەژوور کەوت. ئێمە لە دەرەوە ڕاوەستاین.

تاوێک دواتر هاتە دەرێ و گوتی، کابرایەکی لای خۆمان بوو. سێ تمەنم لێ قەرز کرد. پێی دەگەینەوە تاران. چووینەوە میوانخانە و زوو خەوتین. بەیانی بە جریوەی باڵندان لە خەو هەســتام و چوومە بەر پەنجەرەکە. باغێکی جوان و دڵڕوونکەرەوەم دی. دار گەڵا و گوڵی دابوو. بۆنی بەهار دەهات. بەهار بە هەموو جوانییەکانییەوە بەڕێوە بوو.

هاورێیانم بەخەبەر هێنا و پەنجەرەکەم کردەوە. جریوەی خۆشــــی باڵندە ڕۆحی دەلاواندەوە. ئای چەندە شـــاد و ســەرخۆشــن ئەو باڵندانە، نە خەمێکیان هەیە و نە ئاواتێک. دەموچاومان شــوشــت و چووین بەرچاییەکی ســادەمان خوارد و بە ئوتوبووس بەرەو بەندەری شـــا و لەوێوە بە شەمەندەفەر بەرەو تاران وەڕێ کەوتین.

# پەڕینەوە لە سنوور

کە لە شەمەندەفەر دابەزیین و لە وێستگەی شەمەندەفەر هاتینە دەرێ، پێم گوتم من دەچمەوە مەهاباد و سەرێک لە خزم و کەسان هەڵدێنم و دێمەوە. ماڵاواییم لێ کردن و بەرەو حەسەناباد و گەراجی "ئیتمینان" وەڕێ کەوتم. لەپێشدا لە دووکانێکی سەعاتفرۆشیان سەعاتەکەمم بە پەنجا تمەن فرۆشت. بەتەما نەبووم بچمەوە مەهاباد. لە گەراج سواری ئوتوبووسێک بووم کە بەرەو ڕەشت دەچوو. لە ڕێیە نانی نیوەڕۆم خوارد. سەعات دووی دوانیوەڕۆ بوو، کە گەیشتمە ڕەشت. کە لە گەراج دەهاتمە دەرێ، تووشی سیاوەشی نیعمەتوڵلاهی بووم، کە خوێندکاری موهەندیسیی نەوت بوو و لەگەڵ ئێمە لە باکووە هاتبۆوە. ئەحواڵی یەکترمان پرسی، گوتم ئەوە بۆ لێرەی؟ گوتی چووبوومەوە ئاستارا سەرێک لە بنەماڵەکەم بدەم. دەی لە تاران چ خەبەر؟ گوتم جارێ هیچ باسێک نییە. گوتی بڕیارم داوە ئەگەر نەهێڵن بچمەوە کۆلێژ، بە ئاستاردا بچمەوە سۆڤیەت. گوتم مەگەر شتی وا دەبێ؟ گوتی: پاش ئاستارا، سنووری ئێران و سۆڤیەت هەر زۆر لە جادەوە نزیکە. لە هێندێ شوێن، هەر سێ مەترێک دەبێ. پرسیی ئەی تۆ لێرە چی دەکەی؟ گوتم هاتوومەتە دیتنی یەکێک لە هاوڕێیان، کە چەند ڕۆژێکیش لێرە دەبم. ماڵاواییمان کرد. دەمودەست سواری ئەو ماشێنە بووم کە دەچووە بەندەرئەنزەلی.

ماشێنەکانی نێوان ڕەشت و ئەنزەلی بەردەوام لە هاموشۆدا بوون، لە ئەنزەلییشەوە یەکسەر بە ئوتوبووس

چوومە ئاستارا. هێشتا تاریک دانەهاتبوو کە گەیشتمە ئەوێ. بەڵام شارەکە پڕ بوو لە سەربازی چەکدار. مانەوە لە شاریدا باش نەبوو. چوومە نێو قاوەخانەیەک. خاوەنی قاوەخانەکە چایەکی لە پێش دانام. فکر و خەیاڵ هەڵی گرتم. دەمویست شانسی خۆم تاقی بکەمەوە و ئەو شتەی کە سێ کەسی لە گونبەد نەمانتوانی بیکەین، بەتەنیایی تاقیی بکەمەوە. پەیتا پەیتا چام دەخواردەوە. قاوەچی چونکە مشتەرییەکی دیکەی نەبوو، پێی ناخۆش نەبوو ئەو سەماوەرەم بەگەروودا بکا. دوایی پرسیم نانت نییە؟ گوتی گۆشتاوم هەیە. گوتم دەی لەوە باشتر؟! بە ڕاستی چارەنووس هیچی لەگەڵ ناکرێ، دەتگوت دەستێک بەرەو پێشەوەم پاڵ دەنێ. سوێند دەخۆم ئەگەر سیاوەشی نیعمەتوڵلاهیم لە ڕەشت نەدیتبوو، قەت نەمدەوێرا بە تەنێ بچمە ئاستارا و لێرەش ئەم نەخشەی ڕاکردنە داڕێژم.

لە قاوەخانەکە شیوم خوارد، پرسیم ئەگەر شوێنێکت هەیە بۆ خەوتن، هەر لێرە دەمێنمەوە، چونکە ئیتر درەنگە، سبەی دەمەوێ بچمە ئەردەبیل، گوتی لە بانیژەی قاوەخانەکە جێ هەیە، نوێنوبانیشم هەیە. ئەگەر بەوێ ڕازی نەبی، قسەم نییە. گوتم جا بۆ ڕازی نابم. ئەو چووە سەرێ و هاتەوە گوتی جێی خەو ئامادەیە. هەر کات ویستت بڕۆ بخەوە. من هێندێ خۆم بەو کاغەزانەوە خافڵاند کە لە جانتاکەمدا بوون. ئینجا بە پلیکانە دارینەکاندا وەسەر کەوتم چووم ڕاکشام. خەوم لێ

نەدەکەوت. هەر بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ بڕۆم یان نەڕۆم. تۆ بڵێی ڕۆیشتنەکەم باش بێ؟ بیر و هۆشم بۆ کۆ نەدەبووەوە. گێژ ببووم. دەتگوت پووشەکایەکم و ئاوی ڕووبار بەملاولامدا دەدا. بەبێ ئەوەی هیچ ئیختیار و ئیرادەیەکم هەبێ.

هیچ نەمدەتوانی ژیرانە قازانج و زەرەری ئەو کارە هەڵسەنگێنم. بەو فکر و خەیاڵە پەرێشان و ئاڵۆزەوە خەوم لێ کەوت. بەیانی بە دەنگی پرخەی قاوەچی وەخەبەر هاتم. ڕاستە ویستی مرۆڤ کاریگەریی لەسەر هاتنەپێشەوەی ڕووداوەکان هەیە، بەڵام بە ڕاستی ئاکامی کارەکە بە تەواوی لە دەست کەسەکەدا نییە. جاری وایە کۆسپێکی بچووک تەواوی زەحمەتەکانی بنیادەم بەفیڕۆ دەدا.

قاوەچی سینییەکی بە هێندێ نان و پەنیر و چایەکەوە لەپێش دانام. بە حەزەوە خواردم. لە قاوەچییەکەم پرسی، چۆن دەتوانم بچمە ئەردەبیل؟ گوتی ئاستارا تەنیا یەک گەراجی هەیە. ئەویش لەوسەری شەقامەکەیە. ڕێک بچۆ، ئەگەر لەوێ ماشێن هەبێ، دەتوانی بڕۆی. پارەی نان و جێ خەوەکەم دایێ و هاتمە دەرێ. گەیشتمە گەراج. خەڵکێکی زۆر لەوێ کۆ ببوونەوە. لە نووسینگەکەم پرسی، ئۆتوبووس هەیە بۆ ئەردەبیل؟ گوتی جارێ نیمانە. پتر لە سەعاتێک لە گەراجەکە چاوەڕێ بووم. هێندێ لە مسافیرەکان بڕیاریان دا بە پێیان وەڕێ بکەون، ئەگەر ماشێنێک شتێک هات لە ڕێیە سوار بن. جا ئەوە بۆ من زۆر باش بوو. منیش لەگەڵیان وەڕێ کەوتم. گەنجێکی هاوتەمەنی خۆمیان لەگەڵ بوو. بەینم لەگەڵ خۆش کرد و لێم پرسی، ئاخۆ ئێوەش

دەچنە ئەردەبیل؟ گوتی نەخێر، من دەچمە گوندێکی نزیک ئەردەبل.

هەر وا باســـی زۆر شــتمان کرد، بۆ ئەوەی هەر سەرمان بخافڵێ و هەمیش دەرفەت بێ من بە وردی لای ســنوورەکە بپشــکنم. جاروبار خەیاڵم دەیبردمەوە ڕابردوو. پێنج مانگ بوو لە کۆلێژ هاتبوومە دەرێ. ئێستا لەگەڵ کۆمەڵێک دێهاتی بە جادەی ئاستارا و ئەردەبلەوە، بەرەو ئامانجێکی نادیار و چارەنووســێکی ناڕوون دەڕۆیشــتم. مایەپووچێک، کە ڕووداوێکی کتوپڕ هەموو ســەرمایەی لێ ئەســتاندبووم. ئێســتا بە کۆڵێک خەم و پەژارەوە هەوڵم دەدا ســەرمایە بزربووەکەم بدۆزمەوە. بە دەم ڕێگەوە تێگەیشــتم ســیاوەش ڕاســتی دەکرد، ســنووری دوو وڵاتەکە ئەوەندە لێک نزیک بوو، کە ڕووبارە تەنکەکەی ئاراســم جوان لێ دیار بوو. ســەیر ئەوەیە کەســیش دیار نەبوو. زۆر بە ئاســانییش دەکرا بپەڕییەوە. بەڵام دۆخەکە جۆرێک بوو، نەمدەتوانی بە بەرچاوی ئەو خەڵکەوە وا بکەم. نانی نیوەڕۆمان لە قاوەخانەیەکی دەم ڕێیە خوارد و پاش تۆزێک ئیسراحەت دیســان ملی ڕێیەمان گرتەوە. بەڵام هێشــتا ئۆتوبووس نەهاتبوو. جاروبار ماشێن و کامیۆنی بارهەڵگر بەلاماندا تێدەپەڕین. لە ژیانمدا ئەوەندە بە پێیان نەڕۆیبووم. دوو ڕۆژ لە نەورۆز لای دابوو. دەڵێن ســاڵی خۆش بە بەهارەکەیڕا دیارە. جێژن و بەهاری منیش بە زەحمەت و کوێرەوەرییەوە دەســتی پێ کردبوو. خەریک بوو ڕۆژ

ئاوا دەبوو. پرزەمان لێ بڕابوو. تینی ئەژنۆم نەمابوو بە ڕێدا بڕۆم. هەر گەیشتمە قاوەخانەیەک، یەکسەر خۆمم پێدا کرد. کۆمەڵێک کەسیش لەگەڵم وەژوور کەوتن. چوومە سەر سەکۆی قاوەخانەکە و لە ماندوویەتییان ڕاکشام. قاوەچی چای هێنا. چای تازە و خۆشڕەنگ. پاش ئەو هەمووە ڕێگەبڕینە نیعمەتێکی گەورە بوو. دەمودەست هێوری کردمەوە.

هەستیشم کردبوو قاوەخانەکە زۆر لە سنوور دوور نییە. ئێرە دوایین مزڵی من دەبێ‌ یان هەر لێرەوە ئاودیو دەبم و چی دەبێ با ببێ، یان بیری ڕۆیشتن لە سەرم دەرداوێم.

هەڵبەت چونکە شەو بەسەردا هاتبوو و لە ڕادەبەدەر ماندووش بووم، نەدەکرا بڕۆم. نانی ئێوارەشم هەر لەوێ خوارد و کرێی خواردن و خەوم دانێ. بالیفێکم لەژێر سەرم نا و لەسەر سەکۆکە ڕاکشام و خەوم لێ کەوت، بەو هیوایەی بەیانی پێش هەموان بەخەبەر بێم. خەوتم، بەڵام چ خەوێک. ئەگەرچی جاروبار خەونی ناخۆش ڕایاندەچڵەکاندم. بەرەبەری بەیانی بەخەبەر هاتم.

ئیتر ڕانەوەستام هەموو بەخەبەر بێن. تەنانەت قاوەچییەکەش. کۆنە جانتاکەمم هەڵگرت و بەسپایی لە قاوەخانەکە هاتمە دەرێ و خۆم گەیاندە پشتەوەی قاوەخانە. بیرێکم کردەوە. دەلینگی پانتۆڵەکەم خستە نێو گۆرەوی و بەپەلە بەرەو سنوور کەتمە ڕێ. ڕێیەکە نشێو بوو. پەنجا مەترێک کە لە قاوەخانەکە دوور کەوتمەوە، ئیتر کەس نەیدەدیتم. هێشتا ڕووناکی نەکردبۆوەز پێش خۆمم بە جوانی نەدەدی. دڕک و گیای خۆڕسک لە پانتۆڵەکەم گیر

دەبوون. کتوپڕ لەو نشـــێوە هەڵخلیســـکام و کەوتمە نێو جگەیەکی تەنکەوە. نەمدەزانی ئەوە ڕووباری ئاراسە. هەر ئەو ئاراســـەی ســـاڵانێکە دوو وڵات، دوو ڕژیمی تەواو جیاوازی لێک جوێ کردووەتەوە. ئێســـتا من لاقم لە نێو ئەو ڕووبـــارەدا بوو. بە زەحمەت پەڕیمەوە ئەوبەری. پێڵاوەکـانم کە پڕ ببوون لە ئـاو، نەیـانـدەهێشـــــت لە کەندالەکە وەسەر کەوم. بە ناچاری دامکەندن. جا ئەوجار ســـەرەڕای ئەوەی دڕک و داڵ قاچیشـــیان زامار دەکردم، بەڵام باشـــتر توانیم هەورازەکە ببڕم. ئاخری گەیشـــتمە سەرێ، دانیشتم پشوویەکم بێتەوە بەر. هەرچۆنێک بێ لە ســـــنوورەکە پەڕیبوومەوە. لە دوامەوە، دوور دوور تارمایی قاوەخانەکە دیار بوو. بەرانبەرم دارســـــتانێک تەنک هەبوو. وردە وردە خەریک بوو ڕووناکی دەکردەوە. تارمایی داروبارم لێ وەدەر دەکەوتن.

# ورچەی نێو دارستانێ

لەناکاو، پەنجامەترێک لە پێش خۆمەوە دێوەزمەیەکم دی. لە ترسان خۆم دایە پەنا دارێک. ئەو شتە زەبەلاحە زۆر لە گورگ گەورەتر بوو. گوتم بێ و نەبێ ئەوە ورچە و لە زستانەخەوەکەی بەخەبەر هاتووە و هەستاوە. جانتاکەم چەقۆیەکی زامنداری تێدابوو، دەرمهێنا و چاوەڕێ بووم، گوتم ئەگەر هات لانیکەم دەستێک بکەمەوە. تاوێکی پێوە چوو و زەبەلاح دیار نەبوو. کاتێک بە ئەسپایی لە پشت دارەکە هاتمە دەرێ، سەیرم کرد تووکلێکراوە ئەوە پشتی لای منە و وردە وردە دوور دەکەوێتەوە. بەڵام دیتم ورچێکی زەبەلاح بوو. سەرەڕای ئەوەی هیچ بڕوایەکم بە خوڕافات نەبوو، بەڵام ئەو قەڵافەتە سامناکەم بە پێشەکیی ڕەنج و کوێرەوەرییەکانم دانا. خوا خۆی فریام بکەوێ.

پشت لە ورچە وەڕێ کەوتم. خەریک بوو ڕوونی دەکردەوە. لە نشێوەکەی ئەوبەری دارستانەکە، بەرانبەر خاکی سۆڤیەت بووم. لە دوورەوە چەند کۆلیتێکی جووتیاریم دی. ژنێک لە پێش یەکێک لە کوخەکان بوو، کە هێندێ لێک دوور بوون. لە دوورەوە بانگم کرد، خوشکێ ئەرێ بنکەی پاسەوانی لە کوێیە؟ بە دەست ئاماژەی دا بچمە پێشتر. لێی چوومە پێشێ و سڵاوم کرد. هیچ شلوێ نەبوو. پرسیی لەوبەرەوە هاتووی؟ گوتم بەڵێ. خانمێکی ئازەری بوو. دیار بوو ئەو دیمەنانەی بۆ ئاشنا بوون. گوتی بڕۆ ژووری کەسی لێ نییە. ئاگر داییسێ خۆت وشکەوە بکە. ئێستا سەربازەکان دەگەنێ. وەژوور کەوتم. لە نێوەندی

ژوورەکە قوولکەیەکی لێ بوو. پێم وایە جێی کورسی بوو. ئاگرێکی بەنێلەنێل تێدا داییسا. جلوبەرگی زیادەم پێ نەبوو. ناچار لە بەر ئاگرەکە وردە وردە پانتۆلە خووساوەکەمم وشکەوە کرد. نیو سەعاتێک ڕابرد. ئەو خانمە وەژوور کەوت و گوتی، دوو سەرباز بێرەدا ڕادەبردن، بانگم کردوون. ئێستا دێن. لەو دەمەدا دوو سەربازی چەکدار وەژوور کەوتن. پێیانەوە دیار بوو ئازەری نین. بە زمانی ڕووسی سلاوم لێ کردن و گوتم لەوبەرەوە هاتووم، چونکە نەمدەزانی بنکەکەتان لە کوێیە داوای یارمەتیم لەو ژنە کرد تا ئێوە دێن، جلە خووساوەکانم وشکەوە بکەم. ئێستاش ئەوە لە دەستی ئێوەدام. گوتیان زۆر باشە لەگەلمان وەرە. سپاسی خانمەکەیان کرد و مالاواییمان کرد. ئەملاولایان گرتم. یەکێک لە پێشەوە و ئەوی دی لە دواوە. بنکەکەیان زۆر دوور نەبوو. لە سەر گردێک بوو. دەوراندەوری تەلدڕوو بوو. سەربازێک لەبەر دەرگا بە چەکەوە ڕاوەستابوو و ئێشکی دەگرت. دەمودەست سەدریە و شەهریاریم بیر کەوتنەوە و گوتم جا ئێستا وەرن بمبینن بزانن چ بەختەوەرییەکم بە نەسیب وو. چووینە نێو حەوشەکە. یەکێک لە سەربازەکان چووە نێو نووسینگەی بنکە سەربازییەکە. تاوێک دواتر لەگەل گرووبانێک هاتە دەرێ. سەیرێکی کردم و گوتی وەرە ژوورێ. وەژوور کەوتم. مێزێک و چەند کورسیی تێدا بوو. چووە پشت مێزەکەی و پێی گوتم دانیشم. ناو و شۆرەتمی پرسی و لە

کاغەزێکدا نووسیی. پرسیی سەعات چەند لە سنوور پەڕیومەتەوە؟ گوتم سەعاتم پێ نییە بەڵام پێم وایە پێنجی بەیانی بوو. هێشتا ڕوونی نەکردبۆوە. پرسیی بە چ ناوچەیەکدا پەڕیویەتەوە؟ گوتم ناوی ناوچەکان نازانم. بەڵام ڕێک بەرانبەر ئێرەوە قاوەخانەیەک لە دەم ڕێیەکەیە. ئیتر بۆم گێڕاوە. هەمووی نووسی و دایمێ لە خوارەوە ئیمزام کرد. دوایی هێنامیە حەوشە و دەرگای هۆدەیەکی بچووکی کردەوە و ناردیانمە ژووری و لەودیوڕا دایانخست. ژوورێکی بچووک بوو، لە عەمبار دەچوو. لە درزی پەنجەرەکانەوە کە دەست نەیاندەگەیشتێ، تۆزە ڕووناکاییەک دەهاتە ژووری. چەندین سەعات لەو کاژێرەدا زیندانی بووم. لەسەر عەرزە ساردەکە دانیشتبووم. پەشیمانییەک دایگرتبووم، حەزم دەکرد سەرم بە دیوارەکەدا بدەم. پێم وابوو هەرچی بەختەوەریی دنیایە، بایی ساتێک مانەوە لەو کاژێردا نییە. نێو کاژێرەکە بەرەبەرە تاریکدا دەهات. هەستم کرد ئێوارەیە. کتوپڕ دەرگای عەمبارەکەیان کردەوە. سەربازێک، قاپێک بڕوێش و لەتێک نانی ڕەشی لەپێش دانام و بە ڕووی گوتی "کوشای"، واتە بخۆ. دەرگاکەی داخستەوە. گڵۆپێکیش بە میچەکەوە داگیرسا. زۆرم برسی بوو. نە بەرچاییم خواردبوو و نە فراڤین. ئەی خۆزگە هیچیان نەدابامێ و هەر لەو عەمبارەدا گیانم دەرچووبایە. چاوەڕێی ئەو نەگبەتییە نەبووم. بوونەوەرێکی چارەڕەشی سووکایەتیپێکراو. لەبری ئەوەی نانەکە بخۆم، تێر گریام. تاوێک دواتر دیسان دەرگاکەی کردەوە و دوو بەتانی و کۆنە بالیفێکی سەربازیی هێنا. سەیری کرد دەمم

لە خواردنەکە نەداوە. گوتی، بیخۆ نیو سەعاتی دی دێمەوە، نەتخواردبێ، بەو قۆنداغە تفەنگە سەروگوێلاکت تێک دەکەمەوە. بەتانییەکەم ڕاخست و بڕوێشە ساردەوەبووەکەم بە نانە ڕەشەوە خوارد و ڕاکشام. بیرکردنەوە و ئاخهەڵکێشان بێفایدە بوو.

پێش ئەوەی بێم گوتبووم چی دەبێ با ببێ، خۆم دەدەمە دەست ڕووداوەکانەوە. دەردەکەوێ وەکی بیرم لێ کردبۆوە، ئەوەندەش سادە و ساکار نییە. دەبێ وریا بم. خەوتم. بەیانی کە بە کردنەوەی دەرگاکە وەخەبەریان هێنام، ڕۆژ ببۆوە و تاو ڕمبێک هەڵکشابوو.

لە حەوشەی سەربازگەکە، دوو سەربازی سوارە دەبینران. سەرۆکی سەربازگەکە کەلەپچەی لە دەستم دا و دۆسییەیەکی دا بە یەکێکیان. سوارێک لە پێشەوە و یەک لە دواوە و منیش لە نێوەڕاست، وەڕێ کەوتین.

لە سەربازگەکە هاتینە دەرێ. بە جادەیەکی تەسکدا دەڕۆیشتین. کەس لە دەرەوە نەدەبینرا. نیشانەی پەروەردە و شارستانییەت و هەڵسوکەوتی مرۆیی هەر لە یەکەم هەنگاوڕا دیارە. مەگەر لە وڵاتانی دواکەوتوو و حکوومەتە دڕندە و وەحشییەکاندا، ئەگینا لە هیچ شوێنێکی دنیا ئاوا لەگەڵ یەخسیری شەڕ و تەنانەت تاوانبارانیش ناجووڵێنەوە. ەل هێندێ شوێن لەوبەری سنوورەوە وەرزێڕەکانم دەدی خەریکی کارن. جاری وابوو سنورەکە هێندە نزیک بوو، کە بە بازێک دەمتوانی بپەڕمەوە، بەڵام پارێزەرەکانم چەکدار بوون و دەترسام

تەقەم لێ بکەن. ئەی خۆزگە وام کردبایە و خۆم دابایەتە دەست قەزا و قەدەر. بە پێیان و کەلەپچە لە دەستدا بەشوێن ئەسپێکدا هەنگاوم دەنا. نیوەڕۆ ببوو. هەتاو گەیبووە نێوەندی ئاسمانێ، سەرەڕای ئەوەی هێشتا هەوا گەرم نەبوو، بەڵام هەموو گیانم لە ئارەقەدا خووسابوو.

# شاری لەنکەران

جادەکە جاریٚ هەوراز و جاریٚ لیٚژ دەبوو. چاوم بە تابلۆیەک کەوت، کە بە خەتیٚکی گەورە و زمانی ڕووسی لیٚی نووسرابوو: لەنکەران.

ئیٚرە چاریٚکی بچکۆلانەی سنوور بوو. کاتیٚک بە کۆلانەکانی شاریدا ڕادەبردین، خەلکەکە هەر سەیریشیان نەدەکردین. دەتگوت لەگەل ئەو دیمەنانە ڕاهاتوون. چەند کۆلانیٚکمان بڕی. سەربازەکان لەبەردەرگای بینایەکی دوونهۆمی ئەسپیان ڕاگرت. یەکیٚکیان دابەزی و بە دەرکەوانەکەی گوت، دەرگا گەورەکە بکەوە. کە دەرگاکە کرایەوە، بردیانمە حەوشە. ئەوەی دۆسییەکەمی پیٚ بوو، چووە ژووریٚ. تاویٚک دواتر لەگەل ئەوی دی هاتەوە دەریٚ و دەرگای ژووریٚکی کە لە حەوشەکە بوو، کردەوە. کەلەپچەکەشمی کردەوە و پیٚی گوتم بچمە ژووریٚ. ئەوە دووەم زیندانی من بوو. هەر وەژوور کەوتم، دەرگاکەیان لیٚ پیٚوە دام.

ئەوە دووەم زیندانم بوو. هۆدەیەکی تاڕادەیەک گەورە و نیوەتاریک لە نیٚوڕاستی ژوورەکە، بەتەختە سەکۆیەک دروست کرابوو، هیٚندەی نیٚوقەدی پیاویٚک بەرز. لە سەکۆکە وەسەر کەوتم و لەسەری دانیشتم. زۆر شەکەت ببووم. برسیەتی و تینویٚتی بڕستی لیٚ بڕیبووم. نە بەرچاییم خواردبوو و نە فراوین. سەیری دیوارەکانی هۆدەکەم کرد، چاوم بە تاریکایی ژوورەکە ڕاهاتبوو. سەرم سووڕ ما، سیٚ دیواریان هیٚندە نووسرابوو، ڕەش

دەچۆوە. بە بزمار و ڕەژوو و چڵەشقارتە و بە هەر شتێکی لەبەر دەســـتیان بووە، بە زمانی جۆراوجۆری ڕووســـی و ئازەری و زیاتریش بە فارسی نووسرابوون. دەمتوانی چەند سـەعاتان دانیشـم و خۆم بە خوێندنەوەیانەوە خەریک بکەم. هەر کەســـە و ناونیشـــانی خۆی و ماوەی مانەوەکەی لەو ژوورەدا لەســـەر دیوارەکە نووســـیبوو. کەوابوو ئێرە بەندیخانەیەکی کاتییە. تـاقەتم نەبوو زۆریـان بخوێنمەوە. لەســەر ســەکۆ دارینەکە ڕاکشــام و خەوم لێ کەوت. خەڵکی دامـاو لە خەڵکی دیکە زووتر خەو دەیـانبـاتەوە. خەویش باشــترین ئازارشــکێنی مرۆڤە. بە دەنگی کرانەوەی دەرگاکە بەخەبەر هاتم. نێو ژوورەکە تەواو تاریک بوو. ســـەربازێک گڵۆپی ژوورەکەی داگیرساند و دوو کۆنە پەتۆی سەربازی و بالیفێکی فڕێ دایە سـەر سـەکۆکە و گوتی ئێسـتا نانت بۆ دێنم. گوتم ئەوە چۆنە؟ گوتی چۆن؟ گوتم نە نـانی بەیـانیم خواردووە و نە نیوەڕۆ. قەی چ دەکـا بـا نـانی شـــەوێش نەخۆم. هیچی نەگوت، چووە دەرێ. تاوێکی پێ چوو، هاتەوە بە لەتێک نانی ڕەشـەوە. قاپێک برویش و کەوچکێک. لەسـەر ســـەکۆکەی دانان. لەو دوو ڕۆژەدا ئەوە دووەم جار بوو، خواردنی من نانی ڕەش و برویش بوو. ئەگەرچی زۆریشـم برســـی بوو، بەڵام بڕێکم لەو نـانە ترشـــە ڕەشـــە بە برویشـــەکەوە خوارد و ئەوی دیکەم لە گۆشـــەیەک دانا. دەنگی قورس و یەکهەوای پۆتینی ســـەربـازێـک لەودیو دەرگاکەوە دەهات، دیار بوو سـەربازێک ئێشکگرە. کەوابوو من بە ڕاســتی زیندانی بووم. من یەکەم و دوایین کەسـێک

نەبووم کە لەو ژوورەدا بەنــد بووم. کەوابوو دەکرێ
شوێنێکی گونـجاو بۆ دەسبەسەرکردنی خەڵک دابین بکرێ.

## لێپێچینەوە دەست پێ دەکاتەوە

بەیانی بەخەبەر هاتم. پێم سەیر بوو لەتە نانەکەی شەوێم کە بەلاوەم نابوو، نەمابوو. ئاخر ئەو لەتە نانەم زۆر بەلاوە گرینگ بوو. برسیم بوو. کەس دەرگای ژوورەکەی نەکردبۆوە. قاپ و کەوچکەکە هێشتا لەسەر سەکۆکە بوون. وەبیرم هاتەوە دوو ڕۆژی ڕەبەق خواردنم تەنیا بڕوێشێکی ڕووت بووە. داخوا زاڵمترین حوکمەتەکانی دنیا، حوکمەتە ئیمپریالیستییەکان، زیندانییەک دوو ڕۆژان بە دوو لەت نانی ڕەش و شلەخواردنێکەوە بە ناوی بڕوێش بە برسیەتی ڕادەگرن؟ ئەی کوا شەرافەتی مرۆیی؟ کام بنەمای مرۆیی ڕێگە دەدا، ئینسانێک بە دەست بەستراوی و بە پێیان پانزە کیلۆمەتر لەم سەربازگەیەوە ببەنە ئەوی دی؟

ئیتر، ڕۆژ ببۆوە. سەربازێک دەرگای ژوورەکەی کردەوە و گوتی دەتوانی بچیە ئاودەست. چوومە ئەو ئاودەستەی لە حەوشەکە بوو و دەست و دەموچاوم بە سابوون شوشت و هاتمەوە ژوورەکەم، سەیرم کرد لەتێک نانی ڕەش و پەرداخێک ئاوی گەرمی ڕەش کە پێیان دەگوت کوفێ لەسەر سەکۆکەم دانراوە. بەڵام دوو جرجەمشک دەیانەوێ لە کونەکانی ئەملاولای ژوورەکەوە بێنە دەرێ. ئەوە تازە تێگەیشتم لەتە نانەکەی دوێنێ شەوێم ئەوانە خواردوویانە. دیار بوو هەردووکیان چاوەڕێ بوون. هەردووکیان تیژ دەرپەڕینە دەرێ. لەسەر ئەو لەتە نانە بوو بە شەڕێک هەر مەپرسە. گوتم دیارە ئەو دوو مشکە پێکەوە ناژین. دیارە هەر کام خێزانی خۆیان هەیە. یەکێکیان ماڵی لەمبەرەی

زیندانەکە و ئەوی دی ماڵی لەوبەرە. ئیتر پاش شـەڕێکی زۆر، نانەکە لەت بوو و هەر کام لەتێکی بە ددان هەڵگرت و بەرەو هێلانەکەیان ڕایان کردەوە. شـێوە و نموونەیەک بوو لە سـەر شـەڕی مان و نەمان. کەوابوو شـەڕی چینایەتیی کۆمەڵگەکانی مرۆییش هەر ئاوایە. هەر کەسـە و دەیەوێ پشکێکی زیاتر لەوی دیکە پێ ببڕێ یان پشکی خەڵکیش بخوا. بەڵام ئەگەر یاسـا و ڕێسـایەک هەبێ، نیعمەتەکانی دونیا بە یەکسـانی بەسـەر خەڵکەکەدا بەش بکا، وەکوو بەشـکردنی ئەو لەتە نانە لە نێوان ئەو دوو مشکەدا، هەر کام بە بەشی خۆی قایل دەبێ و سەرودڵی ئەوی دیکە ناگرێ.

بەرچاییم نانی ڕەش و ئاوی ڕەش بوو. نیشانەیەک لە بەختی ڕەشـی من و ئەوانی دی. چار نەبوو. نانەکەم بە ئاو خوارد. سـێ شـەو و ڕۆژ ئاوا ڕابرد. لە ژوورێکدا، ئەفسـەرێکی گەنج بە جلوبەرگی سـەربازی و دەرەجەی سـتوانییەوە دانیشـتبوو و چاوەڕێم بوو. بە ئەدەبەوە ئاماژەی کرد دانیشـم. ناونیشـانمی پرسـی و پرسـیاری ئەوەی کرد کە بۆچی هاتوومە وڵاتی سۆڤیەت. دەرکەوت هیچ ئاگاداری ئەوە نییە من لە بادکوبە بوومە. بە ناچاری لە بنێڕا بۆم گێڕاوە تا ئەمڕۆ. لەسەرخۆ هەمووی نووسی و هەموو جارێکیش بە سـەرسـوورمانەوە سـەری هەڵدەبڕی و سـەیری دەکردم. ئاخری گوتی: یانی ئاوا. کاغەزەکانی وێدام و من ئیمزام کرد، بەڵام بە ڕوویەکی خۆشـەوە زەنگی لێ دا بۆ ئەوەی بمبەنەوە هۆدەکەم.

ڕایسپارد باشترم پێ ڕابگەن. چوار ڕۆژی دی تێپەڕی، دیسان بردیانمەوە بۆ لێپێچینەوە. هەر ئەو ئەفسەرە گەنجە پرسیاری دۆست و ئاشناکانمی لە ئێرانێ لێ کردم. دۆست و ئاشنای من هەر ئەوانە بوون کە لەگەڵیان دەمخوێند یان لە پانسیۆنەکە لەگەڵم بوون. پرسیی ئەندامی حیزبی توودە نەبووم؟ گوتم نەخێر، من لە تاران بەهیچ شێوەیەک خۆم لە سیاسەتی ناوخۆ وەرنەداوە. گوتی ئەی لە مەهاباد؟ گوتم لەوێ ئەندامی کۆمەڵەی ژێکاف بووم، بەڵام پاش ئەوەی من چوومە تاران، ناوی کۆمەڵە گۆڕا و ئیتر من لە ڕێکخستنی نوێی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا هیچ دەورێکم نەبوو. گوتی لە ئەفسەرانی سوپای ئێران کێ دەناسی؟ گوتم بە هیچ شێوەیەک کەس ناناسم. گوتی لە خانەی فەرهەنگی سۆڤیەت دۆست و ئاشنا و دەستێکت نەبوو؟ گوتم بۆخۆم چووم ناوم نووسی. بەڵام بۆ دڵنیابوونی زیاتر، جەنابی سەدری قازی، نوێنەرەکەی مەهابادم زەحمەت دا، کە ئەویش لە سێدارە درا و شەهید بووە. ئەویش ڕایسپاردم. دیسان کۆمەڵێک کاغەزم ئیمزا کرد و زەنگی لێ دا بردیانمەوە ژوورەکەم. داوام لە ئەفسەرە گەنجەکە کرد، گوتم گیانم زۆر دەخورێ، جلوبەرگەکەم بۆن ئارەقەیان دێ. گوتم ئەمر دەکەم بتبەنە حەمام. دوانیوەڕۆ دوو سەربازی چەکدار بردیانمە حەمامی شاری. بە سەرسوورمانەوە سەیرم کرد حەمامەکە ڕێک لە حەمامە گشتییەکانی قەدیمی خۆمان دەچێ. سابوونێکیان دامێ. چوومە ژووری، جلەکانی بنەوەمم جوان شوشت و خۆمم خاوێن کردەوە. هاتمە دەرێ، بە بنکراسی تەڕەوە. پیاوێک

له حەمام پاکەتێک جگەرەی دامێ. زۆرم سـپاس کرد، له ڕێیەش ژنێـک جـانتـاکەی کردەوه و پێنج ڕۆبڵی دامێ. سـەرەڕای ئەوەی هیچ پێویسـتم به پاره نەبوو، بەڵام دەستی چاکه و ئینسانییەتیم نەگێڕاوه.

دوو ڕۆژ دواتر دیسـان چوومەوه لێپێچینەوه. لێکۆڵەر پرسـیی له ئێرانێ خزم و کەسـم هەیه؟ گوتم جگه له خوشکێکم که ئەویش شـووشـی کردووه لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆی دەژی کەسـی دیکەم نییه. گوتی ئەی ملک و ماڵ؟ گوتم ماڵ و زەوی و باغ و ئەوشتانه تـاقه بسـتێکیش چییه نیمه. گوتی پێش ئەوەی بێیه سـۆڤیەت پیشـەت چ بوو؟ گوتم مامۆسـتا بووم. له قوتابخانەیەکی تاران دەرسم دەگوتەوه. گوتی به وردی ڕوونی بکەوه بزانم بۆچی دیسان هاتوویەوه سۆڤیەت؟ گـوتـم وەختـێـک که بەڕێـی ئـێرانـیـان کـردینەوه، بەڕێوەبەری پانسـیۆنەکه گوتی دەوڵەتی ئێران داوای کردووینەوه، که چوومەوه ئێران، تێگەیشـتم دەوڵەتی ئێران هەر لەسـەر ئەوەی له وڵاتێکی کۆمۆنیسـتیدا دەرسمان خوێندووه، لەگەڵمان زۆر خراپ هەڵسوکەوت دەکـا، هەر بۆیه تەنـانەت ڕازی نەبوو له کۆلێژیش ڕامـانگرن. جگه لەوەش به بیـانووی جۆراوجۆر لەوانەبوو دەسـبەسـەریش بکرێین. ئیتر لەبەر ئەوه و چونکه لەم وڵاتەش بەختەوەرانه هیچ کـارێکی خراپم نەکردووه، بڕیارم دا به نافەرمی بێمەوه ئێره. ئێسـتاش کارێکه و کردوومه، ئەگەر قبووڵتانم، تا دەمرم چاکەتان

لەبیر ناکەم. ئەگەر قبووڵیشـــتان نیم، لێم گەڕێن بە کوێدا هاتووم با بەوێدا بڕۆمەوە. ئەفســـەرە گەنجەکە پێکەنی و هیوای خواست و گوتی هیوادارم قسەکانت قبووڵ بکرێن. من بە قسە و هەڵسوکەوتترا هەست دەکەم ڕاستگۆی. تا چەنـد ڕۆژی دی ڕوون دەبێتەوە. دیســـــان چوومەوە بەندیخانەکەم. پانزە ڕۆژ لەو ژوورە پیســە پڕ لە مشـکەدا بەو نانە ڕەشــە ترش و بڕوێشــەوە لە شــاری لەنکەران ژیام. پانزە ڕۆژێک هێندەی پانزە ســـاڵ تێپەڕی. ئەی چەنـدە هەڵەیەکی گەورەیە تەمەن، بە پێوەری ســـــاڵ بژمێری. ئەو ڕۆژەی لە چارەڕەشی و نەگبەتیدا تێدەپەڕێ، هێندەی ساڵێکە. کەسـانێک بوون کە لە هەرەتی لاویدا بە شەوێک پیر بوون و مووی ڕەشیان لەسەریدا نەماوە.

تۆلســتۆی دەڵێ: "خۆشــییەکانی ژیانی خەڵک زۆربەیان لێک دەچن، بەڵام چارەڕەشیی هەر کەسە و بەجۆرێکە.

ڕۆژی ئاخری دەرگای سلوولەکەیان کردەوە. سەربازێک گوتی وەرە دەرێ و شــــتومەکەکەشـــت هەڵگرە. بردیانمە نووسینگەی سـەربازگەکە. جانتا و گیرفانمیان ورد پشکنی. پیرە ئەفســـەرێک کە ســـەروان بوو، لەوێ دانیشـــتبوو. کەلەپچەیان کردم و لەگەڵ ئەو ئەفسەرە پیرە و سەربازێک لەو بەنـدیخـانەیە هـاتینە دەرێ و بەرەو وێســـتگەی شـــەمەندەفەر ڕۆیشـتین. لەوێ سـواری ڤارگۆنێکی پڕ لە ئەفســەر و ســەرباز بووین. پیرە ئەفســەرەکە کەلەپچەکەی کردەوە و بە تووڕەییەوە گوتی نەکەی بیر لە ڕاکردن بکەیەوە، ئەگینا بە قوربانی گوللەیەکت دەکەم. دیار بوو ئەو پیرە ئەفســـەرە لەو کۆنە جەندرمە دڵڕەق و پیاوکوژانەیە.

خوا بزانێ تا ئێستا چەند کەس بە دەستی ئەو میرغەزەبە کوژراون. گریان ئەوکی گرتبووم. تەنانەت نەمتوانی دەم لەو نانەش بدەم کە بۆیان هێنابووم. دەبوو چ بەو پیرە خەرەفاوە بڵێم. بە تووڕەییەوە سەیرێکم کرد، کە لە هەزار جنێو خراپتر بوو. شەمەندەفەرەکە لە هەموو وێستگەیەک ڕادەوەستا. من بە دانیشتنەوە وێژینگم دەدا. کە گەیشتینە بادکوبە، ئێوارە بوو و دنیا هێشتا هەر ڕووناک بوو. من بە کەسەرەوە سەیری کۆڵانەکانی شارەکەم دەکرد، بەڵام شەرمم دەکرد بەو کەلەپچەیەوە سەیری ڕوخساری خەڵکەکە بکەم. لە بۆلڤارەکەی دەم دەریا گەیشتینە بینایەکی چەند نهۆم. لەبەر دەرگایەکی ئاسنیی گەورە ڕاوەستاین. پیرە سەروان لە زەنگی دا. لەپێشدا دەلاقەیەکی بچووک کراوە. ئەوجار دەرگا گەورەکەیان کردەوە و وەژوور کەوتین. بردیانمە ئیدارەی زیندان. ئەوە زیندامی ئێم گ ب بوو. زیندانێک کە ئەژنۆی مرۆڤی دەلەرزاند. ناوەندی سەرەکیی زوڵم و نادادپەروەریی و پیاوکوژە ڕاستەقینەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت ئێرە بوو. لە ئیدارەی زیندان ئەفسەرێکی قەڵەوە دانیشتبوو. پیرە سەروان فایلەکەی منی لەپێش دانا و کەلەپچەکەی کردمەوە. سەرۆکی ئیدارەکە ناومی پرسی. ئەوجار پسوولەیەکی دا بە پیرە ئەفسەرەکە و ئەو دوانە لە ژوورەکە چوونە دەرێ. سەرۆکی زیندان زەنگی لێ دا، مەئموورێک هاتە ژوورێ. پێی گوت برۆ دەستێک جل بێنە. تاوێک دواتر

بە دەسـتێک جلی زیندانەوە هاتەوە. سـەرۆک پێی گوتم جلەکانی خۆت داکەنە و ئەوانە لەبەر بکە.

من چـاکەت و پـانتۆڵەکەمم داکەن. جلی زینـدانم کە بیجامەیەکی خەت خەت بوو، لەبەر کرد. چاکەت و پانتۆڵ و جانتاکەمیان پێچایەوە. سـەرۆک بە مەئموورەکەی گوت بمبەن. کاربەدەستەکە کە دەیزانی دەبێ چ بکا، وەپێش خۆی دام و پاش ئەوەی بە ڕاڕەوێکی دووروودرێژدا ڕۆیشـتین، دەرگـای هۆدەیەکی کردەوە لە نهۆمی یەکەم و بردمیە ژووری و دەرگاکەی لەسـەر داخسـتم. ژوورێکی گەورە، زیاتر لە دە تەختی بەتاڵی تێدا بوو. لەسـەر یەکێک لەو تەختەخەوە ئاسنانە دانیشتم. جا ئەوجار ئیدی بەتەنێ بووم. سەرم خستە سەر دەستم و تا توانیم گریام. ئەوەندە گریام ئیدی ئاوی چاوم هەڵچۆڕا. دەستم لە هەموو شتێک شوشت و زانیم هیوای ڕزگـاربوونم نییە. هەسـتـام کەوتمە پیاسـەکردن. لەخۆم ڕاخوڕیم و گوتم خۆ منداڵ نی، قوڕێکە بۆخۆت گرتووتەتەوە. دەبێ بەرگەی کوێرەوەرییەکان بگری. پیاو، ئەو پیاوەیە لە چـارەڕەشـیـدا خۆڕاگر بێ. ئەوەش ڕوویەکی دراوی دنیایە. یەکێک لە ڕوخسـارەکانی ژیانی وڵاتی ئەنجومەنەکـانە. ڕوویەکیم پێشـتـر دیتبوو، بەڵام ڕوخسـارێکی تیفتیفەدراوی جوانکراو بوو. ڕوویەک و ڕوخسـارێکی سـەردەمانی پێش هاتنم بۆ سۆڤیەت بوو. ئەو ڕوخسـاری وەکوو حۆری و وڵاتەکەش بەهەشـتی بەڵێندراو بوو، کە نەک هەر من، هەموو خەڵکی جیهانی سـێیەم پێیان وابوو. ڕوخسـارێکیم لە سـەردەمی خوێندندا دی، بەڵام ڕوخسـارە ڕاسـتەقینەکەی ئەوەیە وا ئێسـتـا دەیبینم.

ڕوخسـارێک، کە دواتر لە دەرەوەی زیندانیش هەر ئەوەم دیتەوە. تەنانەت بە بیچمێکی خراپترەوە، لە جێی خۆی ئەو ڕوخســارە ڕاســتەقینەیە وێنا دەکەم. ئەگەرچی تا ئێرەش دەتوانی تا ڕادەیەک بیهێنییە بەر زەینت. مشـت، نموونەی خەروارە.

## زیندانی ئێم.گ.ب

لەو خەیاڵانەدا بووم، کە یەکێک لە کاربەدەستە سەوزپۆشەکانی زیندانێ پێی گوتم وەرە دەرێ. وەپێشخۆی دام و بردمییە نهۆمی سێیەمی بیناکە. باڵەخانەکە چوارنهۆم بوو. وەختێک بەو پلیکانانەدا کە بەردی ڕەشیان تێ گیرابوو، وەسەر دەکەوتین، بە کلیلە ئەستوورەکەی دەستی لە ئاسنەپەرژینەکەی دەدا. دواتر زانیم ئەوە هێمای بردنی زیندانییەک بوو، بۆ ئەوەی ئەگەر لە ڕووبەڕووشەوە زیندانییەکی دیکە بێنن، هەیتەی زیندانپارێز بزانێ و ئاگادار بێ و کارێک بکا دوو زیندانییەکە یەکتر نەبینن. لەو دەمەدا یەکێک لەو دوو زیندانییەیان ڕووە و دیوارەکە ڕادەگرت. لە نهۆمی سێیەم مەئموورێکی دیکە لە داڵانە درێژەکەدا پیاسەی دەکرد. دەرگای سلوولێکی کردەوە. منیان بردە ژوورێ. لەوێ ژمارەیەکیان دامێ کە لە سینگمی دەم. شمارەکە ١٢٩ بوو. ئەو سلوولە مەترونیو لە سێ مەتر بوو.

لە لای سەرووی دیوارەکەی، بەرانبەر دەرگای وەژوورکەوتن، پەنجەرەیەکی بچووکی تێ کرابوو، کە دەکرێ بڵێی کلاوڕۆژنەیەک بوو و تیشکێکی کز لەوێوە دەهاتە ژوورێ. دەستم پێی نەدەگەیشت. لە ژوورەکەدا، تەختێکی ئاسن و دۆشەگ و بالیفێکی چڵکن و بەتانییەکی سەربازی و مێزێکی بچووک و کورسییەک دانرابوو. دیار بوو کەسێک لە دنیای کۆمۆنیستیدا لەوە زیاتر پێویستی بە هیچ شتێک نییە. ڕۆژانە کارم ئەوە بوو لەو سێ مەترەدا بێم

و بچم. هەموو جارێ ژمارەی هەنگاوەکانم دەژمارد. کە دەگەیشتە هەزار، دادەنیشتم و لە کەلێنی دەلاقەکەوە سەیری ئەو گۆشەیەی ئاسمانم دەکرد، کە زۆربەی کات هەورین بوو و پێوەندیم لەگەڵ دونیای دەرەوەدا هەر ئەو ڕۆچنەیە بوو. شەوانە لەوپەڕی بێدەنگیدا، گوێم لە هاژەی شەپۆلی دەریا دەبوو، کە بە هۆی جووڵەی کەشتییەکانەوە هەڵدەستان. گوێم لە دەنگی هەنگاوی قورس و قایمی پاسەوانیش دەبوو. بە دەردی یەکێک لە زیندانییەکان، ڤێلایەکم لە دەم دەریا هەبوو. بڕیارم دابوو خەمی لێ نەخۆم. بە گاڵتەوە لە هەموو شتێک بڕوانم و بە هەموو شتێ پێ بکەنم.

چوار ڕۆژ کەس کاری پێمەوە نەبوو. هاتبوومە پشووگەی ئێم گ. ب. ئەمریان کرد سەعات هەشتی شەوێ بخەوم و شەشی بەیانی بەخەبەر بێم. بەرچایی و فراوین و شیو، کە نەدەکرا ناوی خواردنیان لێ بنێی، بەڵام بەس بوو بۆ ئەوەی نەمری، لە دەلاقەیەکەوە دەیاندامێ کە لە دەرگاکەیان کردبوو. هەر ئەو دەلاقەیە بە دەنگە تایبەتییەکەیەوە دەکراوە، دەمزانی کاتی نانخواردنە. ئینجا جرت و فرتی مشکانیشم لەکۆڵ ببۆوە. لێرە جگە لە بڕوێش، خواردنێکی دیکەشیان دەدامێ، کە زیاتر هەرزنی کوڵا بوو. هەڵبەت زیندانییەکانی دی دەیانگوت، خواردنی ئێم گ. ب. لە خواردنی تەواوی زیندانەکانی دیکەی سۆڤیەت باشترە. جا کەوابوو سەلا لەوانی دی. هەڵبەت لە قامووسی کۆمۆنیستیدا ئیتر

دەســــتەواژەی زیندان نەبوو. ناوی زیندان، لاکر بوو، واتە ئۆردوو. زینـدانەکـان لە ســەرانســەری ســۆڤیەتـدا ئۆردووگـای بێگـاری بوون. بە تەنیـا و لەو ژووره نیوه تاریکەدا کار و پیشــەم بیرکردنەوه بوو، شــتێک کە بە تەواوی زینـدانەوان و بەڕێوەبەرانی یـاســـا لە دنیـادا نەیاندەتوانی بەندی بکەن. بە کوردی شــیعر و گۆرانییەک هەیە، کە دەڵێ، لە عالەمی خەیاڵدا بۆ هەموو لایێ دەچووم.

ڕۆژی پێنجەم دەرگای ژوورەکە کرایەوە. دوو مەئموور بە دەم ئـاوازی تەقەی کلیـل و پەرژینـانەوە لەگەڵ خۆیـان بردیانمە بەشــێکی دیکەی ئەو نهۆمە. ئەو بەشــە، زەوی و ئاســـمان فەرقی لەگەڵ ئەو شــوێنە هەبوو کە ئێمە تێیدا زینـدانی بووین. ئێرە عەرزەکەی مەڕمەڕی ڕەش بوو، کە وێنەی خۆتت تێدا دەدی. دیوارەکان زۆر جوان نیگارکێشـی کرابوون و لۆســـتێری کریســـتال لە میچەکانەوە شــۆڕ ببوونەوە و دەرگاکان لە پشــــتەوەڕا بە چەرمێکی چاوەیی جوان داپۆشـــرابوون. ئەو بەشــــە تـابەتی لێکۆڵەران و بەرپرســــانی ئێم گ. ب بوو. لە ســــەر زۆربەی دەرگاکان تابلۆیەکی بچووک هەڵواسرابوو کە دوو پیتی ڕووسیی "س" و "ش"ــــــیان لێ نووســـرابوو. ئەو دوو پیتە کورتکراوەی Smert shpions بوو، واتە مەرگ و نەمان بۆ سیخوڕ.

## لێپێچینەوە لە ئێم گ. ب

لە ڕاڕەوی ڕازاوەی بەرپرسانی ئێم گ. ب، پاسەوانەکانی من دەرگایەکیان کردەوە و بردمیانە ژووریّ. سەرهەنگێکی چوارشانەی سمێڵ پان لە پشت مێزێکی گەورە دانیشتبوو. هیچ لە ئازەربایجانی و ڕووسان نەدەچوو. ئەگەرچی بەلای منەوە فەرقێکی نەبوو ئەو سەر بە چ نەتەوەیەکە. ئاماژەی بە پاسەوان کرد بچنە دەریّ. بە ڕووسییش بە منی گوت وەرە پێشیّ. لە پێشدا ناو و شۆرەتمی پرسی. ئینجا گوتی ئێمە هەموو شتێک لەبارەی تووە دەزانین و ئاگادارین کیّ و بۆ چ شتێک تۆی ناردووەتە ئێرە. بۆیە باشتر وایە لە ئێستاوە هەر شتێکی دەیزانی بیڵێی. من هیچم نەگوت. پرسیی، بۆچی بێدەنگی؟ گوتم جا چ بڵێم، مادام ئێوە هەموو شتێک دەزانن، گوتی من چ پێویستە. گوتی ئێمە دەمانەویّ لە زمانی خۆتەوە بیبیستین بزانین چەندە ڕاستگۆی. گوتم ڕاستییەکەی ئەوەیە من بە ویستی خۆم و بۆ خوێندن هاتوومەتە ئێرە. هێشتا چەند مانگێک نەبوو چووبوومەوە ئێران، ئیتر چۆن بۆ نیازی خراپ دێمەوە ئێرە. چ شتێک شتی وا دەکا؟ جاری یەکەم لەسەر بانگهێشتی خانەی فەرهەنگی سۆڤیەت هاتوومەتە ئێرە و ئێستاش وەکوو پەنابەرێک. هەر لە سنوور پەڕیومەتەوە، خۆمم بە یەکەم بنکەی سەربازی ناساندووە. تاوانی من ئەوەیە بە نایاسایی سنوورم بڕیوە. پێشم وانەبوو ئاوام بەسەر دیّ. ئێستاش کە ڕازی نین، بە کوێدا هاتووم،

بەویدا بمگێڕنەوە و ئەگەر سزایەکیشم دەدەن، ئەوە دەسەڵات بە خۆتانە.

گوتی، ئەو قسانە بێسوودن. باشتر وایە ڕاستییەکە بڵێی. گوتم ڕاستی ئەوەیە کە عەرزم کردی. جا خۆ کە هاتین بۆ ئێرە، بەتەنێش نەبووین، قەول وابوو لەگەڵ دوو خوێندکاری دیکە "سەدری و شەهریاری" بێینەوە. گوتی ئەی ئەوان بۆ نەهاتنەوە؟ گوتم ئەو سێکەسەمان لە پێشدا ویستمان بە گونبەدی کاوسدا بێینەوە. تا ئەویێ چووین، بەڵام جێبەجێ نەبوو. گەڕاینەوە تاران. بەڵام چونکە دۆخی من لە ئی ئەوان جیاواز بوو، بەتەنێ هەوڵم دا و لە ڕێی ئاستاراوە هاتمەوە.

گوتی ئەوانە هەموو حەقایەتن، بڵێ بزانم کێ ناردووتی؟ ئیتر بێدەنگ بووم و هیچم نەگوت. دیسان دووپاتەی کردەوە. من دیسان هیچم نەگوت. هەستا لە ژوورەکەدا کەوتە ڕاوێچکە و هات و چۆ. ئینجا کتوپڕ بەرانبەرم ڕاوەستا و هەموو هێزی خۆی شەپلاغەیەکی لێ دام. خۆم پێ نەگیرا و بەدیوارەکەدا کەوتم. بەرەولام هات دیسان لێم بدا، دانیشتم.

چۆوە سەر جێی خۆی و بە تووڕەییەوە گوتی، چما وڵاتی ئێمە شاری بێ دەروازەیە کە هەر کەس ویستی سەری پێدا بکا؟ گوتی لە ڕێی باڵوێزخانەوە لێم کۆڵیویەتەوە. لێرەش برادەرانی پێشووت هەرچی پێویست بووە گوتوویانە. بۆیە باشتر وایە ئاقڵ بی و هەر شتێک دەزانی پێمانی بڵێی، بەشکم بتوانم یارمەتییەکت بدەم. زەنگی لێ دا، پاسەوان وەژوور کەوتن. ئاماژەی دا بمبەن. بردیانمەوە ژوورەکەی خۆم. من لە هەمبەر ئەو زەبەلاحە بێ مێشکەدا،

لە مێشـــوولەیەکیش بچـووکـتـر بـووم. وەهــا بە ســـووکایەتییەوە ســــەیری دەکردم، خەریک بوو ببمە دڵۆپەیەک ئـاو. ئەوە یەکەم ڕۆژی لێپرســـینەوەم بوو. لەبەر خۆمەوە قســەکانیم لێک داوە. بەشـی یەکەمیان لە پێوەندی لەگەڵ باڵوێزخانەدا درۆیەکی پەتی بوو. مەحاڵ بوو باڵوێزخانە شـتێکی لەسـەر من گوتبێ. بەڵام لەسـەر قسەی برادەرەکانی پێشووم لە بادکوبە، لەوانەبوو وا بێ. بە دڵنیاییەوە هەر ئەو دەستەی کە بووە هۆی ئەوەی من بگێڕنەوە بۆ ئێرانێ، ئێستاش خەریکە چزووی خۆی هەر دەوەشـێنێ. ئەگینا لەخۆوە نییە ئاوا هەڵسـوکەوتم لەگەڵ دەکەن. یاســــاکانی زیندانی ئێم گ. ب بەو جۆرە بوو کە ڕۆژێ ســـێ جەمە خواردنیان دەداینێ. هیچ بەندییەکیش بە ڕۆژ بۆی نەبوو بخەوێ. تەنانەت حەقی نەبوو ڕاکشێ. هەر سەرپێچیت کردبایە، پاسەوانی ڕاڕەوەکە بەو کلیلەی پێی بوو توند لە دەرگاکەی دەدا و ئەگەر زیندانی گوێی نەدابــایە، دەرگــای دەکردەوە و دەهــاتە ژووری تێی دەخوڕی هەســـتێ و ئەگەر هەر بە قســـەی نەکردبایە، پاســـەوانەکانی دیکەی ئاگادار دەکردەوە، ئەوانیش لە زیندانییەکە بەر دەبوون و تا دەبزووت، تێیان هەڵدەدا. ڕۆژنەیەکی بچووک لە هەموو ژوورەکـان کرابوو، کە پاســـەوانی ڕاڕەوەکە بەدەم پیاســـەکردنەوە بەردەوام ســـەیری نێو ژوورەکـانی دەکرد و ئـاگـای لە دۆخی زیندانییەکە دەبوو. هەر شــەو تاریک دادەهات، گڵۆپی نێو ژوورەکەیان دادەگیرساند و تا بەیانی نەدەکوژاوە.

حەوتی شەوێ خەوتن و شەشی بەیانی کاتی لەخەوهەستانێ بوو. ڕۆژێ دوو جار، یەک یەک دەیانبردینە ئەو ئاودەستەی لەوسەری ڕاڕەوەکەوە بوو.

ئەو ڕۆژە پاش لێپرسینەوەکە، حەجمینم لەبەر بڕا. بەردەوام بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ چ بکەم؟ ئاخۆ بکەومە پاڕانەوە، یان قورس و قایم ڕاوەستم، هەر شتێک دەبێ با ببێ. بە دڵنیاییەوە لەو لێپرسینەوەیەدا کە من دیتم، تۆزکاڵێک سۆز و جوامێرییان نییە. بەزەیی تێدا نییە، کەوابوو پاڕانەوەی چی. ئینجا خۆ من هیچم نەکردووە تا بترسم. ئەوپەڕەکەی بەرم نادەن. دادگاش جگە لە سنووربەزاندن، لەسەر شتی دیکە حوکمم نادا. ئەوەش قبووڵمە تاوانێکە، کە لە نەزانینیەوە کردوومە و کارێکە خۆم کردوومە. وەختی خەو هات، لەسەر تەختەکەم درێژ بووم، دەمویست بخەوم. گوێم لە دەنگی کرانەوەی دەرگای ژوورەکە بوو. زیندانیی ژمارە ١٢٩ هەستە. پرسیم چی بووە؟ پاسەوان گوتی بانگیان کردووی بۆ لێپرسینەوە.

لە ژوورەکە هاتمە دەرێ. دیسان دوو پاسەوان ئەملاولایان گرتم و بردیانمە هۆدەی سەرهەنگ. ناوبراو زۆر بەکەیف دیار بوو. گوتی، دەی چۆنی؟ چاوەڕێم و ئەوە گوێم گرتووە تا ڕاستییەکان ببیستم. گوتم جەناب سەرهەنگ، من مامۆستا و خوێندکارێکی سادە بووم و هیچی دی. من لە ئێرانە تاقە ئاوات و ئارەزووم خوێندن بوو. هەر بۆیەش وەختێک بانگهێشتەکەی خانەی فەرهەنگی سۆڤیەتم لە ڕۆژنامەکاندا خوێندەوە، بە گیان و دڵ هەوڵم پێ دا و وەمزانی دەوڵەتی سۆڤیەت هەموو دونیای داوەتێ.

نازانم چۆن بوو، کام دەستی ڕەش منی گەڕاندەوە ئێران. دواییش کە دیتم هەرچی ئاوات و ئارەزووی خوێندنمە، بووەتە بڵقی ســەر ئاو، گەڕامەوە ئێرە. ئەویش تەنیا بەو هیوایەی بتوانم درێژە بە خوێنـدن بدەمەوە. لەم دنیـایە حەشـتەبای خودا شک نابەم. تاقە شـتێکی شـانازیی پێوە دەکەم، شـــەرافەت و ئابڕووەکەمە. بەڵام ئێوە دەتانەوێ ئەویشـــم خەوشـــدار بکەن و بوختانم پێ دەکەن، ەل حاڵێکدا من سـیخوڕیم پێ شـوورەییترین کردەوەیە. لەوە زیاتر هیچ قســـەیەکم نییە بیکەم. ئیدی پرســـیاری لێ نەکردم. شـەو لە نیوە لای دابوو من هەر وا بەسەر پێوە ڕاوەستابووم. خەو و شەکەتی بڕستیان لێ بڕیبووم. ئەو بۆخۆی هەر خەریکی نووســـین و چـاخواردنەوە و جگەرەکێشـان بوو. ئاخری لە زەنگی دا و پاسـەوان هاتن بردیانمەوە ژوورەکەم. لە ژێر تیشـکی توندی ژوورەکەدا و بەدەم دەنگی زرمەزرمی پێی پـاســـەوانەوە چەنـد سەعاتێک خەوتم.

وەختی خۆی بەخەبەریان هێنام. ڕۆژەکەی هیچ باس نەبوو. بەتاقی تەنێ لەو بەندە تەسکە سێ مەترییەدا هاتم و چووم. گاڵتە نییە زیاتر لە ١٢ سـەعات کاری ڕۆژانەت ئەوە بێ. لە بیرکردنەوەش بێزار ببووم. بەنـدی، حەزی لێیە هەموو ڕۆژێ بیبەنە لێپرســـینەوە. ئەوە بۆخۆی هەواگۆڕینێکە. لانیکەم تەنیـایی و بیرکردنەوەی لەکۆڵ دەبێتەوە. ڕێک ســـەعات ٨ی شـــەو، لە وەختی خەوێدا دیســـان دەرگای ژوورەکەیان کردەوە و بردیانمەوە لای

سەرهەنگ. هەر بەو سمێڵە زل و پشتەسەرە پانەیەوە، لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو. سەری هەڵبڕی و گوتی دیسان هیچ ناڵێی؟ بێدەنگ بووم. پرسیی: عەزیزی گەیلانیزادە دەناسم؟ گوتم بەڵێ ئەو لەو گەنجانە بوو کە لەسەردەمی خوالێخۆشبوو قازی محەمەددا هاتبووە بادکوبە بۆ دەورەی سەربازی. ئینجا ئەویان هێنایە پانسیۆن.

گوتی: لە ئێرانیش دەتناسی؟

گوتم نەخێر، لێرە ناسیم.

گوتی: چ شتێک لەسەر ڕابردووی دەزانی؟

گوتم: گۆیا لە عێراق ئەفسەری سوپا بووە و دوایی هاتووەتە ئێران و بووەتە ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

گوتی: چیی دیکەشی لێ دەزانی؟

گوتم: دەشزانم باوکی لە ورمێ دەژی و یەکێکە لە پیاوانی گەورەی میللی مەزهەبیی کورد.

گوتی: مەبەستم ئەو قسانە نیە. هەموو کەس ئەو شتانە دەزانێ. لە چالاکییە نهێنییەکانی چ دەزانی؟

سەرم سوور ما و گوتم قەت شتی وام لێ نەبیستووە. دڵنیاش بووم سەید عەبدولعەزیزیش لە سۆنگەی سکاڵا و ڕاپۆرتی ناڕاستی خەڵکی دیکەوە گومانی لێ کراوە. خوا دەزانێ چیی بەسەر هاتووە.

ئیتر قسەی لەگەڵ نەکردمەوە. دیسان تا دووبەتڵی شەو ڕاشکا هەر وا بە پێوە ڕاوەستابووم. لە زەنگی دا، ئەمری کرد بردیانمە ژوورێکی دی. لەوێش ئەفسەرێکی گەنج دانیشتبوو خەریکی نووسین بوو. بەرەبەری بەیانی

بردیانمەوە ژوورەکەم. لە ڕێیە کە دەگەڕامەوە ژووری، پێڵووم کەوتبوونە سەر یەک. نازانم چۆن و چەند خەوتم، دیسان سەعات شەشی بەیانی بەخەبەریان هێنام. دەنگی کلیلە قورسەکانی پاسەوان وەکوو کوتکی ئاسن لە گوێمدا زرینگانەوە. وردە وردە هێزی بیرکردنەوەشم لەدەست دەدا. بێخەوی توانای بیرکردنەویە لێ بڕیبووم. جگە لە پیاسەکردن لەو بەندە تەسکەدا و دانیشتن لەسەر تەختە ئاسنەکە، هیچ کارێکی دیکەم نەبوو.

دیسان شەو هاتەوە و کەوتمەوە دڵەکوتە. دیسان لە وەختی خەوێدا بردیانمەوە ژووری سەرهەنگ. سەرهەنگ پێی وابوو بە بێخەوکردنم دەتوانێ بەچۆکمدا بێنێ. ورەم پێ بەر بدا. بەبێ ئەوەی تەنانەت یەک وشەشم لێ بپرسێ. زیاتر لە دوو سەعات بە سەر پێوە ڕایگرتم. دیسان ئەمری کرد بردیانمە ژوورێکی دی. لەوێ سەرگوردێک دانیشتبوو. فەرمان کرابوو بەسەر پێوە ڕامگرێ و نەهێڵێ بخەوم. بەڵام من بەدەست خۆم نەبوو پێڵووم پێکدا دەهاتن. هەموو جارێ کە سەرگورد ئاگای لێم بوو، بە دەستەکلیلەکە لە شووشەی سەر مێزەکەی دەدا. ئەو شەوەش دوو بەتڵی شەو ڕاشکابوو کە هێنایانمەوە ژوورەکەم.نەمدەزانی سەرهەنگ و لێکۆڵەرەکانی دیکەش دەخەوتن یان بە ڕۆژ بێخەوییەکەیان قەرەبوو دەکردەوە. جارێکیان شۆرەتی سەرهەنگەکەم لە پاسەوانەکە بیست. شۆرەتی پادارۆڤ بوو. لە سبەینێکەیەوە ئەمری کرد بەشە خواردنی من

کەم بکەنەوە. ئەمجارە پرسیەتیش هاتە سەر بێخەوییەکەم. دوو حەفتە لەو ڕووداوە تێپەڕی، جا یان سەرهەنگ خۆی ماندوو بوو، یان دیتی هەوڵەکانی بێسوودن. شەوانی لێپرسینەوەی کردە حەفتەی سێ شەو. لەو ماوەیەدا تەواو لاواز ببووم. شەوێکیان کە بردیانمە ژوورەکەی، سەیرم کرد لەسەر مێزەکەی سینییەک پڕ لە مریشکی سوورەوەکراو و کەرە و مرەبا و چا دانراوە. هەر چوومە ژووری، دەستی بە خواردن کرد. من لە گۆشەیەک ڕاوەستابووم و سەرم داخستبوو. ئەویش بە ئانقەست جاروبار بانگی دەکردم بۆ ئەوەی سەیری خواردنەکەی بکەم. دەیزانی برسیم. ئەمجارە ویستی بەو شێوازە وەقسەم بێنێ. یەک دوو جاریش بە ڕواڵەت خولقی کردم. دەیگوت وەرە بخۆ. منیش دەمگوت ئاغای سەرهەنگ تێرم لە سایەی سەرتانەوە خواردنی تەواوم دەدەنێ. تیزەبزەیەکی دەهاتێ، دەیزانی بە تەوسەوە وا دەڵێم.

شەوێکیان ڕاستەوخۆ بردیانمە ژووری سەرگورد. هەر ئەوەندەی لێ پرسیم تەمەنم چەندە و تا چ ساڵێک لە کۆلێژی پزیشکی خوێندوومە. لیی پرسیم ئاخۆ لە ماوەی خوێندندا فێرە ڕووسی بووم؟ گوتم بەڵێ. گوتی دیارە بەینت لەگەڵ کچانی ڕووس خۆش بووە؟ بەناچاری گوتم بەڵێ وایە. نیوەشەوێ کە دەیویست بمبەنەوە ژوورەکەم، گێڕامییەوە و گوتی وا باشترە بەزەییت بەخۆتدا بێتەوە، ئەگینا لێرە بەزیندووی دەرناچی. گوێم دەی باشتر، با لەو نەگبەتی و چارەڕەشییە ڕزگار بم.

من هەموو ڕۆژێ، دەمژمارد چەند ڕۆژە لەوێدا بەندم. چل و پێنج ڕۆژ بوو لەو ژوورە تاکەکەسییەدا بەند کرابووم.

لاوازی و بێهێزی، بێخەوی و برسـیەتی پرزەیان لێ بڕیبووم. هیوام بە ژیان نەبوو. ئیتر هیچ شتێک بەلامەوە گرینگ نەبوو. مەرگ و ژیان بەلامەوە وەک یەک بوو.

شەوێکیان بردیانمەوە ژووری سەرهەنگ پادارۆف. وەکو جارانی پێش، خەریکی خواردن بوو. پێم وایە ئەوانە بە ڕۆژ دەخەوتن و شەوانە خەریکی لێپرسینەوە دەبوون و ئەو نانەی ئێستا دەیخوارد، نانی بەیانیی بوو. ئاوا هەم خۆی تێر دەکرد و ئەم زیندانییەکەی ئەشکەنجە دەدا. بنیادەم دەبێ زۆر بێویژدان و بێبەزە بێ تا بتوانێ لەبەردەم کەسێکی برسیدا بەبێخەمی نان بخوا. پێم وابوو ئەو بوونەوەرەی ناوی مرۆڤە و سەرهەنگێکی کۆمۆنیستە، بۆنی دونیای مرۆڤایەتیی بەسەردا نەهاتووە. ئەگەر مانای کۆمۆنیستبوون ئەوەیە، ئەگەر کۆمۆنیستەکان خەڵکێکی ئاوا دڵڕەق و بێبەزەن، تف و لەعنەت لە کۆمۆنیزم. من هەر پێم باشترە ئازادم نەکەن. نەکا لە نێو ئەوانەدا وەک ئەوانەم لێ بێ. هەرچی زانست و زانیاری و خوێندنە، تۆزکاڵێک مرۆڤبوون ناهێنێ.

بوون بە مەلا ئاسانە

بوون بە مرۆڤ گرانە

## سیخوڕ لە زیندان

کابرا کە لە نانخواردنەکەی بۆوە، جگەرەیەکی داگیرساند و گوتی باشـــتر وایە واز لە کەللەڕەقی و دوژمنایەتیی ئێمە بێنی. گوتم، ئەگەر من دوژمنـــایەتیم لەگەڵ ئێوە بوایە، نەدەهاتمە لای ئێوە. گوتی، باشــــە چ شـــتێک لەبارەی مەلا مســتەفا بارزانییەوە دەزانی؟ دەیناسـی؟ گوتم، کەس نییە لە کوردسـتان نەیناسـێ. کەسـانی مەزن و ناودار هەموو کەس دەیانناســـێ. من مەلا مســـتەفا بە پاڵەوانێکی کورد دەزانم. پاڵەوانێک کە دەبێ گەلێ حەماسەی بۆ بهۆنرێتەوە. گوتی بە ڕواڵەت وایە. گوتم ڕواڵەت و ناخی نییە. کەسـێکی کە گیانی خۆی بۆ میللەتەکەی لەسـەر بەری دەسـتی دادەنێ، ڕواڵەت و نـاخی یەکە. بزەیەکی هـاتێ. ویســـــتی بڵێ وا نییە بەڵام بێدەنگ بوو. گوتم وا دیارە گێچەڵێکیان بۆ ئەویش ناوەتەوە. ئیتر هیچ قســـــەیەک نەکرا. من وەک هەموو جارێ تا نیوەی شەو بەسەرپێوە وێستام. ناردمییەوە سلوولەکەم. ماوەیەک لەوێ ئیدی کاریان بەســــــەرمەوە نەبوو. نە بەیانیان و نە شـــەوانە. وردە وردە هاتمەوە سـەرخۆ. ئەگەر دۆخەکە ئاوا بەردەوام بوایە، تەندروســــتیم لەدەســــت دەدا. هەڵبەت ئێســـتاش بوونەوەرەکەی جاران نەبووم. جاروبار شـــەوانە دەیانبردمەوە ژووری سـەرهەنگ یان سـەرگورد، بەڵام زۆر بەهەندیان وەرنەدەگرت. پاش چەند پرســـــیار و وەڵامی بێ مانا دەیانبردمەوە ســــلوولەکەم. چوار مانگێک ئاوا تێپەڕی. من هەر وا لەو ســــلوولەدا بەتەنێ بووم. ڕۆژێکیـان پاش بەرچایی دەرگای سـلوولەکەم کرایەوە. پاســـەوانەکە گوتی،

کەلوپەلت هەڵگرە. جگە لە کەوچکێک و پەرداخێک هیچم نەبوو. گوتی هەڵیانگرە. دەرگایەکی لە ڕووبەڕووی سلوولەکەم کردەوە و پێی گوتم برۆ ژووری. هۆدەیەکی گەورەتر بوو لە سلوولەکەی خۆم. دوو تەختی خەوی تێدا بوو، بەڵام هەردووکیان بەتاڵ بوون. کەسی لێ نەبوو. یەکێکیانم گرتەوە، بەڵام باشە بۆچی هێنایانمە ئەو سلووڵە؟ نەمدەزانی. هەرچۆنێک بێ دوو ڕۆژان لەو سلووڵە دوو کەسییەدا بەتەنێ بووم و هەر چاوەڕێ بووم یەکێک بێننە ژووری. سێیەم ڕۆژ پاش بەرچایی پیرەپیاوێکیان هێنا. تەمەنی شێست ساڵ دیار بوو. پێکەوە ئاشنا بووین. گوتی ناوم ڕەسوولۆفە. بە ئاواتەوە بووم هاودەنگێکم بۆ پەیدا بێ. لە تەنیاییدا خنکابووم. لەگەڵ دارودیوار قسەم دەکرد. جاری وابوو دەمگوت ڕەنگە شێت بووبێم. پێنج ڕۆژان پێکەوە بووین. ئەو باسی ماڵومنداڵ و ژیانی خۆی و هەموو شتێکی کرد. گوتی بۆیە گیراوە، گۆیا لە بەرەی جەنگی پۆلۆنیا، لەگەڵ کۆمەڵێک سەربازی سۆڤیەتی لەلایەن سوپای ئەڵمانیاوە بەدیل گیراون و ڕایانگواستوونەتە پشتەوەی شەڕگە و تا کۆتایی دووەم جەنگی جیهانی لە زیندانی ئەڵمانی نازیدا بووە.

پاش کۆتایی شەڕ و دەرکردنی لێبوردنی گشتی لەلایەن سۆڤیەتەوە، گەڕاوەتەوە نیشتمانی خۆی. دەیگوت دەوڵەتی سۆڤیەت خەڵەتاندینی بەو لێبوردنە گشتییە هەموو دیلەکانی شەڕی نێو ئاڵمانی هێنایەوە وڵات.

چونکه بەپێی یاسای یەکیەتیی سۆڤیەت، بەدیلگیران تاوانە و هیچ ســەربازێک نابێ بەدیل بگیردرێ. دیلەیەتی ســزای قورســی هەبوو، هەر بۆیەش دیلەکان دەترسـان بگەڕێنەوە. بەڵام بەو لێبوردنە گشتییە ترسـەکە ڕەوییەوە. پاش ئەوەی هەمووان گەڕاینەوە وڵات، بێ ئـاوارتە، هەر هەموومـانیـان گرت و دادگاییان کردین و سزا دراین. یەکی ٢٥ ساڵیان بۆ بڕینەوە. باشە لە وڵاتی ئێمە سێدارە نییە. منیشیان دادگایی کرد و حوکمیان دام. لەو ڕۆژانەدا دەمنێرن بۆ ئۆردووگای کاری زۆرەملی. گەلێ چیرۆک و بەســەرهاتی لەســەردەمی دیلەتیی خۆی دەگێڕاوە. دەیگوت ئەودەمی لە ئۆکرانیا بووم، لەشـــکرەکەی ئێمە بە هێرشـــێکی چـاوەڕواننەکراوی ئەڵمـانییەکـان تێک شـــکا. ئەوی توانیی هەڵات. من خۆمم گەیاندە گوندێک. جلە ســەربازییەکانمم داکەند و دەســتێک جلی کرێکاریم لەبەر کرد. ڕۆژانە لەگەڵ کرێکاران خەریکی کار بووم. کچێکی جوان لە نێوماندا هەموو ڕۆژێ خۆی لە تـافی گوڵ دەدا و خۆی دەڕازانـدەوە. تێی خوڕیم گوتم وا مەکە. ئەگەر ئەڵمـانییەکـان ببینن، لەگەڵ خۆیـان دەیبەن. بەڵام بەگوێیـدا نەدەچوو، تـا ئـاخری ڕۆژێـک چەنـد ئەڵمانییەک هاتن و قسەکەم وەڕاست گەڕا و بردیان. کچە پاش چەند ڕۆژان هاتەوە. دیســـان وەک جاران کەوتەوە خۆجوانکردن. چەنـد ڕۆژێـک دواتر، کۆمەڵێـک ئەڵمـانیی دیکە هاتن و دیسـان لەگەڵ خۆیان بردیان. بەڵام ئەوجارە کچە نەهاتەوە. وا دیار بوو ئیدی لەلایان مایەوە. بەو قسە و بەســـەرهاتانە وای لێ کردم متمانەی پێ بکەم. منیش بەسـەرهاتی خۆمم بەپوختی بۆ گێڕاوە. لە دۆخی ئێران و

چۆنیەتیی ژیانی خەڵک. وای دەنواند دڵســـــۆزی منە و بەزەیی پێمدا دێتەوە. ڕۆژێکیان گوتی، وەکوو باوکێک ئامۆژگاریت دەکەم. تۆ نازانی، ئەوانە چۆن کەسێکن، تا ئیعترافێکی بەدرۆت لێ وەرنەگرن، بەرت نـــادەن و لەکۆڵت نابنەوە. ئەوانە بۆ ئیعترافوەرگرتن لە زیندانی، پاداشــــت وەردەگرن. کاریشـــــیان بە ڕاســــت و درۆی ئیعترافەکە نییە. تۆش درۆیەک بکە و خۆت ڕزگار بکە. گوتم بۆ وێنە بڵێم چی؟ گوتی ناوی یەکێک بڵێ کە تۆی ناردووە.

گوتم چما دەکرێ بەکەیفی خۆت ناوێک بڵێی؟ گوتی، هیچ ئەفســــەرێکی ســــوپا ناناســـــی؟ لەو ئەفســـــەر و دەرەجەدارە گرینگانەی نـاوبـانگێکیـان هەبێ؟ گوتم ئەی دوایی؟ گوتی بڵێ ئەو نـــاردوومی بۆ ئەوەی ڕاپۆرت ئـامــادە بکەم لێرە و بۆ ئێرانی بنێرمەوە. گوتم مەگەر ناپرسن ئەو ڕاپۆرتانەت چۆن و لەکێ وەرگرتووە؟ گوتی ئیدی کارت بەو بەشـــــەی نەبێ. ئەوانیش لەوە زیاتریان لێت ناوێ. گوتم، ئیعترافی تۆ لەگەڵ ئی من فەرقی هەیە. تۆ ئیعترافت بە شتێک کردووە کە ڕاستە، بەڵام من چۆن دەتوانم ئیعترافی بەدرۆ بکەم. ئەی دوای ئەوە؟ وەکوو تۆ بیست ساڵ زیندانم بۆ دەبڕنەوە. گوتم، ڕەسوولۆف، عەیبە ئەو ڕێچکەیەم پێشـان دەدەی لەبری ئەوەی وانەی ڕاســـتگۆییم فێر بکەی، دەتەوێ تاهەتایە ڕووڕەشـــم بکە. گوتم تەنانەت لێرەدا بشـــــڕزێم، درۆیەک ناکەم و مل بۆ ئیعترافی وا بێبنەما ڕاناکێشم. با بەرم نەدەن، پێم باشترە

بمرم، بەڵام حەیـای خۆم نەبەم. من بۆ کـارێکی پیرۆز هـاتووم، لێگەڕێ بـا لەپێنـاو بیروبـاوەڕەکەمـدا بمرم. لێمـان بوو بە مشـتومڕ و ئەوجار بەسـەر یەکتردا دەمانگوڕاند. من شەرمم دەکرد دەست لەوپیرە هەڵێنمەوە. گوتم، نامەرد، تۆیـان بەتـایبەتی نـاردووەتە ئێرە تـا بمخەڵەتێنی. تف لەوڕووەت سـووکی بێنرخ. پاسـەوانەکە پێم وایە لەپشـت دەرگاوە هەسـتی لێ ڕاگرتبووین. هەر زانیی لێمان بووەتە مشـتومڕ و لەوانەیە لێک بدەین، دەرگای کردەوە و گوتی: ئەوە چ باسـە؟ پیرەپیاو گوتی: ئەو گەنجە دەیەوێ بمکوژێ. لێرە بمبەنە دەرێ. هەر ئەوەی گوت و هەسـتا چووە دەرێ و پاسـەوان دەرگای لەسـەر داخسـتمەوە. دڵنیا بووم ئەو پیاوە ئەرکدار کراوە و بەتایبەتی نێردراوەتە ژوورەکەی من.

شوکرانەبژێرم نەخەڵەتام و بەناحەق پەڵەم لەسـەرشـانی خۆم نەدا.

# کارتسێر

بۆ سبەینێ بردیانمە لای پادارۆف. ئەو هەر منی دیت، گوتی، فێری ملهوڕییش بووی. بەتەما بووی پیرەمێردێک لە ئێم گ. ب بکوژی. گوتم نەخێر، بەهیچ شـێوەیەک من دەسـتی خۆم بەخوێنی بنیادەمێکی وا بێنرخ پیس ناکەم. تەنیا تێم گەیاند لە مرۆڤێک ناوەشـێتەوە زیندانی بخەڵەتێنێ. باش بوو نەکەوتمە ئەو تەڵەو داوەوە کە بۆی نابوومەوە. زەنگی لێ دا. دوو پاسـەوان هاتن. پێی گوتن ئەو زیندانییە ببەنە کارتسـێر با سـێ ڕۆژ لەوێ بێ. پاسـەوان بردیانم. نەمدەزانی کارتسـێر چییە و کوێیە کە دەیانەوێ بمبەنە ئەوێ. بەڵام هەسـتم کرد دەبێ ئەشـکەنجەگا بێ. هەر لەو ڕاڕەوەی نهۆمی دووەم، پاسـەوانەکە دەرگای سـلوولێکی کردەوە و پاڵی پێوەنام بۆ ژوورەوە. سـلوولێکی بچووک بوو. تەنیا تەختێکی ئاسـنی بەبێ دۆشـەگ و بەتانیی تێدا بوو. لە یەکەم سلوول تاریکتر و تەسکتر. من لە گۆشەی تەختەخەوەکە دانیشـتم. لەوپەڕی چارەڕەشـیدا دڵخۆش بووم کە سـەربەرزانە لەو داوە ڕزگار بووم. دەلاقەی سـلوولەکە کرابۆوە، بەڵام زۆر بەرز بوو. بایەکی فێنک لەلای دەریای خەزەرەوە دەهاتە ژوورێ. سەرەڕای ئەوەی هەوا هێشتا سـارد نەبۆوە، هەسـتم بە سـەرما و تەزوو دەکرد. جلەکانیشـم هەر ئەو پیژامەیە بوو کە لەوێ دابوویانمێ. ناچار هەستام کەوتمە هاتوچۆ و جووڵەی نەرمەوەرزش، بەڵام فایدەی چی، خۆ گەرم دانەدەهاتم. تین و وزەی

وەرزشیشم نەمابوو. شەوێ بەتانییەکیان بۆ خستمە ژووریّ. بەتانییەکەم لەخۆم وەرپێچا و لەسەر عەرزەکە ڕاکشام. چونکە سەر عەرزەکە لە تەختە ئاسنەکە باشتر بوو. لە نێوان خەو و بەخەبەریدا تا بەیانی هەڵبەرزیم. ئەی ئەو کەسانەی کە دنیای کۆمۆنیستیتان نەدیتووە، تەشریف بێنن و ببیبنن. هەرگیز توانای ئەوەم نییە ئەو هەمووە نەگبەتی و موسیبەت و بەڵایەی لەو سلوولەدا کە ناوی کارتسێر بوو بەسەرم هات، شەرح بدەم. لە شەو و ڕۆژێکدا تەنیا جەمێکیان نان دەدامیّ، ئەویش دوانیوەڕۆیان کە بریتی بوو لە قاپێک بڕوێش و چەند پارووەک نانی ڕەش. سێیەم ڕۆژ کە دوا ڕۆژی سزادانم بوو، تووشی سکچوونێکی سەخت هاتم. لەبەر ژانی سکم جینگڵم دەدا. پاسەوانی بەردەرگا گوێی لە ناڵینم بوو. دەرگای کردەوە و پرسیی ئەوە چییە؟ گوتم ئیسهال بووم. سکم دێشیّ. ئەگەر دکتۆرێک نەیەتە سەرم، دەمرم. لەلایەکەوە بێ تین و تاقەتی و لەلایەکەوە سەرما تەنگیان پێ هەڵچنیبووم. پاسەوانەکە چوو. تاوێک دواتر پیاوێک بە جلێکی سپییەوە هاتە ژووریّ. گوتی چ بووە؟ گوتم دکتۆر فریام بکەوە، ژانەسکم گرتووە و سکچوونێکی قورس. چەند ساتێک دواتر حەبێک و پەرداخێک ئاویان دامیّ. نیو سەعاتێکی برد، ژانی سکم تۆزێک دامرکایەوە. سکچوونەکەش تۆزێک کەم ببۆوە. هێشتا نەببووە عەسر، کە بردیانمە دەریّ و بردیانمە ژوورێک، سێ کەسی لێ بوو. تەختێکیش بەتاڵ بوو. من هەر سڵاوم کرد، خۆم پێ نەگیرا و لەسەر تەختێک ڕاکشام. سەرەڕای ئەوەی ڕاشکان قەدەغە بوو، بەڵام پاسەوانەکە

هیچی نەگوت. سێ کەسەکە لێم کۆ بوونەوە و من بەسەرهاتەکەی کارتسێر و نەخۆشکەوتنەکەمم بۆ گێڕانەوە. هەموو خەمیان لێ خواردم. بەو حەبانەی کە لە کاتی فراوین و ئێواریدا دایانمێ و نانیان دامێ، تۆزێک هاتمەوە سەرخۆم و لەگەڵ هاوژوورەکانم ئاشنا بم. بەزمەکەی ڕەسوولۆڤ جگە لەو سێ ڕۆژ ئازارەی کارتسێر، نەک زیانێکی بۆم نەبوو، بگرە بووە هۆی ئەوەی لە تەنیاییش ڕزگار بم. ئێستا سەرەڕای هەموو خەم و ناڕەحەتییەکانم، لانیکەم چەند کەسێک هاودەنگ و هاودەردم هەبوو. ڕۆژانە تەواو سەرقاڵ بووین. هەر کام باسی ژیان و بیرەوەریی خۆمان دەگێڕاوە. هەقایەت و پەندی پێشنینیان و قسەی نەستەق، چێژەی قسەوباسی ڕۆژانەمان بوون. لە کوردیدا مەسەلێک هەیە دەڵێن مردن لەگەڵ دۆستان، جێژنەیە (مەرگی بەکۆمەڵ جێژنە)، هەر ڕۆژە و یەکێکیان دەبرد بۆ لێپێچینەوە، بەڵام ئیدی کاریان بە من نەبوو. مانگێک دەبوو نەیانبردبووم بۆ لێپێچینەوە. هاوژوورەکانم دەیانگوت تۆ کارت یەکلا بووەتەوە، بێ ئەملاوئەولا بەو زوانە تەکلیفت ڕوون دەبێتەوە. پیرەپیاوێکی شێست ساڵانەی خەڵکی ئۆکراینمان لەگەڵ بوو. پیاوێکی قسەخۆش بوو. یەکێک بوو لە دیلەکانی شەڕ. دەیگوت: دەوڵەتی سۆڤیە بە بڕینەوەی ٢٥ ساڵ زیندانی، تەمەنی منی تا ٨٥ ساڵی دەستەبەر کردووە. دەی باشتر. زۆرم پێ خۆشە بچمە سیبریا. دەڵێن ژنی ئەوێ سپیوسۆڵ و نەرمونۆڵن. منیش نەماوم بۆ ئەو

جۆرە ژنــانە. دەیگوت لێپێچینەوەی من ڕۆژێــک پتری نەخایاند. هەر ئاڵمانییەکان گەیشـــتنێ، من دەســـتم بەرز کردەوە. لێکۆڵەر پرســـیی بۆچی نەتکوشـــتن؟ گوتم دەرەتان نەبوو. پرسـیی ئەی بۆچی خۆتت نەکوشـت؟ گوتم مەگەر شـێتم؟ لێکۆڵەر گوتی کەوابوو ٢٥ ســاڵ چاوەڕێتە. گوتم بەو هیوایەی ٢٥ ساڵی دی زیندوو بم.

گەلێ بەســەرهاتی شــاعیران و نووســەرانی ڕووســی دەگێڕاوە. پێی گوتم تۆ هەر خەم مەخۆ. بچیتە هەر شوێنێک پڕە لە کچ و ژن. بەتایبەتی کچی ڕووســی، هەر فیکەیان بۆ لێ بدەی دێن. زۆر بەسۆز و نەرمونیانن. بە سڵاوێک دەبنە دۆســـتت. ئەو کابرایە لە هیچ شـــتێکیش نەدەترســـا. زۆر نەترسانە قسەی دەکرد. یەکێک لێی پرسی، ئیڤان ڤاسیلیڤیچ، تۆ ژنت هێناوە؟ گوتی زۆر. لێی پرســـی، منداڵیشـــت هەیە؟ دیســـان گوتی هەر زۆر. ئەوجار لێیان پرســـی، ئەی بۆچی کەس نایە لێت بپرسێ و هیچ شتت بۆ ناهێنن؟ وەڵامی داوە، کوڕە ئاخر ژنی ســەرپێیی و منداڵی حەرامزادە و زۆڵ لەوە باشـــتریان لێ دەرناچێ. نەوەی کۆمۆنیســـت هەموو ئاوان. هەڵبەت ئەو قســـەی بۆیە دەکرد، چونکە لە ئێم گ.ب زۆر ناخۆشـــی لێ گوزەرابوو. بۆخۆشـــی دەیگوت قســـەکانی من زیاتر گاڵتەن.

## یەمیلیانۆڤ، وەزیری ئێم.گ.ب لە باکۆ

چاوەڕوانیم بڕایەوە. ڕۆژێکیان بردیانمە ژووری سەرهەنگ پادارۆڤ. هەر وەژوور کەوتم، پادارۆڤ هەستا و فایلێکی خستە بن باڵی و پێی گوتم وەدووی بکەوم. ئاگات لە زمانت بێ، دەچینە لای وەزیر. شانسی خۆت تاقی بکەوە. گوتم خوا لە منی بێبەختتر دروست نەکردووە. چۆنی تاقی بکەمەوە. گوتی پێوەندیی بە قسەکردنی خۆت و ئەو فەرمانەوە هەیە کە وەزیر دەری دەکا. لەو ڕاڕەوە ڕازاوەیەدا، پادارۆڤ لەپێش دەرگایەکی جوان کە لەپشتەوەڕا چەرمێکی خۆشڕەنگیان لێ دابوو، ڕاوەستا. تۆزێک خۆی ڕێک خست و وەژوور کەوت و منیش بە شوێنیدا. هۆدەی سکرتێری وەزیر بوو. خاتوونێکی گەنج لە پشت مێزێک دانیشتبوو و چەند تەلەفۆنێک لەسەر مێزەکەی بوو. خاتوون هەر ئێمەی دی، بیستۆکەی یەکێک لە تەلەفۆنەکانی هەڵگرت و چەند شتێکی گوت. ئینجا دایناوە و گوتی فەرموونە ژووری. پادارۆڤ، لەسەرخۆ ئەو دەرگایەی کە دەهاتەوە سەر ژووری سکرتێر، کردەوە. ژوورێکی تا ڕادەیەک گەورە بوو، مێزێکی گەورە و جوان لەلای سەرووەوە دانرابوو. پیاوێیک ڕەقەڵەی دەستە لە پشت مێزەکەوە هەستایە پێ.

سەرهەنگ پادارۆڤ سڵاوی سەربازیی کرد. بەڵام من ئیدی سڵاوم لە هیچ ئەفسەر و لێکۆڵەرێک نەدەکرد. چونکە هیچیان سڵاویان نەدەستاندمەوە. لەلایەکی

ژوورەکە، خانمێکی زۆر گەنج و جوان لەپشـــت دەزگایەکی تایپ دانیشـــتبوو. کابرا کزەکە بە جلوبەرگی ســـەربازی و دەرەجەی ژەنرالیيەوە، یەمیلیـانۆڤی وەزیری تەنـاهیی حکوومەتی ئازەربایجان بوو. وەزیری (ئێم.گ.ب)، قەڵافەتێکی رووسـیی رەسـەن. بە دەم پیاسـەکردنەوە بەرەوڵام هات و پرســـیی، رووســـیی دەزانی؟ گوتم تا رادەیەک. گوتی زۆر باشــە. ناو و شــۆرەت و تەمەن و نەتەوەکەت بڵێ. هەمووم گوتن. گوتی چیت لێ دەپرســـم راســـتگۆیانە وەڵام بدەوە. چۆن هـاتی؟ گوتم لە تـاران لێم روون بۆوە دەوڵەتی ئێران نەک هیچ شـــتێکمـان بۆ نـاکـا بگرە لەوانەیە تووشـــی گێچەڵیشمان بکا، بۆیە بڕیارم دا بگەڕێمەوە ئێرە. گوتی ئەی بۆچی جگە لە تۆ کەســـی دی نەگەڕاوەتەوە؟ گوتم بۆ ئاگاداریت ئێمە چوار کەس بووین قەول بوو پێکەوە بێینەوە. پرســـیی کێ بوون؟ گوتم زولفەقـاری و ســـەدرییە و شـــەهریاری. ئەو دوانەیـان تەنانەت تـا گونبەدیش لەگەڵم هاتن، بەڵام لەوێوە نەمانتوانی. خەسـرەو باوکی هاتە تاران. دواییش چونکە دۆخی گیرفـان و دارایی من لەوان جیـاواز بوون و هیچ خزم و کەسێکم نەبوو و ئەوەی ماڵ و سامان بێ، شـکم نەدەبرد، بەتەنێ رێیەکەم گرتە بەر. هاتمە رەشـت و ئاستارا و ئینجا لەسنوور پەڕیمەوە و دەمودەست خۆمم بە بنکەی پاسەوانیی سنوور ناساند. گوتی مەگەر نەتدەزانی هاتن بۆ ئەم وڵتە بەبێ ئیجازە و رەزامەندیی پێشـوو، تاوانە؟ گوتم هەم نەمـدەزانی، هەمیش پێم وانەبوو ئـاوا بێ. گوتی مەگەر نازانی ئێمە لەگەڵ هەموو جیهان لەشەڕ و خەباتداین و لەبارەی هاتنی کەســـەکانەوە، ئەوپەڕی پارێزی خۆمان

دەکەین. گوتم پێم وابوو لەو خەباتەدا پێویستتان بە میللەتانی دیکەش هەیە. گوتی، جا باشە ئێمە چۆن بزانین ئەو شتانەی تۆ دەیانڵێی هەموو ڕاستن؟ گوتم من زۆر لەسەر ئەوە سوور نیم چیتان پێخۆشە لێم بکەن. تەنیا یەک تکا و داوام هەیە، لەخۆوە پەڵەم پێوە مەدەن و ناوم مەزڕێنن.

بیرێکی کردەوە و گوتی، باشە بۆچی وەختێک پێت گوترا پاسپۆرتەکەت بدڕێنە، وات نەکرد؟ گوتم ئاخر ئەودەمی پێم وابوو پاسپۆرتت پێ بێ، لە هەموو لایەکەوە بەسوود و باشە. ئێمە خۆ بەتەما نەبووین تاهەتایە لە وڵاتی ئێوە بمێنینەوە و دەوڵەتی سۆڤیەتیش لێرە هیچ پێویستی بە ئێمە نەبوو. بەڵام ئێمە ببووینە چقڵی چاوی هێندێ کەس. ئەوە ئێستا بەوە دەزانم. گوتی، هێندێ کەس وەک کێ؟ گوتم: لەوانەی لای خۆمان و ئەندامانی فیرقە. چونکە ئێمە هەم پاسپۆرتمان هەبوو و هەم لە خوێندنیش لەپێش ئەوانەوە بووین. یەمیلیانۆڤ چووە پشت مێزەکەی.

لەو ماوەیەدا خاتوونی سەر مەکینەی تایپەکە، پێم وایە ئەو قسانەی هەموو تایپ کرد. یەمیلیانۆڤ ئاماژەی بە سەرهەنگ پادارۆڤ کرد لەگەڵ خۆی بمبا. سەرهەنگ گوتی با بڕۆین. هاتینە دەرێ. کە چووینە دەرێ، سەرهەنگ پێی گوتم، تێکت دا، دەبوو لەبەردەمی ئەژنۆ دابدەی و لەبەری بپاڕێیەوە. ئەو هەموو شتێکی لەدەست دەهات. گوتم مەگەر قەول وانەبوو ڕاستییەکان بڵێم؟ ئینجا خۆ هیچ درۆم نەکرد.

# بڕیاری ئەنجومەنی میری

کە گەڕامەوە سـلوولەکەم، ئەو قسـانەی بە یەمیلیانۆڤم گوتبوون، لەبەرخۆمەوە تاوتوێم کردنەوە و شـیم کردنەوە. هەر بەڕاسـت دەبوو وەکی پادارۆڤ دەیگوت، دەبوو وا بکەم؟ ئەژنۆم دادابایە و پاڕابامەوە؟ تۆ بڵێی وام کردبایە کاریگەریی هەبوایە؟ گوتم بەخوای کاری باشـم کرد ئەژنۆم دانەدا و نە پاڕامەوە. ئەو هێندێ پرسـیاری کرد و منیش ڕاسـتگۆیـانە وەڵامم دانەوە. پەروەنـدەی منیش هیچ خراپەیەکی تێدا نییە. هەر دادگـایەک تـاوتوێی بکـا، لەخۆوە مەحکوومم ناکا و حوکمم نادا. ئەوە من بێخەبەرم کە هیچ دادگـایەک لەگۆڕێ نییە. بەڵکو حـاکم و بەڕێوەبەری حوکم هەر ئەو شوێنەیە. دەزگای داد و بەڕێوەبەر لەم وڵاتەدا هەر یەکە. پادارۆڤ و یەمیلیانۆڤەکان هەموو شتێکن. بەڕێوەبەری ئەم مەملەکەتە و پارێزەرانی ڕژێم و دروسـتکەرانی دیواری ئـاسـنین و ئۆردووگـاکـانی بێگـاری و پـارێزەرەکەیـان، ڕێکخراوە سامناکەکەی پاراستن واتە ئێم.گ.ب¨ـیە. مانگێکی دیکە لەو سـلوولەدا مـامەوە. ئەمجـارە بۆخۆم پێم وابوو هەموو شـتێک یەکلا بووەتەوە و بەو زوانە یـان بەڕێی ئۆردووگـا دەکرێم یـان ئـازادم دەکەن. بەڵام بەپێی ئەو قسـانەی کرابوون، ئازادییەکەم پێ مەحاڵ بوو. هەر واش بوو. ڕۆژێکیان پاش بەرچایی دەرگای سـلوول کرایەوە و بانگی زیندانیی ژمارە ١٢٩ کرا. پاسـەوان گوتی کەلوپەلت کۆ بکەوە. ماڵاوایییم لە هاوژوورەکانم کرد. بردیانمە نهۆمی تەختانێ. پاش ئەوەی بە ڕاڕەوێکی دووردرێژدا ڕۆیشتین،

لەبەردەم هۆدەی ڕەئیسی زیندان ڕاوەستاین. یەکێک لە پاسەوانەکان لە دەرگای دا. بەڵام ڕێک لە کاتی کردنەوەدا، زیندانییەکی دیکەشیان لەوێ هێنا دەرێ. زیندانییەکە ئاشنا دیار بوو. سڵومان لێ کرد، بەڵام یەکسەر منیان بردە ژوورێ. ڕەئیسی زیندان هەر ئەو سەرهەنگە بوو، کە لە یەکەم ڕۆژی هاتنمدا بۆ ئەو زیندانە دیتبووم. وەک هەموو جارێ ناو و شۆرەتمی پرسی. ئینجا ئاماژەی بە کاغەزێک دا و گوتی: ئەوە بڕیاری ئەنجومەنی میرییە لەسەر تۆ، یان ئەنجومەنی تایبەتی. دە ساڵیان بۆ بڕیویەتەوە. گوتم خۆ لە هیچ دادگایەک دادگایی نەکراوم. گوتی پێویست بە دادگا ناکا. ئەنجومەن بۆخۆی دەزانێ چی دەکا. ژێر حوکمەکە ئیمزا بکە و ئەگەر ناڕەزایەتیت هەیە، لەبنی بنووسە. بەڵام ئێستا بەکورتی، دواتر لە لاکێر دەتوانی بەتێروتەسەلی ناڕەزایەتییەکەت بنووسی. لە ژێر بڕیارەکە نووسیم: "ئەوە زاڵمانەترین بڕیارە، ئیعترازم هەیە. ئیمزا.

لە ژووری ڕەئیس بردیانمە دەرێ. گەنجەکەم دیت لە ڕاڕەوەکە ڕاوەستابوو. چوومە لای. ئیدی کێشە نەبوو. پێکەوە قسەمان کرد. هەردووکمانیان حوکم دابوو. تۆقەم لەگەڵ کرد و گوتم نازانم تۆم لە کوێ دیتووە؟ گوتی لە بنکەی سەربازیی باکۆ لەگەڵ خوێندکارە کورد و تورکەکان منت دیتووە. گوتم ڕاست دەکەیز بیرم کەوتەوە. خۆمم ناساند. ئەویش خۆی ناساند. ناوی پەرویز و خەڵکی تەورێز بوو. بەڵام چەندی لەمێشکی

خۆم نووسـام، شـۆرەتەكەیم وەبیر نەهاتەوە. ناوبراو فرۆكەوانیی دەخوێند. لێی پرسـیم چەند سـاڵیان بۆ بڕیویەتەوە؟ پرسـیم مەگەر جلوبەرگە؟ گوتی ئا، هەر كەسـە و بە ئەندازەیەك بۆی دەبڕن. گوتم جلی من درێژە. دە سـاڵی ڕێكە. گوتی ئی من درێژترە. پڕ بە بەرمە، بیستوپێنج ساڵ.

ئەنجومەنی تایبەت، دادگا نەبوو. بەڵام ناوەندێك بوو لەسەرەوەی هەموو ئەو دادگایانەوە. ئەنجومەن و مەكۆیەكی مەسـڵەحەتی. ئەو ئەنجومەنە بەهیچ شـێوەیەك كاری بە تاوانەوە نەبوو. لەوانەبوو یەكێك هیچ تاوانێكیشـی لێ ڕوو نەدابێ. بەڵام ئەو ئەنجومەنە پێی باش بوو كابرا بەشێوەیەك سزا بدرێ.

ئەو جۆرە ئەنجومەن یان دادگا تایبەتییانە تەنیا لە وڵاتە دیكتاتۆرییەكان هەن. لە حاڵێكدا ئەو جۆرە دامەزراوانە بە دڵنیاییەوە بە پێچەوانەی بنەماكانی ئازادی و یەكسـانین. لە دنیای پێشـكەوتووی ئەمڕۆدا هیچ كردەوەیەك بە تاوان دانانرێ، مەگەر لە قانووندا ڕاشـكاوانە باسـی كرابێ و هیچ دادگایەك مافی دەركردنی بڕیارێكی نییە كە لەگەڵ یاسـا و ڕێسـا دانراوەكاندا یەك نەگرێتەوە. جگە لەوەش، سـزا دەبێ تەواو لەگەڵ تـاوانەكەدا هـاوسـەنگ بێ. لە بڕیارەكەی ئەنجومەنی تایبەتیدا، بەهیچ شێوەیەك ئاماژە بەوە نەدرابوو كە من چ تاوانێكم كردووە. ئەگەر تاوانی من سنووربەزاندنی نایاسایی بووە، ئەو تاوانە سزاكەی نابێ دە ساڵ بێ. ئەگەر جگە لەوە تـاوانێكی دیكەم كردووە، كوا بەڵگە؟ مخـابن هیچ نـاوەنـدێكیش بۆ نـاڕەزایەتی یـان داوای پێداچوونەوە

دەسنیشان نەکرابوو و کەسیش نەبوو کە بتوانێ بڕیارەکانی ئەو ئەنجومەنە کۆنترۆڵ بکا یان لانیکەم هەڵیانەوەشێنێتەوە مەگەر خودی جەنابی ڕێبەر و خاوەنی ڕۆح و جەستەی خەڵکەکە. گوتم، جەنابی پەرویز، مەگەر چیت کردووە کە ٢٥ساڵ بێگارییان بۆ بڕیویتەوە؟ گوتی پێت وانەبێ تاوانەکەی من لە ئی تۆ گرینگتر و گەورەترە، بەهیچ شێوەیەک وا نییە. کاری ئەو ئەنجومەنە هەر وا دێمەکاری و دڵخوازی خۆیانە.

تەرازوویەک نییە کە سزاکانی پێ هەڵسەنگێنن. وەکوو لادێییەکانی خۆمان کە هەموو شتێک بە بەرد دەکێشن. جاری وایە لەوانەیە بەردەکە زۆر قورس و هێندێ جاریش زۆر سووک بێ. من دیتوومە دووکەس پێکەوە وێکڕا سنوورێکیان بەزاندووە و تاوانی هەردووکیشیان ڕێک وەکوو یەک بووە. بۆ یەکێکیان دە ساڵ و بۆ ئەوی دیکەیان بیستوپێنج ساڵ بێگارییان بڕیوەتەوە. ئێستا بە دەردی دەڵێن وەرە ئەو کەرەی لەو قوڕە دەربێنەوە.

بەسەرهاتی من هەڵبەت تۆزێک بەربڵاوترە. جارێ وا دیارە خەریکن بەڕێمان دەکەن. لە ڕێیە بۆت دەگێڕمەوە.

پەرویز ڕاستی دەکرد، لەو دەمەدا مەئموورەکان هاتن. لە پێشدا بردیانینە بەشی ئەماناتی زیندان. بیجامەی زیندانمان داکەند و هەردووکمان بوخچەی ئەمانەتەکەی خۆمان وەرگرتەوە. من کۆت و شەلوارەکەی خۆمم لەبەر کردەوە. بە کراس و پێڵاو و جلی تازەوە بوومە بنیادەمێکی دی. جانتاکەشمم وەرگرتەوە کە فلچەی

ددان و هەویری ددان و خاولییەکی تێدابوو. بردیانینە حەوشەی ئەم.گ.ب. سەیارەی تایبەتی زیندانییان لەوێ ئامادە بوو. دەرگای پشتەوەیان کردەوە و سوار بووین. جگە لەو چوار کەسەمان، کۆمەڵێک بەندیی دیکەش دانیشتبوون. دەرگای پشتەوەیان داخست و ماشێن وەڕێ کەوت و لە دەرگا گەورەکەی بەندیخانە چووە دەرێ. ئێمە دەرەوەمان هیچ لێ دیار نەبوو. بەڵام خۆ جارێ لەو دۆزەخەی ئێم.گ.ب هاتبووینە دەرێ. لە وێستگەی ئاسنەڕێی باکۆ دایانبەزاندین و بەپەلەپەل سواری ڤارگۆنی تایبەتی زیندانییەکانیان کردین. من پەرویز کەوتینە ژوورێک، کە جگە لەو دوانەمان کەسی دیکەی تێدا نەبوو. پەرویز هیچ پێوەی دیار نەبوو خەمبار و ناڕەحەت بێ. گەنجێکی باڵابەرزی باریکەڵە بوو. بەڵام توورە دیار بوو. ڕووی تێ کردم و گوتی: "بەر لەوەی چارەنووسی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، ئەوەندەت با پێ بڵێم خەم و خەفەت مەخۆ. ئێمە لە دنیای زیندانییاندا دەژین. بڕوات بێ نیوەی ئەم وڵاتە لە زیندانەکاندا دەژین. هەر ئەم وڵاتە خۆی زیندانێکی ڕاستەقینەیە. دەرەوە و ئازادییەکەی بایی پووشێکیش نابێ. گوتی ئەوە دەبینی من دووەم جارمە دەکەومە زیندان. ئەوانەی پێت دەڵێم ڕاستەقینەن.

گوتی تەورێزیم. دواناوەندیم لە تەورێزێ تەواو کردووە. زۆرم حەز لە فڕۆکەوانی بوو. هەر بۆیە لەگەڵ کۆمەڵێک خوێندکار لەلایەن فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانەوە هاتمە بنکەی لەشکریی باکۆ. هێشتا چەند مانگێک بوو کە ڕایاندەهێناین، حوکمەتی فیرقە لە تەورێز وەک دەزانی لە

۲۱ی سەرماوەزی ۲٥ـدا ڕووخا. کۆمەڵێک گەڕانەوە تەورێز، بەڵام من و چەند کەسێک نەچووینەوە. قۆناغی فرۆکەوانییەکەم لەتەواوبوونێ بوو. سەربەخۆ دەمتوانی فرۆکە لێ بخورم. ڕۆژێکیان لەگەڵ چەند هاودەورەی خۆم خەریکی قسان بووین. ڕەخنەیان لێ دەگرتم کە بۆچی لە کۆبوونەوەکانی فیرقەدا بەشدار نابم. گوتم یەکەم ئەوەی کە من ئەندامی حیزب و فیرقە نەبووم و ئێستاش کارم پێی نییە. من خەریکی خوێندنێم و ئەو مشتومڕانەمان لێ بوو بە شەڕ. بۆخۆشت دەزانی ئێمەی ئازەربایجانی هەر بۆخۆمان لەگەڵ ترێ بزن بەشەڕ دێین. نازانم ئەوانیش بە ئانقەست توورەیان کردم و منیش جنێوم بە فیرقە و غوڵام یەحیای سەرکردەیان دا. شتەکە لەوەدا بڕایەوە. ئیدی شەیتان و شۆفار مەسەلەکەیان بۆ غوڵام یەحیای ملهووڕ گێڕابۆوە و ئەویش مەسەلەکەی لە ئێم.گ.ب گەورە کردەوە و چەند ڕۆژێکی پێ چوو، منیان بردە ئێم.گ.ب. پاش دوو مانگ دەسبەسەری ئەو ڕێکخراوە دۆزەخییەدا پێنج ساڵ دوورخراوەییان لە سیبریا بەسەردا سەپاندم. هەڵبەت بەبێ دادگایی و مافی بەرگری، لەژێر چاودێریدا بریانمە سیبریا. ساڵێک لەوێ مامەوە و لەبەر ئەوەی ئازاد بووم، هەموو ڕێوشوێنێکی ڕاکردنم ئامادە کرد و خۆم گەیاندە ئازەربایجان. مخابن لە نزیک لەنکەران گیرام و دیسان بردمیانەوە بۆ ئێم.گ.ب. ئێستا ئەوە دە مانگە لە

ئێم.گ.بێم. وەک دەزانی ئەوجار ٢٥ ساڵیان بەسەردا سەپاندووم. بۆ هەر شوێنێکم بنێرن، دیسان هەڵدێم.

منیش سەربردەی ژیان و گیرانی خۆمم بۆ گێڕاوە. شەو داهاتبوو. چوومە سەر تەختەکە و ئەو لە خوارەوە مایەوە. ڕۆیشتنی یەکهەوای شەمەندەفەرەکە بووە هۆی ئەوەی زوو خەوم لێ بکەوێ. نازانم چەند سەعاتی شەو تێپەڕیبوو، کە بە دەنگی یەکێک کە لەگەڵ پەرویز قسەی دەکرد، بەخەبەر هاتم.

کابرا بە ئازەری بەڵام لەهجەیەک قسەی دەکرد، کە دیار بوو ئازەربایجانی نییە و شتی زۆر سەیری دەگوت. دەمودەست هاتمە خوارێ. ژوورەکە زۆر ڕووناک نەبوو. سڵوم کرد و لەگەڵی ئاشنا بووم. گوتی شۆرەتم ئیسحاقییە و لە ئاسوورییەکانی ورمێم. ناوبراو ئەندامی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بوو، کە لەگەڵ ئەوانی دی ڕای کردبووە سۆڤیەت. دەیگوت ژن و منداڵ و دایک و باب و خزم و کەسی هەموو لە ورمێ بەجێ هێشتووە. کە هاتووەتە ئازەربایجانی سۆڤیەت، لەلای باکۆ لەگەڵ فیرقەییەکانی دیکەیان خستووە و چونکە شارەزای میکانیک و ترۆمبێل بووە، لە یەکێک لە کارگەکانی تەعمیری ترۆمبێلدا خەریکی کار بووە. جا دەیگوت پاش ماوەیەک هەر بە سوعبەت و بەگاڵتە بەوانی دیکەی دەگوت "بو ئۆلمادی، واتە جا ئەوە نەبوو. ئەوانی دیکەش بە زارییەوە دەگرن تا دەگاتەوە بە ڕەئیسی فیرقە. ڕۆژێک بانگی کردم و پرسی کاکە ئەوە چییە هەموو شەوێ دەڵێی بو ئۆلمادی؟ گوتم وەڵڵا هیچ مەبەستێکم نەبووە. گوتی کەوابوو لەمەودوا بە

زارتـدا نـایەتەوە. بەڵام من خووم پێوە گرتبوو و هەر جارنەجارێک دەمگوتەوە. ئیتر لەسەر ئەوە ڕۆژێک بردیانمە ئێم.گ.ب و هەشـت مانگ لەوێ دەسـبەسـەریان کردم و تاقە پرسـیارێکی گرینگی بەردەوام لێیان دەکردم لەسـەر ئەو قسـەیە بوو. منیش هەر دەمگوت وەڵڵا هیچ مەبەستێکم نەبووە و هەر بۆ گاڵتە و ڕابواردن گوتوومە. گوتیـان نەخێر ئەوە گـاڵتەکردن و ڕەخنەیە لە حوکمەتی سۆڤیەت. وا دیارە تۆ لەو دۆخە ناڕازیی و بانگەشەی بۆ دەکەی و لە نێو ئەوانی دیکەدا دەنگۆ بڵاو دەکەیەوە و دەڵێی ئەوە نەبوو بە ژیان. ئەو بارودۆخەت بەدڵ نییە و ناڕەزایەتیی خۆت بەو جۆرە دەردەبڕی.

ئیتر پاش هەشـت مانگ دەڵێن ئەنجومەنی تایبەت دە سـاڵ زینـدانی بۆ بڕیومەتەوە. دەی دیـارە زۆربەی فیرقەییەکـان نـاڕازی بوون و قەت پێیـان وا نەبوو بۆ حەماڵی و کرێکاری دەیانهێننە ئەو مەملەکەتە. بەڕاسـتی بەسـەرهاتێکی سـەرنجڕاکێش بوو، کە یەکێک تەنیا لەبەر ئەوەی گوتوویەتی "ئەوە نەبوو" دە ساڵ حوکم بدرێ.

# ژەنەڕاڵە ورگنەکە

پاشـــان کۆمەڵێک زیندانیم دیتن، کە.بە ڕاســـتی هۆکاری حوکمـدرانەکەیـان گـاڵتەجـاڕانە بوو. گەنجێکی ڕووس دەیگێڕاوە، کە لەســـــەربازی ڕۆژێک ژەنەڕاڵێک هـاتبووە سەرانسۆی بنکەکەمان. ورگی زۆر گەورە بوو و هەر دیتم، لەخۆوە گوتم (پوزاتی) بە زمـانی ڕووســـــی واتە ورگزل. لەســـەر ئەو وشـــەیە، دە ســـاڵ زیندانیان بۆ بڕیمەوە. پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر، بە بۆرژواکانیان ـــــ کە ورگێکی زلیان هەبوو ـــــ دەگوت پوزاتی، هەر بۆیە من مافی ئەوەم نەبوو ئەم دەســـتەواژەیە بۆ ژەنەڕاڵێکی ســـوپای ســـۆڤیەت بەکار بێنم. ئەویش دەیگوت، ئەنجومەنی تایبەت ئەو ســــزایەی بۆ دەسنیشان کردووە.

زیندانییەکی دی دەیگێڕاوە، شـەوێکیان لەخەونمدا چوومەتە تورکیە بۆ لای براکەم. من هەرمەنیم و خەڵکی ئیرەڤـانم. برایەکم بوو پێش شـۆڕش چووبووە تورکیا و لە ئەســتەمبوڵ دەژیـا. ســــاڵانێک بوو هیچ هەواڵێکم لێی نەبوو. نەمدەوێرا تەنـانەت تـاقە نـامەیەکیشـــــی بۆ بنێرم. ئەویش دەیزانی نامەنووســـــین بە ناونیشـــانی من بێ مەترســـــی نابێ. ئیتر توانیبووم لانیکەم بە خەونم بچمە لای براکەم. بەیـانی کە لەخەو هەســــتام بۆ ژنەکەمم گێڕاوە و گوتم براکەم ژیانێکی زۆر خۆشـی هەیە. براکەم پەیتاپەیتا پێی دەگوتم وارتان، خێرا وەرە ئێرە، من ســـامانێکی زۆرم هەیە. زۆر پێویســـتم بەتۆیە لێرە بی. چەند ڕۆژێکی بەســــەردا تێپەڕی. ڕۆژێکیان مدیان بانگ کردە ئێم.گ.ب. پرســیاری خەونەکەمیان لێ کردم. زۆرم

پێ سـەیر بوو، کە ئەوەیان چۆن بە گوێ گەیشـتووەتەوە. ناچار خەونەکەمم بۆ لێکۆڵەر گێڕایەوە. چوار مانگ پاش لێپرسـینەوەکە ئەنجومەنی تایبەتی دە سـاڵ زیندانیی بۆ بڕیمەوە. تەنیا لەسـەر ئەوەی خەونم دیتبوو. لەوەدا ئیدی بێدادیی سیستەم لەلایەک و گەندەڵیی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی لەلایەکی دیکەوە ئاشـکرا دەبێ. وای دێنێ نەک بە خەون، هەر بە ڕاستی وا بووبێ، مەگە چوونە وڵاتێکی دیکە چییە؟ مەگەر ئێوە ناڵێن ڕژێمی ئیسـتعمار و چەوسـێنەرتان ڕووخاندووە و خەڵک لەوپەڕی بەختەوەریدا دەژین؟ ئەی لە چی دەترسن؟

خـانمێکی گەنج کە پێنج سـاڵ زینـدانی بۆ بڕابۆوە، دەیگوت: لە کارگەیەکی دارتاشـی لە کۆڵانی بیشـۆڤ کارم دەکرد. لەوێ لەگەڵ کوڕێکی گەنج ئاشـنا بووم و دوایی زەماوەندمان کرد. پشـوویان پێ نەدەداین. ئێمەش بەبێ وەرگرتنی ئیجازە سـەفەرێکمان کرد. بەتەما بووین تەنیا پێنج ڕۆژ بچینە باکۆ. لە شـەمەندەفەردا بووین و هێشـتا نەگەیشـتبووینە ئەوێ، دەسـبەسـەر کراین و بە تاوانی ڕاکردن لە ئیش (ساباتاژ) یەکی پێنج ساڵ حوکم دراین.

لەو بەسـەرهاتانە ئەوەندە زۆر بوون، کە دەکرا کتێبێکی تایبەتیان بۆ تەرخان بکرێ و لەسەری بنووسرێ.

جا ئەو شـەمەندەفەرەی وا ئێمە حوکمدراوەکانی دەبرد، لە شـاری ڕسـتۆف ڕای گرت. دایانبەزاندین و بردیانینە گرتووخـانەیەک، کە شـوێنێکی کـاتی بوو و لەوێوە حوکمـدراوەکـانیـان بەرەو شـوێنە جیـاجیـاکـانی وڵاتی پانوبەرینی سۆڤیەت بەڕێ دەکرد.

# گرتووخانەی ڕۆستۆف

هەواکەی زۆر سارد بوو. هەر لە دەریّ نانی نیوەڕۆیان داینیّ. ئەوەندە سارد بوو، نەتدەوێرا دەست لە قاپی چێشتەکە بدەی. لە برسێتیان ناچار ئەو خواردنە بەستۆم هەڵڕشتە نێو گەدەی بەتاڵمەوە. ئینجا بردیانینە نێو هۆڵێکی گەورە کە پڕ بوو لە زیندانی. بەڵام زیاتر لە سەر گەردەنە دەچوو تا زیندان. چەند چەقۆکێشێک پێش دەرگاکەیان گرتبوو. هەر کەس وەژوور دەکەوت، ئەگەر شتێکی تۆزێک بەنرخی پیّ بوایە، لێیان دەستاند و هەر نقەشی لێوە هاتبایە یان هەڵوێستی هەبوایە، دارکارییان دەکرد. بەڵام چونکە ئێمە سیّ کەس بووین و وێکڕا چووینە ژووریّ، بەتایبەتی لەبەر بەژن و باڵای چوارشانە و کەتەی پەرویز و یەعقووبی کە لە دەستکەرەوە و دەستوەشێن دەچوون، هیچیان بە ئێمە نەگوت و ئێمەش حەپەساو بەلایاندا تێپەڕین. بەڵام بە زەحمەت شوێنێکمان بۆخۆمان کردەوە.

بێبەشی لەخوێندن و کێشانی ئەو جەور و سزا قورس و زاڵمانەیە لەلایەک و ژیان لەگەڵ کۆمەڵێک دز و چەقۆکێش لەلایەکی دی ئازارێکی قورستر بوو. قەت پێم وانەبوو لەم دنیایەدا زیندانێکی بەو جۆرە هەبیّ، کە نە جێی دانیشتن هەبیّ و نە جێی خەوتن. دووکەڵی جگەرە هۆڵەکەی کردبووە مدبەق. پشووت سوار دەبوو. لەبەر دەنگەدەنگ و تەنانەت نەڕاندن و ملهوڕی، بێزت لە هەموو شتێک هەڵدەستا. گەنجێکم دی بە جلوبەرگێکی شڕ و جانتایەکی بچووکەوە وەژوور کەوت. دز و جەردە تێی وەرووکان. لەپێشدا

جانتاکەی گەڕان. شـــتێکی بەنرخی تێدا نەبوو. ئەوجار گیرفانی گەڕان. پێنج ڕۆڵی لە گیرفانێکیدا بوو، ئەوەیان لێ ئەســـتاند و چەند مســـت و شـــەقیان لێ دا، کە بۆچی لەپێشدا شوێنی پووڵەکەی پێ نەگوتوون.

دوو ڕۆژ لەو کونەدا ئازارمان چێشت. دوانیوەڕۆ بوو لەوێ هێنایانینە دەرێ. چووینە نێو حەوشـــەیەکی دیکە، کە پڕ بوو لە زیندانی. لە هەر میللەتێکی کە بە خەیاڵتدا دێ. ڕووســـی و لەزگی و گورجی و تورکمان و ئوزبەک و ئینگوش و دەیـان نەتەوەی دی. دەتگوت ســـەحرای مەحەشـەر و ڕۆژی پەسـڵانێ. هەمووان ڕەشـهەڵگەڕاو و بزڕکـاو و لاواز و داڵگۆشـــت، دەتگوت مردوون و لە قەبران ڕاســت بوونەتەوە و چاوەڕێن بە پردی سـیراتێدا بپەڕنەوە. بەڵام بەداخەوە لێرە فریاڕەسێکیش نییە.

نـاوی کۆمەڵێک کەســـیـان خوێندەوە و هەر کـام بە دەرگایەکدا دەچوونە دەرێ و ســـواری ئەو گەورەپاســـە دەبـوون کە لەوێ ڕاوەســـتـابوون. نـاوی پەرویـز و ئیســـحاقیشـــیان خوێندەوە. ئەو دوانەش ســـوار بوون، دەیانویســـت دەرگای حەوشـــەکە داخەن، خۆم گەیاندە لای دەرگا و دەمویســـت بە زۆرییش بێ لەگەڵیان بڕۆم. بەڵام پاسەوان پێشیان گرتم و دەرگاکەیان داخست. جیاکردنەوە و دوورخستنەوەی ئەوان لەو دۆخە هەستیارەدا کە لەجێی نزیکترین و ئازیزترین کەســـم بوون زۆر خەمباری کردم. بە دەنگی بەرز هـاوارم کرد، مـاڵاوا کـاک پەرویز، ئـاغـای ئیسحاقی. بەڵام دەنگم لە نێو هاڕەهاڕی پاسەکاندا ون بوو. وەڵامێکیشم نەبیستەوە.

# ڕووناکی لە چەقی تاریکیدا

من و سێ کەسی دیکە لە حەوشەکە بەجێ ماین. زۆر سارد بوو. جلەکانیشمان ئی ئەو هەوایە نەبوون. لە دەوروبەری حەوشەکە دەستم کرد بە غاردان بەشکم تۆزێک گەرم بمەوە. کتوپڕ دەرگای حەوشە کرایەوە. سەیرم کرد کۆمەڵێک کەس لەوێن. بەبێ ئەوەی بزانم کێن، خۆم خستە نێویان. شوێنێک بوو گەرم، بەڵام تاریک. چاوم لەگەڵ تاریکاییەکە ڕاهات. سەیرم کرد کۆمەڵێک ژن و پیاوی گەنجن. لە گۆشەیەکەوە ڕاوەستام. سەیرم کرد کچێکی پرچ زەرد کە تەمەنی لە ٢٠ ساڵ تێنەدەپەڕی، لەلام ڕاوەستاوە. دەستمی گرت و گوتی، دەستت چەندە ساردن. گوتم دەرەوە زۆر ساردە بەڵام دڵم لەوەش ساردترە. پرسیی خەڵکی کوێی؟ گوتم ئێرانیم. دەتگوت ناوی ئێرانی هەر نەبیستووە. سەری هەڵبڕی. بۆخۆی خەڵکی مۆرمانێسک بوو. دوورترین شوێنی سەرسنوورەکانی سۆڤیەت لە دەریای باکوور. تێم گەیاند کە ئێران بەشێک نییە لە سۆڤیەت. وڵاتێکی دیکەیە و دراوسێن. پرسیی ناوت چییە؟ گوتم ڕامان. ئەویش ناوی ڕایا بوو. پرسیم بۆ لێرە؟ گوتی ئێمە هەموومان زیندانیین. پرسیم بۆ کوێمان دەبەن؟ گوتی نازانم، بەڵام ئەگەر پێکەوە کەوتینە شوێنێک، دەبینە هاوڕێ. خەریک بوو توند دەستمی دەگوشی. پرسیم مەگەر دەکرێ پێکەوە بین؟ گوتی لە هێندێ لاکێر ئۆردووی ژنان و پیاوان بەتەنیشت یەکترەوەن و هاموشۆ هەیە. ئەگەرچی لەو حاڵەتەدا تاقەی ئەو قسانەم نەبوو، بەڵام هەر بۆ ئەوەی دڵی

نەشـــكێنم، بەڵێنم پێ دا. ڕایا وەکوو تیشـــکێک وابوو کە لەچەقی تاریکیدا دەیویست ڕووناکییەک بەدڵم ببەخشێ.

من هێشـتا پرسـیاری خۆیم لێ نەکردبوو و نەمدەزانی ئەو کچە بەو تەمەنەوە چ تـاوانێکی کردووە کە دەبێ لەگەڵ ئەو گورگانە لە شـــوێنێک بێ؟ لەو دەمەدا دەنگی پۆتین پاسـەوانەکان لەدەرەوە هات. دەرگایان کردەوە و بە توورەیی گوتیـان بڕۆنە دەرێ. ڕایـا تونـد خۆی بە منەوە مەڵاس دابوو و دەســـتمی بەر نەدەدا. پاســـێک، زیندانییەکانی ســـوار دەکرد. من ڕایا پێکەوە دانیشـــتین. جەسـتەی، گەرمیی پێ دەبەخشـیم و بە دەسـتە ناسـک و جوانەکەی تونـد دەســـتمی گرتبوو. وەکوو نێچیرێکی کەوتبێتە دەســــت ڕاوچییەکی بە بەزەیی. جـاری وایە مەودای نێوان خۆشی و ناخۆشی ئەوەندە کەم و ناسکە، کە زۆر بەئاســـانی لێی دەپەڕیتەوە. بە ئاواتەوە بووم هەموو قۆناغی زیندانییەکەم لەو پاســـەدا وەمێنم. بەڵام فایدەی چی، ئەو خەون و خەیاڵانە زۆریان نەخایاند و گەیشـتینە وێسـتگەی ئاسـنەڕێی ڕۆسـتۆڤ. دایانبەزاندین. ئەویان بردە ڤارگۆنی ژنان و منیان بردە بەشـــی پیاوان. بەســـتەزمانە ڕایا دەگریا. ســـەرەڕای هەموو نەگبەتی و چارەڕەشـــییەکانی خۆم بەزەییم بەودا دەهاتەوە. بەڵم دیســـان هیوام هەبوو کە لە شـــەمەندەفەرێکداین. بەڵام ئەوە دوا دیدارمان بوو. ڕایا تروسـکەیەک بوو کە زوو کوژاوە و ئیدی هەرگیز نەمدیتەوە. نازانم لە کام وێستگە دەیانبەزاند و بۆ کوێیان برد؟ من زۆر نیعمەتم لە ژیاندا

لەدەست دابوو، ئەوەشی هاتە سەر. بەڵام ئێستاش دەنگە نەرم و خۆشەکەی هەر لەگوێمدایە.

شەمەندەفەرەکە شەو و ڕۆژێک بەڕێگەوە بوو. شەوێ لە وێستگەیەک ڕاوەستا. بەڵام تا بەیانی نەیانهێشت دابەیزن. کە دایانبەزاندین و ڕیزیان کردین، گەنجێکی ئەسمەری قۆز و پتەوم دی. لێی چوومە پێشێ و بە ئازەری لێم پرسی: خەڵکی کوێی؟ گوتی باکۆ. گوتم منیش خەڵکی ئازەربایجانی ئێرانێم. زۆر خۆشحاڵ بوو، تۆقەی لەگەڵ کردم و خۆی ناساند. محەمەد ئیسماعیلزادە. گوتم ئەگەر وایە بە ئەسڵ ئێرانیی؟ گوتی لەوانەیە. منیش خۆمم ناساند. پرسیی، چەند ساڵیان بەسەردا سەپاندووی؟ گوتم: دە ساڵ. گوتی ئی من ٢٥ ساڵە. پرسیم ئێرە کوێیە؟ گوتی: شاری سۆرلۆسک. ئەوپەڕی باشووری شاری ڕووسیا، هاوسنووری قەزاقستانە.

ئێرەش گرتووخانەیەکی کاتییە. لێرەوە یان بەرەو باکوور بەرەو سیبریامان دەنێرن، یان بەرەو باشوور بەرەو قەزاقستان.

پاش ئەوەی چواردەکەس ڕیزیان کردین و سەربازی چەکدار ئەملاولایان گرتین، وەڕێ کەوتین. پاش چەند کیلۆمەترێک، گەیشتینە نزیک گرتووخانەیەکی گەورە. زیاتر لە نیو سەعات لەبەر دەرگا ڕایان گرتین. هەواکەی زۆر سارد بوو. دەلەرزیم. ئیسماعیلزادە گوتی، بەو جلوبەرگانەوە لەو هەوا ساردەدا نەخۆش دەکەوی. دەبێ جلی زستانی دابین بکەی. لەو دەمەدا دەرگای گرتووخانەکە کراوە و بردیانینە نێو حەوشەکە. دوایی زیندانییەکانیان

برده نێو چەند هۆڵێکی گەورە کە پێیان دەگوترا باراک. هەر هۆڵێک بیست تەختی خەوی چوارکەسیی تێدا بوو، کە دوو کەس لەسەرەوە و دوو لە خوارەوە جێیان دەبۆوە. من و ئیسماعیلزادە لەتەنیشت یەکەوە تەختەکەی خوارەوەمان گرتەوە. ئیسماعیلزادە گوتی دەبێ وریا بین. لێرە بەندیی شەڕاشۆ و بەدفەڕ زۆرن. ئەوانە بە تاوانی دزی و پیاوکوژی و خراپە حوکم دراون. ڕاستە ئێمە زیندانین و دەبێ قبووڵمان بێ ئەوانیش نارەحەتن، بەڵام زیندانیبوون لەگەڵ خەڵکی تێگەیشتوو و خوێندەوار و بەئەدەب فەرقی هەیە لەگەڵ ئەوانە. ئەوانە لەگەڵ شەڕ و تالان و هەرا و فەرتەنە ڕاهاتوون و خوویان پێوە گرتووە و هەر لە بیانوو دەگەڕێن. تەنانەت وا بووە لە زیندانێدا یەکتریش بکوژن. بەتایبەتی ژینگەی ئەو زیندانانە نەک نابنە هۆی چاکبوونیان، بگرە لەوەش خراپتریان دەکا. ئینجا دەوڵەت پشتیوانی لەوانە دەکا نەک لە ئێمە. زیندانی تایبەت بۆ ئەوانە دروست کراوە، زۆر باشترن لەو لاکەرانەی بۆ ئێمەیان دروست کردوون. بەو زووانە لێکمان دادەبڕن و دەمانئێرنە لاکەری تایبەت. دەبێ ڕۆژانە کاری تاقەتپڕووکێن بکەین بۆ ئەوەی بناغەی بۆشی و پووشی ئەو سیستەمە پتەو بێ. پرسیم ئیسماعیلزادە تۆ بە چ تاوانێک گیراوی؟ گوتی من مامۆستا بووم. ڕۆژێک قوتابییەک پرسیی لە وڵاتانی سەرمایەداری خەڵک چۆن دەژین؟ گوتم لەوێ خەڵک چەند دەستەن، دەستەیەک کار بۆ دەوڵەت دەکەن، وەکوو

ئێمە. دەستەیەکیش کاری سەربەخۆیان هەیە، وەکوو پینەچی و بەننا و میعمار و دووکاندار و هێندێکیش خاوەن سەروەت و سامانن. چینێکیش کرێکاری سادەن کە یان لە کارخانە و کارگەکاندا کار دەکەن یان هەموو جۆرە کارێک دەکەن. چینی سەرمایەدار کار ناکەن، بەڵکو سوود و قازانجی سەرمایەکانیان دەخۆن. کارخانە و هوتێل و شتەکانی دی هەموو ئی ئەوانەن. ئێمە بە خاوەنەکانی ئەو سامانە دەڵێین بۆرژوا و باوەڕمان وایە ئەوان خەڵکی دیکە دەچەوسێننەوە.

قوتابییەکە پرسیی، جا باشە ئەو دەستەیە ئەو سامانە لە کوێ دێنن؟ گوتم یان بە میرات پێیان گەیشتووە یان بۆخۆیان کاریان کردووە یان وردە وردە کۆیان کردووەتەوە. تەقریبەن بیست ڕۆژێک لەوە تێپەڕیبوو. ڕۆژێکیان بردیانمە ئێم.گ.ب. کۆڵێک شتیان لەو باسە زیاد کردبوو و گوتیان بۆچی ئەو شتانەم وەکوو دەرس گوتووەتەوە؟ گوتم خۆ درۆم نەکردووە و ئینجا هیچ شتێکم بە قازانجی سەرمایەداری و بۆرژواکان نەگوتووە. گوتیان تۆش دەبوو خراپەیان بڵێی و گوتبات خەڵکی ئەو وڵاتانە لەوپەڕی هەژاری و نەگبەتیدا دەژین و قوتابییەکان بەرانبەریان ڕەشبین بکەی. ئیدی لەسەر ئەو قسانە دە ساڵیان حوکم دام. ئینجا من قەینا، قوتابییەکانیش ناپارێزن. ڕۆژێک پێیان دەڵێن قوتابیی فڵانەکەسن، ژن و منداڵ و باب و دایکی منیش لە ئەماندا نین. ئەو حوکمەی من داوێنی ئەوانیش دەگرێتەوە. ئینجا پاش دە ساڵ سزادان، وەختێک بشکەڕێمەوە تازە سەرەتای بەدبەختی و گرفتاریمە. پێمان

دەڵێن خیانەتکار. بەڵام دزی و چەقۆکێشی و پیاوکوژی و ئەو شتانە تاوانێکی گرینگ نین. سزای قورسیشیان نییە و سیستەمیش هیچ پێیان هەستیار نییە.

ئیتر دۆخ باراک زۆر خراپ بوو. بە ڕۆژ دەرگاکەی دادەخرا. تەنیا نیوەڕۆ و عەسران بۆ نانخواردن دەچووینە هۆڵی نانخواردن، بەڵام دیسان هەر خەنیمەت بوو هەوایەکی خۆشی دەرەوەمان هەڵدەمژی. من نەمدەتوانی ساتێکیش لە دەرەوە بوەستم. چونکە بەو جلانەوە زۆرم سەرما دەبوو. ئیسماعیلزادە لەگەڵ پاسەوانێکی بەر دەرگا قسەی کرد، تاوێک دواتر گرووبانێک هات، لەگەڵ ئەویش قسەی کرد. پێی گوتم و بە دە ڕۆبڵ لەگەڵی ڕێک کەوتم، گرووبان بەڵێنی دا شەوێ شەڵوارێک و فەڕەنجییەکی گەرمی لۆکەمان بۆ بێنێ. پێم گوت، نە گەورە بێ و نە بچووک. گوتی منی لە پێنج ڕۆبڵ زیاترم پێ نییە. گوتم منیش هێندێکم پێیە. ئەو خاتوونەم بیر کەوتەوە کە لە لەنکەران پێنج ڕۆبڵی دابوومێ. خودا چاکە بۆ ئەو ژنە چاکەکارە بکا و پاداشتی بداتەوە. ئەو پوولە ئەمڕۆ بەکارم هات. لە سەرما ڕزگاری کردم. ڕۆژ خەریک بوو ئاوا دەبوو، کە گرووبان هاتەوە و دەستێک جلوبەرگی دەستی دووی تا ڕادەیەک خاوێنی بۆ هێنام. من جلەکانم لەبەر کرد و تۆزێک گەرم بوومەوەز چاکەت و پانتۆڵەکەمم خستە نێو جانتاکەمەوە و وەبن بالیفەکەمم دان. ئیسماعیلزادە گوتی شانست هەیە، جلەکانت زۆر پاکوخاوێنن. گوتم کوا شانسی چی.

هەردووکمان پێکەنین. ئەو شـــەوە برێکمان قســـە کرد و خەوتین. بەڵام خەوێکی لە شەوانی دیکە باشتر.

بۆ ســـبەینێ ئیســـماعیلزادە گوتی، دوو شـــتت کەمە، چەکمەیەکی لبـادی و ئەوی دی کڵاوێکی چەرم. ئەگەرچی دواتر لە لاکەری ئەســـڵی دەتـدەنێ، بەڵام تـا ئەوێ نـابێ ســـەرمات بێ. دیســـان لەگەڵ گرووبانەکە قســـەی کرد، ئەمجـارەش ئەو دوانەی بە پێنج ڕۆبڵی دیکە کڕی و من تەواو بوومە زیندانییەکی تەیار بەجلوبەرگی زسـتانی. جلێک کەتەنیا بەکاری شـوێنە سـاردەکان دێ. ئەو جلانە شـتێکی دیکەشـیان باش بوو، ئەوە بوو هاوڕەنگی خەڵکەکە ببووم. وەک دەڵێن لە شاری کوێران دەست بە چاوتەوە بگرە.

## ماڵاوایی لە هاوڕێ و ڕاوێژکارێکی باش

هاودەنگییەکەی ئاغای ئیسماعیلزادە بۆ نیعمەتێکی گەورە بوو. ڕواڵەت و جلوبەرگ و قەد و قەڵافەت و ژینگە کارگەرییەکی گرینگی لەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤ هەیە. وردە وردە خەریک بوو ڕابردووم لەبیر دەکرد. مرۆڤ ڕەنگ و خووی ئەو خەڵکە دەگرێ کە لەگەڵیان دەژی. لە وەها ژینگەیەکدا، کەسایەتیی مرۆڤ تەواو ورد و سووک دەبێ. دەمدی جاروبار کە زیندانییەک جگەرەیەکی وەگیر دەکەوێ، کۆمەڵێک لێی کۆ دەبوونەوە و هەر کام بە یەک دوو مژی جگەرەکە ڕازی دەبوون. پارووەنانێک، توحفەیەکی شایانە بوو. زۆری هیممەت دەوێ مرۆڤ بتوانێ لەو کۆمەڵەدا کەسایەتیی خۆی بپارێزێ. من ئاغای ئیسماعیلزادەم ئاوا دی. جاری وابوو بە گاڵتەوە دەمگوت ئیسماعیلزادە، تۆ بۆخۆت گاندییەکی. پێدەکەنی و توند لە دەستمی ڕادەکێشا. ڕۆژێکیان بەیانی ناوی منیان لەگەڵ کۆمەڵێک زیندانیی دیکە خوێندەوە و گوتیان خۆمان بۆ ڕۆیشتنێ ئامادە بکەین. ئیسماعلیزادە لەگەڵ نەبوو. گوتی تۆ بۆ شوێنێکی دیکە دەنێرن. ئەمڕۆ ڕۆژی لێکدابڕانە. من زۆر خەمبار بووم. گوتی، مەگەر قەول و قەرارمان وا نەبوو لەمەودوا دان بە جەرگماندا بگرین و بەرگەی ئەو ڕووداو و پێشهاتانە بگرین؟ بڕۆ بەخێر و خۆشی، تەنیا ئاگاداری خۆت بە. لەوانەیە جارێکی دیکەش چاومان بەیەک بکەوێتەوە.

وەکوو دوو هاوڕێی گیانی لێک جوێ بووینەوە.
ئیسماعیلزادە جگە لەوەی لە سەرما ڕزگاری کردم و ئەوەش نیعمەتێکی گەورە بوو، چەند وانەیەکی گرینگی ژیانیشی فێر کردم. یەکێکیان ئەوەی کە دایمە خۆم لەگەڵ کۆمەڵ ڕێک بخەم. بەتایبەتی لە تاڵی و سوێری و کوێرەوەرییەکاندا، چونکە بە دیتن و هەستکردن بە چارەڕەشی خەڵک، نەگبەتی و نەهامەتییەکانی خۆتت لەبەر چاو بچووک دەبنەوە.

دووەم، هەر کاتێک تووشی بارودۆخێکی نالەبار بووی، چۆن بتوانی ئاراستەکەت بگۆڕی؟ چونکە هیچ گرفتێک نییە، کە بە تۆزێک بیرکردنەوە و تێڕامان نەتوانی ڕێگەچارەیەکی گونجاوی بۆ بدۆزیتەوە.

منیان لەگەڵ کۆمەڵێکی دی بردە وێستگەی شەمەندەفەری سۆلۆسک. بەڵام ئیتر سەرمام نەبوو. بەتایبەتی ئەو کڵاوە چەرمینە زۆر بەجوانی سەر و گوێچکەی دادەپۆشیم. چەند ساتێک دواتر سواری شەمەندەفەر بووین و بە دەردی جوولەیەک، بە ڕێگەی دووردا بەرەو شوێنێکی نادیار دەڕۆیشتین. دەنگی یەکهەوای شەمەندەفەرەکە نوقمی خەیاڵاتی کردم. ئیتر بنیادەمەکەی چەند مانگ لەوەپێش نەبووم. ڕواڵەت و ناخم گۆڕانی بەسەردا هاتبوو.

ئەمجارە هاوسەفەرەکانم وەک خۆم بوون. یانی بە ڕواڵەت یان بەبۆچوونی ئێم.گ.ب سیاسی بوون. هەموو ڤارگۆنەکانی ئەو شەمەندەفەرە پڕ بوو لە زیندانی. لە وڵاتێکدا کە باسی یەکسانیی ماف و نەهێشتنی زوڵم و

ناهەقی و چەوســـاندنەوەیە و ڕژیمی ســـەرمایەداری تێکەوە پێچراوە و نەماوە، ئەو هەمووە زیندانییە مانای چییە؟ بۆ ئەوەی بزانی حوکمەتێک چەنــدە بــاش و تەندروســـتە، دەبێ ســـەیری ژمارەی زیندانییەکانی بکەی. دەڵێن دەرگـای هەر قوتـابخـانەیەک بکرێتەوە، دیـارە دەبێ دەرگـای زینـدانێـک دابخرێ. بەڵام لەو وڵاتی سـۆڤیەتی سـۆسـیالیسـتییە ڕێک پێچەوانەکەی ڕاستە. یان هەر لە بنێڕا وانەکانی قوتابخانە مرۆڤساز نین. هەر بۆیە زۆربوونی زینـدان و مەحکوومکردنی تـاکەکـانی کۆمەڵ بە بیـانووی جۆراوجۆر لە زمـانی ڕووســـیدا بووەتە مەســـەلێکی باو. دەڵێن، دوو شـــتی ژیان، مسۆگەرن:

یەکێکیان مەرگ و ئەوی دی زیندان.

لێرە وەک چۆن مەرگ بۆسەی بۆ مرۆڤ ناوەتەوە، زینــدانیش زاری داپچڕیوە تــا بەردەوام مرۆڤەکـان قووت بـدا. وردە وردە خەوم لێ کەوت. کە بەخەبەر هاتم، تەنیا بە هۆی ئەو تۆزە ڕووناکییەی لە ڕاڕەوی ڤارگۆنەکەوە دەهاتە ژوورێ، زانیم ڕۆژ بووەتەوە.

خراپیی ئەو ڤــارگۆنی زینــدانیبەرانە لەوەدایە، کە دەرەوە نابینی، دەڵێی نە شەو ڕۆژ دەبێتەوە و نە ڕۆژ ئێوارەی بەسەردا دێ.

## یەکەم ئۆردووگای بێگاری

شەمەندەفەرەکە لە ناوچەی باشووری سیبریا چووبووە دەرێ و گەیشتبووە نێو قەزاقستان. پێم وابوو هەوای ئێرە دەبێ خۆشتر بێ، لەحاڵێکدا ئێرەش هەر سارد بوو و زۆر لە سۆرلۆسک جیاواز نەبوو. شەمەندەفەرەکە هەر وا ڕێی دەبڕی، دەتگوت ئەو ڕێیە بڕانەوەی نییە. پاش نیوەڕۆ شەمەندەفەر لە وێستگەیەک ڕاوەستا، وێدەچوو گەیشتبێینە کۆتایی. دەنگێکی فەرماندەرانە لە دەرەوە دەیگوت، دەرگاکان بکەنەوە. چەند سات دواتر دەرگای ڤارگۆن و کووپەکانیان کردنەوە. لە هەردوولای ئەو کاروانی مرۆییە چەکدار ڕاوەستابوون. حەپەی سەگی پارێزەریش لەو دەشتە کپ و بێدەنگەدا گوێی ئازار دەدا. شەمەندەفەرەکە لە دەرەوەی ئاوەدانی ڕایگرتبوو و تا چاو هەتەری دەکرد دەشت بوو. بایەکی ساردی دەهات و کلووی بەستووی بەفری لەدوور دوورەوە دێنا و بە دەموچاوماندا دەدا. ئەو هەمووە ژن و پیاوە وەکوو لەشکری بەزیو و شکاو، یان وەک دیلی شەڕ بە جلوبەرگی شڕ و کۆڵێکی سووکەوە وردە وردە و لەسەرخۆ شەپۆلی دەدا و بەرەوپێشەوە دەچوو. ئەو لەشکرە شەپۆلدەرە دەتگوت کۆمەڵێک مرۆڤی بێگیانن کە بەرەو پێشەوە لێ دەخوڕدرێن. کەس پشووی لەبەر نەدەهات. ئارام دەیانگوت ئێرە نێوەڕاستی قەزاقستانە. قەزاقستان بەهۆی ئەو هەمووە ئۆردووگا گەورەیە و زۆربوونی بێگاری، ببووە یەکێک لە پێشکەوتووترین کۆمارییەکانی سۆڤیەت. جا بە ڕێکەوت من لە ڕیزی

دوادواوەی زیندانییە پیاوەکانەوە بووم. لە پشـــتەوەم ڕیزی ژنەزیندانییەکان بوون. هەر بۆیە بەدەم ڕۆیشتنەوە ژنێکی گەنج لێم هاتە پێشـێ و گوتی دەکرێ تکایەکت لێ بکەم، ئەو بوخچەیەم بۆ هەڵگری؟ من تەنیا جانتـایەکی بچووکم پێ بوو. ئەو خانمە گەنجە تەمەنی لە بیست ساڵ تێنەدەپەڕی. دوو بوخـچەی پێ بوو و بەڕاســـتی هەردووکیـانی پێ هەڵنەدەگیرا. گوتم بـاشـــە. بوخچە چکۆلەکەیم لێ وەرگرت و خسـتمە سـەرشـانم. جاروبار ئـاوڕێکم دەداوە و دەمــدی بەڕوومەوە پێ دەکەنێ. مەسەلێکی فەڕەنسی هەیە دەڵێ: تا توورەگەی ژیانت پڕە لە نیعمەتی لاویەتی، هەرگیز بێ یـار و دۆســـت نـابی. ماوەیەک بەپێیان ڕۆیشـتین. هەڵبەت وردە وردە شـەکەت دەبووم و خەریک بوو دەموچاوم ئارەقەی دەکرد. ئیدی ئاوڕم نەدەداوە، نەکا ئەو خانمە هەســـت بە ماندوویەتیم بکا.

لەو دەشـــتە کـاکی بە کـاکییەدا بەرەو پێشـــەوە دەڕۆیشـــتین. کتوپڕ فەرمانیان دا بوەســـتین و گوتیان دانیشین بۆ ئەوەی بحەسێینەوە.

لەودەمەدا ژنەکە هاتە لام و دەفرەکاغەزێکی بچووکی دامێ. گوتی هێنـدێ تووتن و کـاغەزە. زینـدانییەکـانی دەوروبەرم خەنی بوون. دەمودەســـت کردمەوە، بۆنی تووتنێکی بێوێنەم بەســـەردا هات. ئەوانەی لێمەوە نزیک بوون، یەکی کاغەزێک و هێندێ تووتنم دانێ. منیش پێم نـاخۆش نەبوو جگەرەیەک بۆخۆم بپێچمەوە. بە ســـەر

سپاسم کرد. چەند دەقەیەک دواتر فەرمانیان دا هەستین. دیسان وەڕێ کەوتینەوە و مەودایەکی زۆرمان بڕی. ئاخری لە دوورەوە، لە چەقی دەشتەکەدا هێڵی دیوارێکی درێژ و کۆمەڵێک بورج و پاسەوانگەمان لێ دەرکەوتن. وەختێک گەیشتینە نزیک ئەو دیوارەی کە دەرگایەکی گەورەی هەبوو، فەرمانیان دا بوەستین. دیار بوو گەیشتووینە هەوارگەی بێگارییەکەمان. خوا بزانێ تاکەی دەبێ لە نێو ئەو دیوارە بەرزانەدا تەمەنە کورتەکەمان بڕوات. لەوانەیە ئەوە دوا هەواری ژینم بێ. نازانم بۆچی لەو دۆخەدا بێهیوایی بەسەرمدا زاڵ ببوو. لەو بیر و خەیاڵانەدا بووم کە ئەو خانمە گەنجە لێم نزیک بۆوە و بە دەنگێکی نەرم گوتی: گەنجۆ، زۆر مەمنوونم، زۆرم زەحمەت دای. بمبوورە، ناوم ئانایە. خەڵکی لیتوانیم. منیش خۆمم پێ ناساند و گوتم ناوی منیش ڕامانە. بوخچەکەی لێ وەرگرتم، بەڵام دیسان دەفرێکی دامێ و گوتی قابیلی تۆی نییە، بڕێک نان و گۆشتی بەرازە. هیوادارم ئەگەر لەم ئۆردووگایە ماینەوە، بتوانم زەحمەتەکەت قەرەبوو دەکەمەوە. منیش سپاسم کرد بۆ ئەو شتانەی پێی دام. چەند ساتێک دواتر پیاوە زیندانییەکانیان بە ڕیز بە دەرگاکەی ڕووبەڕوودا بردە نێو حەوشەی لاکەر، بەڵام زیندانییە ژنەکانیان بردە پشت دیوارەکەی ڕووبەڕوو، بۆ ئەوەی لەوێوە و بە دەرگایەکی دیکەدا بیانبەنە بەشی ژنان. سەڵا لە لاویەتی، کە نەگبەتی و نەهامەتی ناناسێ.

چاوم هەر بەدوویەوە بوو. لیتوانی، کۆمارێکی بچووکە لە وڵات و شێوەدوورگەی بالکان و بەشێک لە کۆماری سۆڤیەتی بوو.

ئێمە چووینە نێو حەوشەیەکی گەورە. ئێرە ئۆردووگایەکی بێگاری بوو. دەوراندەوری ئەو حەوشە گەورەیە، دیواری بەرز بوون، چوار پاسەوانگە لە هەر چوارگۆشەکەی دانرابوو. حەوشەکەش لە نێوەڕاستەوە بە تەلدڕوو کرابووە دووبەش و لە هێندێ شوێن کرابۆوە و دەکرا ئەمدیوەودیو بکەی. لەوبەشیان ژنانە زیندانییەکان دەهاتن و دەچوون. لە نێو حەوشەکە هۆڵی گەورە گەورە دروست کرابوون بۆ مانەوە و خەوتنگەی زیندانییەکان، کە پێیان دەگوتن باراک، لە زمانی ڕووسیدا واتە کوخ و کۆلیت.

هەر باراکێک هەشت مەتر پان و سی مەتر درێژ بوو، کە دەوراندەوری تەختی دوونهۆمی چوارکەسیی دارینیان تێدا دانابوون. لەبەر دەرگاکەوە دوو بەرمیل دانرابوو، کە تایبەتی چا یان ئاو بوون، یەکێکیان بۆ میزکردن. یەکیان لەخوارەوە شێرەیەکی تێ کرابوو. شەوانە لە سەعاتی خەوتن و پشوودان بوو، یەکێک لە بەرپرسانی لاکەر دێهات و نەفەری نێو هۆڵەکەی بەسەر دەکردەوە و ئینجا دەرگاکەی دادەخست. ئیدی ئەو دەرگایە نەدەکراوە تا سبەینێ زیندانییەکانیان بۆ بێگاری دەبردە دەرێ.

ئێمەیان کردە چەند دەستە. بە هەر دەستەیەکیان دەگوت بریگاد، کە ٣٠ تا ٤٠ کەس دەبووین. لە نێو

زیندانییەکانیش یەکێکیان دەکردە سەردەستە یان بریگادیر. سەردەستەش، پۆستێکی باش بوو بۆ زیندانی، کە کۆمەڵێک دەرەتانی باشی بۆ دەرەخساند، لە جێی خۆیدا باسیان دەکەم. نەفەرێکیش لە نێو زیندانییەکان وەکوو پارێزەر و چایچیی باراک هەڵدەبژێردرا. ئەو کەسە زیاتر پیرەپیاوێک یان کەسێکی متمانەپێکراو بوو، چونکە ئەرکی ئەو کەسە پاراستنی کەلوپەلی زیندانییەکانی باراک و گسکدان و خاوێنکردنەوەی هۆڵەکە و پڕکردنەوەی بەرمیلی ئاو و بەتاڵکردنی بەرمیلی میزەکە بوو.

ئەگەرچی ئەو کارانە ئاسان نەبوون، بەڵام هەرچۆنێک بێ لەکاری دەرەوە باشتر بوو و سەرما و گەرمای وەرزەکان لێی نەدەدا. ئەو دەستەیەی منیان ڕەگەڵ کەوتبووم، بریگادی ژمارە١٥ و هۆڵەکەشی باراکی ژمارە ٣ ، باراکی ژمارە١٥. لە باراک، جێی من لەسەر یەکێک لە تەختەخەوەکان و لەتەنیشت کوڕێکی باشی ئۆکراینییەوە بوو. سەردەستەشمان گەنجێکی ڕووس بوو، شۆرەتی ئیڤانۆڤ بوو. خۆ گوتم سەردەستە یان بریگادیر، پۆستێکی زۆر گرینگ و باش بوو لە زیندان. ئەو کاری نەدەکرد. بەڵکو کاری بە زیندانییەکان دەکرد. ئەو دیاریی دەکرد زیندانی چ کارێک بکا. هەر بۆیە دەیتوانی بۆ ئەسپاردنی کار خاوەیان لێ وەرگرێ. ئینجا چونکە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی لەگەڵ ئەندازیاران و بەرپرسانی کارگە و شوێنی کارەکە هەبوو، لەگەڵیان ساتوسەودای هەبوو. سەرەتاکان، سەردەستە بەپێی بەژن و باڵا و قەڵافەت دیاری دەکرا، بەڵام زۆربەی کەسە زیرەک و ئازا و نەترسەکان ئەو پۆستەیان دەگرتەوە.

هەر سـەردەسـتەیەک، جێگرێکیشـی بۆخۆی دەسنیشـان دەکرد. شـتە باشـەکانی دیکەی سـەردەسـتە بریتی بوون لەوەی کە ئەو خۆی قەت نەدەهاتە هۆڵی نانخواردن. بەڵکو خواردنەکەیان بۆ دێنایە باراک. لە زیندانییەکانیشـیان زیاتر بۆ تێ دەکرد، لە شـوێنی کاریش پاش ئەوەی کارەکانی دابەش دەکرد، بۆخۆی دەچووە نووسینگەی کارگە و لەگەڵ سـەردەسـتەکانی دی دادەنیشـت و جگەرەی دەکێشـا. هەر جارێکیش دیارییەک یان شـتێک لە دەرەوەڕا بۆ زیندانییەک هـاتبـایە، حەتمەن بەشـی خۆی لێ هەڵدەگرت. جۆری کەینەوبەینەی بریگادیر لەگەڵ ئەندازیاران و بەرپرسـانی ئازادی کارگەکەش نەقلێکی هەیە. دوانیوەڕۆیـان بەرەبەری تـاوپەڕان کە دەهـاتینەوە، دەیـانبردینە هۆڵی نـانخواردن و لەوێ حەشـرێک بەرپا بوو. هاوکات چەند دەسـتە وێکڕا هرووژمیـان دەبردە هۆڵی نـانخواردن. هەر دەسـتەیە و لەبەشێکی هۆڵەکە لەسەر کورسییە لاکێشەکان دادەنیشتن. جێگری هەر دەسـتەیەک لەتەنیشـت مێزی چێشـتخانەکە ڕادەوەسـتا و خواردنی دەسـتەکەی خۆی یەک یەک لە قاپدا وەردەگرت و لەسـەر مێزێکی چڵکن و پیسـی دادەنـان. زیندانییەکەی پێش پێشـەوە قاپەکەی دەدا بەوی پاش خۆی و دەستاودەست تا ئەوسەر دەچوو. بەڵام خواردنی نێو کام قاپ خۆش و چەور بوایە، ئەویش بۆخۆی دەهێشـتەوە، کە زۆر جـار نـاڕەزایەتیی ئەوانی دیکەی لێ دەکەوتەوە. بەڵام ئەو گوێی بەوە نەدەبزووت و دەسـتی بە خواردنی دەکرد. خواردنەکانیش زۆربەی جار بریتی بوون لە سـووپ یان

بڕوێشـێکی شـل شـل، یان هەرزێنێکی کوڵاو، وەکوو قبوولی. هەر کەســـە و لەتێک نانیشـــی پێ دەدرا، ســـێســـەد گرامێک دەبوو.

ئەو پشـــکەنانە، زیندانی دەیتوانی یەک جەم بیخوا یان بیکـاتە چەنـد لەت بۆ جەمەکـانی دیکەش. بەڵام چونکە هەڵگرتنی ئەســـتەم بوو، لەترســـی ئەوەی لێی نەدزن، ناچار یەک جەم دەیخوارد. پاش نانی ئێواریّ، دەچووینەوە باراک. بەرمیلی ئاوەکە پڕ دەکرا لە چا، کە ئەویش هەر ئاوی گەرم بوو و قاوەیەکیان تێ دەکرد، کە تەنیا ڕەنگەکەی تۆزێک لێڵ دەکرد.

یەکەم ڕۆژی کـارکردنمـان لە دەرەوەی ئۆردووگـا، لە شـــوێنی دروســـتکردنی چەند باڵەخانە تێپەڕی. ســـەعات شەشی بەیانی پاسەوانێک دەرگای باراکی دەکردەوە و تا ٧ زیندانییەکان دەبوو خۆیان بۆ سەر کار ئامادە بکەن.

ئەســـتەمترین کاری بەیانیان چوونە ئاودەســـت بوو. بۆ کاری ئاودەســت، دەبوو لە ڕیزێکی دوورودرێژدا ڕاوەسـتی و دواییش بچیتە شـوێنێک، کە تا بڵێی پیس بوو. بۆگەنەکەی هۆشـــی پێ نەدەهێشـــتی. هەر بۆیە پاش چەند ڕۆژان من هەڵمدەگرت بۆ شوێنی کارەکەم. سەعات ٧ی بەیانی هەموو دەســـتەکان بەڕیز لەبەر دەرگا گەورەکەی چوونەدەرەوەی ئۆردووگا ڕادەگیران. یەکێک لە قەڕەوڵەکانی زیندان ژمارەی دەستەکانی لە دەفتەرێکدا دەنووسی و پاش چوونە دەرەوە، پاســـەوانی ئۆردوو، دەســـتەکەی ســـەرژمێری دەکرد و ڕادەستی فەرماندەی ئەو سـەربازە چەکدارانەی دەکردن کە لە دەرەوە بوون و پاش ئەوەی دەستەکان ڕادەست دەکران،

فەرماندەی سەربازەکان فەرمانی دەدا وەڕێ بکەون بۆ شوێنی کارکردن. زیندانی ئارام و بێدەنگ لە گەمارۆی چەکدارەکان لەو دەشتە ڕووتەنەدا وەڕێ دەکەوتن. ئەگەرچی دەستەکە لە یەک شوێن کاریان دەکرد، هێندێ لە بەشی ڕێگەوبان و هێندێ لە بەشی بیناسازی و هێندێ لە کانگەی ڕەژوو. شوێنی کارەکان چەند کیلۆمەترێک لە ئۆردووگاکە دوور بوون. سەعات هەشتی بەیانی دەگەیشتینە سەر کار. سەردەستەکان لەژێر چاودێریی ئەندازیاردا کاروبارەکەیان بۆ دەستنیشان دەکردین و تا سەعات ١٢ کارمان دەکرد. لە ١٢ تا ١ پشوو بوو و لە سەعات یەکەوە دەچووینەوە سەر کار تا سەعات ٥. ڕیزمان دەبەست و پاش سەرژمێری ودڵنیابوونەوە لەوەی کە تەواوین، دەیانهێنایەوە ئۆردووگا و پاش دابودەستووری ڕادەستکردنەوە، کە بەڕاستی بێزارکەر بوون، دەچووینەوە باراک و چاوەڕێی نانی ئێوارە دەبووین. بە زگی برسی و شەکەت و بێزار لە چاوەڕوانییەکی تاقەتبڕدا. ئەوە بوو بەرنامەی هەموو ڕۆژێی ئۆردووگا. هەڵبەت ڕۆژانی یەکشەممە پشوو بوو. خواردنی کەم و کاری زۆر و پڕزەحمەت، ئەویش بەبێ هەق و مز، زیندانییەکانی کردبووە ئێسک و پێست، بەتایبەتی ئەوانەی زۆرخۆر بوون، زۆر زەحمەت بوو. سەوزە و میوە هەر ناویشی نەبوو.

لەو دۆخەدا زیندانی هەوڵیان دەدا هەرچۆنێک بووە، خۆیان لە کار بدزنەوە. هەربۆیە زۆر جار خۆیان نەخۆش

دەخست. هێندێ سیریان لەبن باڵی خۆیان هەڵدەسوی و دەچوونە لای پزیشک. پزیشک کە دەرەجەی وەبن باڵیان دەدا، ئیدی زەحمەتی زیندانی و خورانی بن باڵی بێ ئاکام دەمایەوە.

هێندێ زیندانی بۆ ڕزگاربوون لە کاری تاقەتپڕووکێن، پەنجەی دەست یان قاچی خۆیان دەپەڕاند. هەڵبەت ئەگەر ڕوون بووبایەتەوە و سەلمێنرابا بە ئانقەست بووە، چەند ساڵێک دەخرایە سەر زیندانییەکەی. کەچی ئاواش زیندانی، چەند ساڵ زیندانیکێشانی پێ باشتر بوو لەو کارە تاقەتبڕە. ئەو جۆرە زیندانییانە پاش ئەوەی شوێنی ئۆردووەکەیان دەگۆڕین، کاری پاکوخاوێنیی باراک و ئەو شتانەیان پێ دەسپاردن.

## جۆرەکانی کاری ئۆردووگا

ئۆردووگاکەی ئێمە لە دەم دەریاچەی بالخامێش بوو. زۆربەی زیندانییەکانی ئەو ئۆردووگایە لە کانگەکانی بەردەڕەژوودا کاریان دەکرد. جا چونکە بە ڕاستی کارکردنی لەو کانگایانەدا زۆر زەحمەت بوو، دایمە زیندانییە گەنج و حەساوەکانیان بۆ ئەوێ دیاری دەکرد. من مانگێک لە کانگەی بەردەڕەژووی بالخامێش کارم کرد. جلوبەرگی کرێکارانی کانگا لەوانی دی جیاواز بوو. کڵاوی ئاسن و پانتۆڵ و ژاکێتی پلاستیکی و چەکمەی پلاستیکی و دەستەوانەی تایبەتی کرێکارانی کانگا. کڵاوەکە، لایتێکی پێوە بوو.

بەیانیان کە دەگەیشتینە شوێنی کارەکە، بە ئاسانسەرێک بەرێی نێو کانگاکە دەکراین و هەر دەستەیەی کە سێ یان چوار کەس دەبووین، بەرەو لایەکی دەڕۆیشتین. ناوی ناوچەی ڕەژوودەردانەکە بە زمانی ڕووسی "زۆنۆها بوو. ڕاڕەوەکانی کانگە بە گڵۆپ ڕووناک کرابوونەوە. بەڵام نێو زۆنۆکان تاریک بوون و بە لایت لەوێدا کارمان دەکرد. لە نێو زۆنۆدا، یەکێک بە قوڵینگێکی بچووک و کورت، ئەو ڕەژووەی ڕەگ ڕەگ لە نێو دیوارەی کانگەکەدا بوو، هەڵدەکەند و ئەوی دی بە بێڵووکەیەک خڕی دەکردەوە و لە فارگۆنە بچووک بچووکی دەکردن و سێیەم کەسیش فارگۆنە بچووکەکانی بەرەو دەرگای دەرەوە لێ دەخوڕی و لەوێوە بە

ئاسانسەر دەنێردرایە دەرەوە و لە دەرەوە بەتاڵ دەکران. ڤارگۆنە بەتاڵەکەیان دەهێنایەوە نێو کانگا.

چەند ڕۆژ جارێک، شەمەندەفەرێکی باربەر دەهاتە شوێنی ڕەژووەکان و کۆمەڵێک زیندانیی دیکە باریان دەکرد و وەڕێ دەکەوت. نێو زۆنۆکان، جگە لە تاریکی، تەڕ و شێداریش بوو، چونکە دڵۆپەی دەکرد.

ئینجا چونکە زۆریش نزم بوو، کرێکارەکان بە دانیشتنەوەوە کاریان دەکرد. ناوەوەش ئەگەرچی شەوانە بە دەزگای هەواگۆڕ، گازەکەی بەتاڵ دەکرا و پاک دەکراوە، کەچی لەکاتی کارکردندا جاری وابوو گۆشەیەکی کانگاکە دادەڕووخا و لەگەڵ ڕەژووەکەدا گازێکی خنکێنەری توند بەنێو کانگاکا بڵاو دەبۆوە.

لەوکاتەدا بەرپرسانی کانگا فیکەیەکی بەرز و درێژیان لێ دەدا، بۆ ئەوەی کرێکارانی نێو زۆنۆکان خێرا بێنە دەرێ. جا چونکە کاری کانگا زۆر قورس و تاقەتبڕ بوو، سەعاتی کار لە کانگا لە شەش سەعات پتر نەبوو. بەڵام بۆ ئەوەی ڕەژوودەرهێنانەکە نەوەستێ، کرێکارەکانیان بەسەر سێ یان چوار جەمدا دابەش کردبوو.

ئینجا خواردنی کرێکارانی کانگاش لە زیندانییەکانی دی باشتر بوو. من لە مانگێک پتر بەرگەی کاری کانگام نەگرت. نەخۆش کەوتم و پزیشک نووسی کە من دەبێ لە شوێنی کراوە کارم پێ بکرێ. کارێکی دیکەی ئۆردووگا بەرد دەرهێنان بوو. کانگای بەرد لە داوێنی چیاکان و بەرزاییەکان بوو. جۆری کارکردن لەو کانگایانەشدا ئاوا بوو. بەیانیان کە لەگەڵ بریگاد دەگەیشتە شوێنی کار، چەند کەسێک

پێکەوە دەستەیەکی بچووکیان پێک دێنا و بەشێک لە کانگەی بەردەکەیان دەگرتە ئەستۆ. ئەو چەند کەسە کارەکانیان لەنێوان خۆیاندا بەش دەکرد. یەک یان دوو کەس بە قولینگ و مەڵغە بەردەکانیان هەڵدەکەند و ئەگەر بەردەکە زۆر گەورە بوایە، بە کوتک و چەکوچ دەیانشکاند. دوو کەسیش بەردە هەڵکەنراوەکانیان هەڵدەگرت و لە لایەک هەڵیاندەداوە. بە جۆرێک کە بکرێ بەردە هەڵکەنراوەکە بە مەتری چوارگۆشە پێوانە بکەن بۆ ئەوەی دەر کەوێ دەستەی بچووک ئەمڕۆ چەند مەتر چوارگۆشە بەردی دەرهێناوە. هەڵبەت لە دوایین ڕۆژی کاردا بریگادیر کۆی کارە کراوەکەی یادداشت دەکرد. هەڵبەت چونکە هیچ هاندان و خەڵات و پاداشتێک لەگۆڕێ نەبوو، بۆیە زیندانییەکانیش هەر ئەوەندەیان کار دەکرد کە بریگادیر هاواری لێ هەڵنەستێ و بەگژیاندا نەیە. ئینجا گزی و فزییش دەکرا. بەردەکانیان جۆرێک لەسەر یەک هەڵدەچنی، کە ناوەوەی بەتاڵ و بۆش بێ یان پڕیان دەکرد لە گڵ. ئاوا کارەکە زۆر دیار دەبوو، بەڵام لە ڕاستیدا کەم بوو. جگە لە قورسی و ئەستەمیی کارەکە هەم هەڵکەندن و شکاندنی بەردەکان و هەمیش گواستنەوە و کۆگاکردنیان، ئەو کارە بە هاوین و زستان ئەستەمتر دەبوو. هاوینانە ئەوەندە گەرم بوو، تین و تاقەتی لێ دەبڕین. شەڵاڵی ئارەقە دەبووین، ئاوی ساردیشمان پێ نەبوو تینوێتیمانی پێ بشکێنین. زستانانەش جگە لەوەی هەواکەی لەڕادەبەدەر سارد

بوو، کارکردن لەو هەوا ساردەدا بەو کەرەستە ئاسنینە ساردانە و لە نێو قوڕی بەستووی نێو بەردەکاندا زۆر زۆر ئەستەم بوو، جا چونکە شوێنێکیش نەبوو خۆی لێ گەرم بکەینەوە، دەبوو بەردەوام کار بکەین، بۆ ئەوەی لەسەرمان ڕەق هەڵنەیەین.

کارێکی دیکەی ئەوئۆردووگایە بەستنی ئاسنەڕێ بوو. ماوەیەک کە خەریکی ئەو کارە بووم، چۆنیەتیی کارکردنەکەی فێر بووم، هەڵبەت ئەو کارە لەوانی دیکە سادەتر و ئاسانتر بوو. لەپێشدا لەژێر چاودێریی ئەندازیاری ڕێگەوباندا، ڕێگەیەکی خۆڵ بە زیندانییەکان ئامادە دەکرا. دەبوو جادەکە زۆر توند و پتەو بێ، بۆ ئەوەی دواتر هەڵنەوەرێ و ڕۆ نەچێ. پاش دروستکردنی جادەکە، نۆرە دەهاتە سەر دانانی ئاسنەڕێیەکان.

لەپێشدا تەختەی ئەستوور ئەستووری یەک ئەندازە کە پێیان دەگوترا شەپاڵ، لەسەر جادەکە و بە مەودای دەسنیشانکراو ڕیز دەکران و ئەوجار ئاسنەڕێیەکەیان لەسەر دادەنان و بە ئامێرێکی تایبەتی، هەم مەودای نێوان دوو ئاسنەڕێیەکە و هەم بەرزی و نزمییەکەیان ئەندازەی دەگیرا و کۆنترۆڵ دەکرا. پاش ئەوەی لەو دوو کارە گرینگە دڵنیا دەبوونەوە، لە ناوەوە و دیوی دەرەوە، بە بزماری تایبەت کە سەرێکیان چەمابۆوە، ئاسنەکانیان لە تەختەکانی ژێرەوە دەبەستەوە. بەشێوەیەک کە ئاسنەکان نە بەرەو ناوەوە و نە بەرەو دواوە دەجووڵان. هەڵبەت ئاسنەکان هێندەی پەنجەیەک لێک دوور بوون، بۆ ئەوەی وەختێک بەگەرمای هاوینێ لێک

دەرەوێنەوە، زۆر بۆ یەکتر نەهێنن. کارکردن لە ئاسنەڕێدا جگە لە لایەنە تەکنیکییەکەی، زۆریش خۆش بوو.

بەرپرسانی ئاسنەڕێش بۆ هاندانی زیندانییەکان، هێندێ پارمەتییان دەدان. یان تووتنیان دەدانێ، یان چەند دەفرێکی گەورەی نانی ڕەشیان دێنا، کە زیندانییەکان لەنێو خۆیان دابەشی بکەن.

جۆرێکی دیکەی کاری ئۆردووگا، کاری بیناسازی بوو، کە لە ئۆردووگاکە بە زیندانییەکانیان دەکرد. لەوەدا، هەر لە بەردی بناغەوە تا کاری سپیکاری و نەقاشی و دەرگا و پەنجەرە تەواو دەبوو، هەر هەمووی بە زیندانییەکان دەکرا و ئەندازیار بەسەریان ڕادەگەیشتن. شتێکی باشی هەبوو، ئەویش ئەوە بوو، کارەکە لە ناوەوەی بیناکان بوو و دەشتتوانی لەگەڵ خەڵکی دەرەوە پەیوەندیت هەبێ. ئەوانەی کە ئازاد بوون، لە ڕێی ئەوانەوە دەکرا پێویستییەکانت دابین بکەی، هەڵبەت ئەگەر پارەت هەبوایە. جگە لەوە، هێندێ حەشارگە لە نێو بیناکاندا دروست دەکران، کە لەو ڕێگەیەوە دەکرا پەیوەندی لەگەڵ کرێکارە ژنەکان یان ژنانی دەرەوەی کارگە ببەستی. بەو شێوەیە، کە ژنێک، پێش ئەوەی زیندانییەکان بگەنە شوێنی کارەکەیان، یانی بەیانی زوو، خۆی دەگەیاندە حەشارگەکە و لەوێ دەمایەوە و لە درێژایی ڕۆژ و ماوەی کاردا دەیتوانی لەگەڵ ئەو کەسە بێ کە حەزی لێی بوو. پاسەوانەکانیش قەت نەدەهاتنە نێو کارگەکەوە. پاش ئەوەی زیندانییەکان دەچوونەوە

ئۆردووگا، ژنەش لە حەشارگەکە دەهاتە دەرێ و وەشوێن کاروباری خۆی دەکەوت. هەڵبەت زیاتر سەردەستەکان ئەوەیان دەکرد و کرێکار تین و تاقەتی ئەو شتانەی تێدا نەبوو.

ڕۆژانە پاش ئەوەی لە کار دەگەڕاینەوە، دیمەنی هرووژمی ئەو خەڵکە برسییە بۆ هڵی نانخواردن، کە لەوێش تەنیا بڕەخواردنێکی مەمرەومەژییان دەداینێ، سەرنجڕاکێش بوو. کەوچک، وەکوو چەکی دەست سەرباز وابوو. چەنگاڵ نەبوو، چونکە خواردنێکیان نەدەداینێ پێویستی بە چەنگاڵ بێ. چێشتەکە، یان سووپ یان کاشا بوو، کە شتێکی وەکوو قبوولی بوو، کە هەردووکیان بە کەوچک دەخوران. پاش فراوین، کە بە ڕۆژ هەر ئەو جەمە خواردنە بوو، زیندانی بە زگی برسی لە هۆڵەکە دەچوونە دەرێ.

بەڵام ئەگەر زیندانییەک توانیبای چێشتلێنەر یان بەرپرسی چێشتلێنەرەکان ببینێ و بەرتیلێکی بداتێ یان ئەگەر خەڵکی مەڵبەندێک بوایەن، دیسان خۆی دەگەیاندەوە هۆڵەکە و دەچووە پێش مێزی چێشتخانە و وەکوو سواڵکەری منجڕ دیسان دەفرەکەی ڕادەگرت و لەگۆشەیەک بەپەلەپەل دەیخوارد.

منیش وەکوو ئەوانی دی دایمە برسی بووم، بەڵام چونکە هەر بۆخۆم کەسێکی زۆرخۆر نەبووم، بەو بڕە خواردنە قەناعەتم دەکرد و زۆر ناڕەحەت نەدەبووم، بەڵام سوێندم لەسەر نییە ئەگەر بڵێم زۆربەی شەوان تەنیا خەونم بە خواردن و چۆنیەتیی نانخواردن و تێربوونەوە دەدی. هیچ شتێک هێندەی برسیەتی، کەسایەتی و سۆزی مرۆڤ

ناشـکێنێ. من بەچاوی خۆم سـەرهەنگێکی زیندانیم دی، کە لە نێو ئاودەست قوونچکە جگەرەی کۆ دەکردەوە.

جارێکیان، کۆمەڵێک زیندانیی خەڵکی چین لە برسـان هێندێ گیایان کۆ کردبۆوە و کوڵاندبوویان بۆ ئەوەی برسـیەتییەکەیان بشـکێ. داماوانە تووشـی سـکچوون بوون، چەند کەسێکیان پێی مردن. شـەش مانگێک دەبوو لەو ئۆردووگایە بووم، برسـیەتی هێندەی زۆر هێنابوو، جیا لە خواردن بیرم لە هیچ نەدەکردەوە.

زیندانییەکی خەڵکی گورجسـتان، هـاوشـاری و هاووڵاتیی سـتالینی ڕێبەری مەزنی کۆمۆنیسـتەکان بەناوی ئیلیا شـڤیلی کە لە دەسـتەکەی ئێمەدا بوو و وەختێک هات، گەنجێکی چوارشـانەی پتەو بوو، پاش چەند مـانـگ کـارکردن و مـانەوەی لەو لاکەرە، لەبەر بەدخۆراکی و برسیەتی گۆشتی بە لەشیەوە نەما و وەک تەشی باریک بوو. تۆزی خەمێک لە ڕوخساری نیشتبوو. بە حاسـتەم بەڕێیەدا دەڕۆیشـت و بەنووزەنووز دەنگی دەهـاتە دەر. بە زەحمەتیش دەیتوانی بچێتەوە سـەر تەختی خەوەکەی کە لە سـەرەوە بوو. هەر جـارێکی دەچووە سـەر تەختەکەی، لەجێی خۆی ئارام و بێدەنگ دادەنیشت. کە قسەشمان لەگەڵ دەکردن یان گاڵتەیەکمان دەکرد، بەحاسـتەم لێوی دەبزووت و ددانە سـپی و ڕێک و جوانەکانی تۆزێک دەردەکەوتن. بەڵام قەت نەمدی جگە لە زەردەخەنەیەکی سـارد، شـوێنەواری شـادی لە ڕوخسـاریدا دەرکەوێ. ڕۆژێـک پـاش ئەوەی لەکـار

گەڕاینەوە ئاگاداریان کردەوە بوخچەیەکی بۆ هاتووە. گوێی نەدایە. لەپێشـــدا لەگەڵ ئێمە هاتە هۆڵی نانخواردن و ئەوەی دایانێ، دەمودەسـت خواردی. دوای ئەوەی تۆزێک بووژاوە، بە هەنگـاوی پتەو و پڕهیوا چوو بوخچەکەی وەرگرێ. نازانم بوخچەکە چیی تێدا بوو، بەڵام دیتم وەختێک هاتەوە هۆڵی بـاراک و چووە ســـەر تەختەکەی، دەفرەکـاغەزێکی گەورەی کە سێ کیلۆ نانی ڕەشی تێدابوو لەپێش خۆی دانا و بە لەگەڵ ڕۆنی بەراز، کە بەدڵنیاییەوە لەگەڵ بوخچەکەدا بۆی هاتبوو، لەبەرچاوی زیندانییەکانی دی کەوتە خواردن. بەناچـاری و بۆ ئەوەی لە تیری نیگـای زینـدانییەکـانی دی ڕزگاری بێ، بەپەلەپەل و دەمودەسـت ئەو سـێ کلیلۆ نانەی بە ڕۆنەکەوە خوارد و دەستی لێک خشاند و گەش بۆوە.

لەپێشـــدا لەســـەر تەختەکەی درێژ بوو و چەند ســاتێک ناڵاندی. تومەز پاش ئەو هەمووە برســـــیەتییە، کتوپڕ ئەو هەمووە خواردنە بەڵای گیـانی بوو. جـار بە جـار دەنگی نــاڵینی بەرزتر دەبۆوە و هەردوو دەســـــتی بە زگییەوە گرتبوو. زیندانییەکان پێیان گوت هەستە بڕێک وەرە و بچۆ، بەڵام ئەو تینی لەبەردا نەبوو. زینـدانییەکـان چوون ســـەردەســـتەیان ئاگادار کردەوە. ناوبراو بە یارمەتیی چەند کەســـێک شـــڤێلییان هێنا خوارێ. چوونە بن باڵی و بردیانە دەرمانخانەی ئۆردووگا. پزیشـکی ئێشـکگر تۆزێ شـەربەتی دایێ، بەڵام سـوودی نەبوو. ناچار بردیانە نەخۆشـخانە، کە لە دەرەوەی لاکەر بوو. ئێمە ســـبەینێ بەبێ ئێلیا چووینە ســـەر کار. دوانیوەڕۆ کە هاتینەوە هەواڵێکی ناخۆشـــمان بیست، گوتیان بەو زگئێشەیە مردووە.

مەرگی ئیلیا بەبێدەنگی و وەک هیچ شـــتێک ڕووی نەدابێ، بڕایەوە. زیندانییەکی ئەویان لەجێی دانا. بەڵم من لەخۆوە پێم خۆش بوو بزانم ئیلیایان لە کوێ ناشــتووە. لە زۆر کەســـم پرســـی، کەس لێی ڕوون نەبوو. چەند زیندانییەک کە لەمێژ بوو لە لاکەر مابوونەوە، دەیانگوت هەر کەس بمرێ، لە دەوری زینـدان لە قووڵکەیەکی دەخەن و گلی وەسەر دەکەن.

سەرەڕای ئەوەی دەمزانی مەرگ لە دەریادا بێ یان لە وشـکانی فەرقێکی نییە، بەڵام هەر ئەوەم پێ بێڕێزی بوو بە کەسایەتیی مرۆیی.

ئەو دۆخە پڕ نەگبەتی و تـاقەتبڕە، خواردنی کەم و نەگونجاو لەلایەک و ئەو جلوبەرگە کۆن و شـڕەی لەبەر زینـدانییەکـانـدا بوو لەلایەکی دیکەوە ســـەروبیچمی زیندانییەکان زۆر سەیر و سەمەرە بوو. جلە دڕاوەکانیان بە دەرزی و داو دەدووریەوە. جلوبەرگی زینـدانییەکـان یان زۆر فشـوفۆڵ بوو بۆ بەریان، یان زۆر تەسـک بوو. ســـواڵکەرەکانی شـــاری خۆمان جلەکانیان زۆر لە ئی زیندانییەکان باشـتر بوو. لە وەرزی سـەرما و زسـتاناندا ئەو جلوبەرگە شـــڕانە بەهۆی شـــێداربوونی هەواکە و کارکردن لە شـــوێنی پڕ لە بەفر و تەڕاییدا، ڕۆژ هەتا ئێواری زینـدانی هەڵـدەلەرزین. شـــەوانە، جلوبەرگ و چەکمە لبادییە تەڕەکانیان لێک دەبەســـت و دەیانبردنە گەرمخانە کە شـوێنی وشـککردنەوەی جلە تەڕەکان بوو، بەیانیان وەریاندەگرتنەوە.

ژیانمان ئاوا تێدەپەڕی. من ڕۆژ بەڕۆژ بێهێزتر دەبووم. بەهار و هاوین ڕابردن. دیسان پاییز داهات، بە کۆڵێک خەم و خەفەتەوە، ئەو ساڵە لەڕادەبەدەر هەستم بە سەرما دەکرد. پێم وایە چونکە لاوازیش ببووم، بۆیە زیاترم سەرما دەبوو.

ڕۆژێکیان کە لە کار دەهاتینەوە هەستم کرد سەرم ژان دەکا. بە زەحمەت تفم پێ قووت دەدرا. تام لێ بوو. کە هاتینەوە، بە یەکێک لە زیندانییەکانی نێو دەستەکەمانم گوت، خواردنەکەمم بۆ وەرگرێ و بۆم بێنێتە باراک. بۆخۆم دەچمە بنکەی تەندروستی. سەرەڕای ئەوەی بەپەلەش خۆمم گەیاندە ئەوێ، بەڵام سەعاتێکی خایاند تا نۆرەی پشکنیم هات. دکتۆر ترپەی دڵمی گرت و گوتی تات لێیە. زارم داپچڕی و دەرەجەشی وەبن باڵم دا. تایەکەم ۳۹ دەرەجە بوو. نووسیی، سێ ڕۆژ بمنێرنە خەستەخانە. ئینجا چەند حەبێکیشی دامێ. گەڕامەوە باراک. سەرەڕای ئەوەی هیچ حەزیشم نەدەچووە خواردنە ساردەکە، بە زۆری خواردم. بۆ سبەینێ بە پاسەوانێکدا ناردیانمە خەستەخانە. تەختێکم گرتەوە. سەرەڕای ئەوەی زۆر ناڕەحەت بووم و قوڕگم زۆر دێشا، بەڵام ئارامی و پاکوخاوێنیی نێو خەستەخانەکە زۆر کاریگەریی لەسەر هێورکردنەوەی مێشک و دەمارم هەبوو. بە ئاواتەوە بووم زیاتر لە خەستەخانە ڕامگرن. خواردنی ئەوێ باشتر و دەرمان و شوێنە خۆشەکەی، بوو بەهۆی ئەوەی سێیەم ڕۆژ چاک بمەوە. دڵنیام بووم سبەینێ دەگەڕێمەوە ئۆردوو. بەڵام باش بوو لەگەڵ دکتۆرێکی جوولەکە بەناوی دانیەل بارانۆڤ

ئاشــنا بووم. پزیشــکێکی پســپۆڕی چاو بوو. ئەو ڕۆژە ناســـیم کە هاتبوو چاوی نەخۆشـــێک بپشـــکنێ، کە لە کانگەی ڕەژوودا چاوی زەبرێکی وێ کەوتبوو. کە زانیی ئێرانیم، لەگەڵ خۆی بردمی بۆ حەوشـــەی خەســـتەخانە. پاش هێندێ قسـە و باس، گوتی منیش زیندانیم و هەشت ســاڵە لێرەم و ماومەتەوە. ئەگەرچی ماوەی زیندانییەکەم دە ســـاڵە، بەڵام دڵنیام پاش تەواوبوونی حوکمەکەشـــم ئازادم ناکەن. لێی پرســـیم چەند ڕۆژیان پشـــوو بۆ نووســیوی؟ گوتم ســێ ڕۆژ. گوتی من پێیان دەڵێم چوار ڕۆژی دیکەشـــی بخەنە ســـەر. دوایی دەرفەتمان دەبێ پێکەوە قسە بکەین. زۆر خۆشحاڵ بووم و سپاسم کرد. گوتی ئێســـتـا بڕۆوە ســـەر تەختەکەت و وا بنوێنە ناڕەحەتی. لەسەر پێشنیاری وی، چوار ڕۆژی دیکەشیان بۆ نووسیم.

دکتۆر دانیەل دوانیوەڕۆی ســـبەینێ هاتە لام. لەگەڵ خۆی بردمیە حەوشـــەی خەســـتەخانە. گوتی ڕامان من زۆرم نەماوە دەڕۆم. گوتم زۆرم پێ خۆش دەبێ. دکتۆر، چ لەوە باشـــتر کە لێرە ڕزگار دەبی و ئازاد دەبی. گوتی نا ئازادی و شـــتی چی. لەگەڵ خۆیان دەمبەن. پرســـیم چۆن؟ کێ دەتبا؟ گوتی فڕۆکەیەکی ئیســرائیلی دێتە ئێرە، لەوانەیە هەلیکۆپتەرێک لەو حەوشەیە بنیشێتەوە و لەگەڵ خۆی بمبا. گوتم خوا بکا لەو چەند ڕۆژەدا کە من لە خەستەخانەم ئەوە ڕوو بدا، بەشکم منیش لەگەڵ تۆ لەو دۆزەخە ڕزگار بم. بەڵام لەدڵی خۆمدا بە ساویلکەییەکەی

پێدەکەنیم. دڵنیا بووم دکتۆر تێک چووە. لێم پرسی، مەگەر دکتۆر، ئیسرایبل ئاگادارە تۆ لەم ئۆردووگایەی؟ ئەی چۆن ئاگادار بوونەتەوە.؟ گوتی ئەوە نهێنییە و نابێ ئاشکرا بکرێ. دڵنیا بووم دکتۆر هێندەی خەیاڵ کردووە و ئەوەندەی گوشاری دەروونی لەسەر بووە، تووشی جۆرێک مالیخۆلیا بووە. هەموو ڕۆژێ دەهاتە سەردانم و ئەو قسانەی دەکرد و منیش بە تاسەوە گوێم بۆ دەگرت. حەوت ڕۆژەی پشوو و چارەسەری من تەواو بوو و کۆپتەرە ئیسراییلییەکەش سۆراغی نەبوو. گوتی ئەگەر نەڕۆیشتم، دەتهێنمەوە ئێرە. سپاسیم کرد و بە ورەیەکی باشترەوە گەڕامەوە ئۆردووگا. دیسان هەمان تاس و حەمام. نانی ڕەق و دۆی ترش.

دوو ساڵ و چەند مانگێک بوو لەو ئۆردووگایە بووم. لەو ماوەیەدا، چەند جارێک سکاڵای تێروتەسەلم بۆ ئەنجومەنی تایبەتی نووسی، بەڵام وەڵامێکم وەرنەگرتەوە. تاقە شتێکی لەو کونەدا سوکنایی دەدامێ، خوێندنەوەی ئەدەبیاتی ڕووسی بوو و لەوەشدا کەلکم لە توانا و زانیارییەکانی گەنجێکی خەڵکی مۆسکۆ وەردەگرت کە ناوی میشا بوو و لەگەڵ دەستەکەمان بوو. گەلێ بەسەرهاتی لۆرمۆنتۆڤ و پووشکینی بۆ دەگێڕامەوە. کەس وەکوو پووشکین حازرجواب نەبووە. دەیگێڕاوە وەختایەکی پووشکیان بانگهێشت دەکەن بۆ کۆڕی یەکێک لە دەوڵەمەندە خانەدانەکان و دەیانەوێ سەر بکەنە سەری. لەسەر نانخواردن، میوانەکان یەک یەک لەسەر سفرە هەڵدەستن و بەپێوە نان دەخۆن. لەو حاڵەتەدا یەکێک بە پووشکین دەڵێن، ئەلکساندر سێرگیڤیچ، بۆ هێندێ بێ تەربییەتی، هەموویان

بەپێوە نــان دەخۆن، هەر تۆ بەدانیشــــتنەوە خەریــک خواردنی. ئەویش دەڵێ، خەتــای من نییە مرۆڤ هەر هەمووی بەدانیشتنەوە نانی دەخۆن.

دیسان دەیگێڕاوە ڕۆژێکیان لە شەقام یەکێک شان لە شــانی پووشــکین دەدا و ئینجا بە پووشــکین دەڵێ هەی گوێــدرێژ، ئەویش بەبێ ئەوەی وەڕووی خۆی بێنێ، دەســــتی بەرەو کابرا ڕادەدێرێ و دەڵێ: ئەلکســــاندر سێرگیڤیچ پووشکین.

ئەو هاوڕێ و هاودەســتەیەی من، واتە میشــا، هەر کە برسییەتی بەرۆکی دەکرد، خەمبار دەبوو و دەژاکا. بەڵام لەگەڵ تێر دەبوو، دەگەشاوە و قسەی خۆش و نەستەقی دەکرد. هەر بۆیە دەوروبەر هەوڵیــان دەدا لەبەشــــی خۆشیان شتێکی هەر بدەنێ بۆوەی تێر بێ و بمانخافڵێنێ.

ئەویش دە ســــاڵی بۆ بڕابۆوە. دەیگوت ڕامان، پێکەوە دەچینە مۆسکۆ و دوو ژنی ڕووسی دێنین، تۆ من ببەوە بۆ ئێران. بەڵام بە قســــمەت نەبوو. نە ئەو منی بردەوە مۆسکۆ و نە من ئەوم هێنایە ئێران.

# ئاننا

سەرەتا کە هاتمە ئەم ئۆردووگایە، حەفتەیەکی پێ چوو، توانیم چاوم بە ئانا بکەوێتەوە. هەر ئەو ئاننایەی کە لە ڕێیە بوخچەکەی پێ هەڵگرتبووم. ڕۆژێکیان کە لە کار دەگەڕامەوە، ئاگادار کرامەوە خانمێک لەوبەری تەلدڕووەکە کاری پێتە. خۆم گەیاندە ئەوێ، سەیر دەکەم ئاننایە. چاکوچۆنیم لەگەڵ کرد و ئەحواڵیم پرسی. گوتی خراپ نیم. ئەوجار دەفرێکی دامێ، هێندێ تووتن و چەند پارچەیەک ڕۆنی بەرازی تێدا بوو. پاسەوانەکە لە سەرەوەڕا ئاگای لێمان بوو، بەڵام هیچی نەدەگوت، چونکە شتی ناوەوە پەیوەندیی بەوەوە نەبوو. ئەو تەنیا دانرابوو کەس ڕا نەکا. حەفتەی دواتر، لە ڕۆژی پشوودا لە تەلدڕووەکە پەڕیمەوە و چوومە لاکەری ژنان بۆ لای ئاننا. باراکی ژنەکان زۆر لە ئی ئێمە خاوێنتر بوو. هەر لە تەنیشت ئاننا دانیشتم، کچەکانی دیکە لێمان دوور کەوتنەوە، پێیان وابوو پێویستمان بەوەیە دەورمان چۆل بێ. بەڵام جارەکانی دی کە چوومەوە، تێگەیشتن پێوەندییەکەمان تەنیا پەیوەندییەکی ڕاستگۆیانە، ئیتر دادەنیشتن و تەنانەت قسەشیان لەگەڵ دەکردین. بۆ خواردن بەخشینیش دڵاوا بوون. ئەگەرچی زۆریش برسی بووم، شەرمم دەکرد شتێک بخۆم، بەڵام بە ڕاستی لەو دوو ساڵ و چەند مانگەدا یارمەتییەکانی ئاننا نەبوایە، نازانم چیم بەسەر دەهات. دۆخی زیندانییە ژنەکان بۆیە لە پیاوان باشتر بوو، چونکە ئەوان زۆر جار لەلایەن بنەماڵەکانیانەوە یارمەتییان بۆ دەهات. ئینجا دزی و

ملهوڕپیشـــیان لەنێودا نەبوو. جگە لەوەش، زۆربەیان لە عەمباری پەتاپتە و گێزەر و چەوەندەر و ئەوانەدا کاریان دەکرد. ئاننا تەنیا دوو ســـاڵ لە من بچووکتر بوو و ئەو وردە جیـاوازییەی تەمەن لە نێو ئەورووپییەکـانـدا زۆر گونجـاو بوو. هەرچۆنێـک بێ من نەمـدەتوانی جوابی چـاکەی نەدەمەوەز بەڵێنم پێ دا ئەگەر ئـازاد کرام و دەرەتـان هەبوو، لەگەڵی بژیم. ئەگەرچی ئەو لە هەموو لایەنێکەوە لێوەشــاوە بوو، بەڵام من نە ئازادبوونی خۆم دڵنیـا بووم و نە هیوام بە داهـاتووی خۆم هەبوو. پێم وابوو ئـاننـا تـا ئەودەمە لەگەڵ هیچ پیـاوێکی شـــەرقی پێوەندیی نەبووە و هیچ قەول و قەرارێکیشـــی دانەناوە، ئاواش دڵنیا بووم کە ڕاستگۆیی و وەفاداری پێوەندییەکی ئەوتۆی بە شـــەرقی و غەربیبوونەوە نییە. ســـەرەڕای ئەوەی کە دەمتوانی ئـاننـا بێنمە لاکەری خۆم، بەڵام هەرگیز ئەوەم نەکرد، چونکە لە نێو پیاوانی ســـۆڤیەتیدا نەمدەدی ڕێزی ژنان بگرن.

جارێکیان جوان لەبیرمە شـــەوێ پاش داخرانی دەرگای بـاراک دیـار بوو دوو ژن لە لاکەری ژنـانەوە هـاتوونەتە باراکی ئێمە و خۆیان لە بن تەختەخەوەکان شـاردووەتەوە، بۆ ئەوەی لەکاتی سەرژمێریی شەوانەدا ئاگایان لێیان نەبێ. یەکێک لە سەردەستەکان ڕایگەیاند، ئەگەر یەکێک حەز دەکا با لەگەڵیان بخەوێ، بەڵام کەس بەقسەی نەکرد. نەک لەبەر ئەوەی بڵێی پێیان شـــەرم بووبێ، نەخێر، لەبەر ئەوەی کار و کوێرەوەریی ڕۆژانە تین و گوڕ و بڕســـتی لە پیـاوان بڕیبوو.

# ئۆردووگای بایکانور

سەرەتای بەهاری ساڵی ١٣٣٠ی هەتاوی بوو. زستانە سارد و گورچووبڕەکەم بەڕێ کردبوو. ڕۆژێکیان بەیانی کە خۆمم ئامادە دەکرد بچمە سەر کار، من و کۆمەڵێک زیندانیی دیکەیان ئاگادار کردەوە، کە نەچینە سەر کار. هەرچەندە نەمدەزانی لەبەر چی، بەڵام هەر ئەوەی کە نەدەچوومە سەر کار، خەنیمەتێک بوو. دوایی پێیان گوتین، خۆمان ئامادە بکەین بچنە ئۆردووگایەکی دی و ئەگەر لە عەمباری ئەمانەتەکان بوخچەیەک شتێکمان هەیە، وەریگرینەوە. بە بیستنی ئەو خەبەرە هێندە ناڕەحەت بم، نەبێتەوە. نەک بڵێی زۆرم مانەوە لەو لاکەرەمدا پێ خۆش بووبێ، بەڵکو لەلایەکەوە دەمزانی ئاننام لەدەست دەچێ کە لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ من بەسوود بوو، ئینجا لەگەڵ کۆمەڵێک زیندانییش یەکترمان ناسیبوو، کە لەو سۆنگەیەوە خەم و خەفەتەکانم دەڕەوینەوە. مرۆڤ سروشتێکی سەیری هەیە، لە هەر جێیەک گیرساوە، ماوەیەک دواتر لەگەڵی ڕادێ و خووی پێوە دەگرێ. دەمزانی ئازاد ناکرێم، بەڵکو لاکەرێکی دیکەی وەکوو ئێرە چاوەڕێمە، بۆیە هەر باشتر وابوو لێرە کە دۆست و ئاشنا و ڕۆشنایەکم پەیدا کردووە، وەمێنم. بەڵام دەسەڵات نەبوو. بەپەلە خۆمم گەیاندە ئۆردووگای ژنان. ئاننا چووبووە سەر کار. کزەم لە جەرگی هات. خاتوونی پاکەوانی باراکم ئاگادار کردەوە و تکام لێ کرد کاغەز و قەڵەمێکم بدەنێ. چەند ڕستەیەکم وەکوو ماڵاوایی و سوپاس لە میهرەبانییەکانی بۆ نووسی، لەگەڵ

کۆڵێک ئاخ و داخ و کەســـەری دڵ. چەند ڕســـتەیەک کە دنیایەک ئەشـق و ئەڤینیان تێدا بوو و ڕۆژگاریشــی هەر ناســـازگارە. چەند دڵۆپە فرمێســـکیشـــم بەیادی ڕۆژانی ڕابـردوو هەڵـوەرانـد و کـاغـەزەکەم دایە ئەو خـانـمە بیگەیەنێتە دەست ئاننا.

ماوەیەک بوو وەها لەگەڵ خەم و پەژارەدا ڕاهاتبووم، توانای فرمێسک هەڵوەراندنیشم نەبوو. بۆ ئاننام نووسی کە تـا دەژیم لەبیری نـاکەم و ئەگەر بۆم هەڵکەوێ و دەرەتان هەبێ، لە هەر جێیەکی دونیا بێ، لە چاکەی ئەو هەمووە میهرەبـانییەیـدا، هەر دەیـدۆزمەوە. دەســـتی پیرێژنەکەم لەبری دەســـتە جوانەکانی ئاننا ماچ کرد و ماڵاواییم کرد. ســـەعاتێک دواتر لەگەڵ زیندانییەکانی دی لە نێو گەمـارۆی ســـەربـازە چەکدارەکـانـدا بردیـانینە وێســـتگەی ئـاســـنەڕێ. پـاش ئەوەی مەودای ٢٠٠ کیلۆمەترێک ڕۆیشـــت، ڕای گرت و دایانبەزاندین و پاش نیوسەعاتێک ڕۆیشتنی بەپێیان، گەیشتینە ئۆردووگایەکی نوێ. ئێرە ئۆردووگـای بـایکـانور بوو. بچووکتر لە ئۆردووگـای بـالخـامش و نزیـک لە شـــاری ئـالمـاتـای پایتەختی قەزاقســتان. شـتێکی باشـی ئەو ئۆردووگایە بۆ من ئەوە بوو کە پـاش ئەوەی گەیشـــتینێ و لە دۆخی زینـدانییە تـازەکـانیـان کۆڵییەوە، منیـان کردە بریگـادیری دەســتەیەک و ئەوەش ئیمتیازێکی زۆر گرینگ بوو لە نێو ئۆردووگـادا. جگە لەوەش، ئێرانییەکی خەڵکی ئەردەبیلم لەوێ دۆزییەوە و دەمودەســـت هێنامە نێو دەســـتەکەی

خۆم، جا چونکە تۆزێک بەسـاڵدا چووبوو، کردمە پاکەوانی باراک. بەو جۆرە هەم توانیم یارمەتیی هاووڵاتییەکی خۆم بدەم و هەم هاودەنگێک بۆخۆم پەیدا بکەم. چونکە لە دنیای غەریبـان و غوربەتـان ئەویش لە زینـدانێ، هیچ نیعمەتێک هێندەی هاونەژاد و هاوئایین و هاودەنگێک، چێژبەخش نییە.

نـاوی عەلـی ئەکبەری مـحەمـمەدی بـوو. تەمەنـی لە پەنجاوپێنج تێپەڕیبوو. پیاوێکی ئەسـمەری سـمێڵ پانی چاو بچووک، بەڵام تا بڵێی زیرەک. ناوبراو، بەسـرهاتی خۆی ئاوا بۆ گێڕامەوە:

بیست ساڵ لەوەپێش هاتمە سۆڤیەت. حوکمەتی یەکیەتیی سـۆڤیەت چەند سـاڵێک بوو دامەزرابوو. زۆر بە ئاسـانی هاتمە ئازەربایجانی سـۆڤیەت و زۆری پێ نەچوو ژنم هێنا و دوو منداڵم بوو. کار و پیشـەیەکی دیارم نەبوو، بۆیە هەر وا خەریکی مامەڵە و ساتەوسەودا بووم و ژیانم خۆش بوو. ئیدی من نەمدەزانی سـاتوسـەودای شـەخسـی لەو وڵاتەدا مەمنووعە.

لێرە، سـەودا و مامەڵە بەجۆرێک بەرهەمهێنان لەقەڵەم دەدەن و ئەوانەی کاروباریان نییە و بە مامەڵە و سـەودا خۆیان بەخێو دەکەن، دەڵێن مامەڵەچی یان سـپەرکۆلانت و ئەوەش لە ڕووی یاساییەوە تاوانە. هەر بۆیە ڕۆژێک لەسەر ئەوە و بەو تۆمەتە گرتیـانم و بەپێی بۆچوونی ئەنجومەنی دەوڵەتی دە سـاڵ بێگارییان لە ئۆردووگا بۆ بڕیمەوە. دە سـاڵی ڕێـک لە ئۆردووگـای جۆراوجۆر کـارم کرد و کوێرەوەریی دنیایەم دی. لە کۆتایی ماوەکەدا، وەختێک لە دوایین ڕۆژەکـانی دەسـاڵەکەمدا بووم، بـانگیـان کردمە

ئۆفیسـی زیندان و گوتیان ئەنجومەنی تایبەت دە سـاڵی دیکەشـی حوکم داوی و ئێسـتا ئەوە قۆناغی دە سـاڵەی دووەمم تێدەپەڕێنم. بڕوا نـاکەم ئەو قۆنـاغی دووەمەم بەرمە سـەرێ و بەرگەی بگرم، نەک بڵێی بەرگەی کار و ناخۆشـی نەگرم، بەڵکو ئەو زوڵم و بێدادییە وەها ڕۆح و دڵ و دەروونمی وێران کردووە، ڕۆژێـک لەداخـان دیق دەکەم.

بەزەییم پێیدا هاتەوە و دڵیم داوە و هیوادارم کرد بە داهاتوو. گوتم هیچ شـتێک لەم دنیایەدا ڕوون و نەگۆڕ نییە. بۆیە نـابێ ورەت بڕووخێ. بنیـادەمێکی زۆر میهرەبان و بەسـۆز بوو. هەموو کارەکانی منی دەکرد. بەبێ منیش هیچی نەدەخوارد. چونکە سـەردەسـتە بووم، کە لە کار دەگەڕامەوە، ئەو دەچوو نانەکەی بۆ وەردەگرتم و دەیهێنـاوە بـاراک. هەر شـتێکمـان بوایە پێکەوەمـان دەخوارد. تەختەکەی ئەویش لە تەنیشـت تەختی منەوە بوو. ڕۆژ بە ڕۆژ میزاجم باشـتر دەبوو. ئەو ئۆردووگایە تۆزێک لەوی دیکە پاکوخاوێنتر و ڕێکوپێکتر بوو.

من لەگەڵ دەسـتەکەی خۆم زۆر نەرمونیان و بۆیان دڵسۆز بووم. هەوڵم دەدا کارە ئەستەمەکان بەتایبەتی بە کەسـانی لاواز و پیر نەسـپێرم و گەنجەکانیش ئەزیەت نەکەم. کوڕێکی گەنجی بە نەزاکەتی ڕووسـیم کردبووە جێگری خۆم و ڕامسـپاردبوو لەگەڵ هەموان میهرەبان بێ. ناوی نیکۆلا بوو، پێیان دەگوت کۆلیا.

شوێنی کاری دەستەکەی ئێمە لە نزیک ئۆردووگا بوو و کاری دەستەکەش، بیناسازی بوو، کە زۆر ئەستەم و ناخۆش نەبوو. ڕێگا نزیکەکەشی لایەنێکی باشی دیکەی بوو. ئەو ئۆردووگایە خەڵکی بیانیی زۆر تێدابوو بەتایبەتی ئەڵمانی، کە زۆربەیان دیلی شەڕ بوون. یەکێک لەو ڕووداوە تاڵ و ناخۆشانەی کە لەسەرتای چوونمدا بۆ ئەوێ ڕووی دا، مەرگی گەنجێکی ستۆنیایی بوو، کە لە دەستەکەی مندا بوو. لە وڵاتی خۆیەوە دیارییان بۆ ناردبوو، بەستەزمانە بەیانی کەدەچوون بۆ سەر کار، بەپەلەپەل نان و کەرەی بەرازی دەخوارد، کەچی لەگەرووی گیرابوو و هەرچی خۆی دێنێ و دەبا نە قووت دەچێ و نە دێتەوە دەرێ. تا گەیاندبوویانە خەستەخانە، خنکاندبووی.

بەهار و هاوین لەوێ تێپەڕی. هیچ پەیوەندیمان لەگەڵ دنیای دەرەوە نەبوو. زستانێکی سارد و سەختمان لەپێش بوو. زستن بۆ ئێمەی کرێکاری ئۆردووگا خراپترین وەرزی ساڵ بوو. ئەگەرچی جلوبەرگی لۆکە و گەرممان لەبەر دەکرد، بەڵام کارکردن لە دەرەوە، ئەویش لەو سەرما و بەستەڵەک و وەیشوومەیەدا تاقەتبڕ بوو، ئەگەرچی کڵاوی چەرمی هەموو سەر و مل و تەنانەت چەناگەشی دادەپۆشی، ئاواش ئەو هەناسەیەی لە لووتەوە دەهاتە دەرێ، هەر دەگەیشتە سەر سمێڵ، دەبووە سەهۆڵ و وەکوو چلوورە شۆڕ دەبوونەوە. ڕۆژانە پاش ئەوەی کارم بەسەردا دابەش دەکردن، لە ئۆفیسی کارگەکە لەگەڵ سەردەستەکانی دی دادەنیشتین، بەڵام دڵم هەر لای ئەو کرێکارانە بوو کە دەبوایە بەناچاری لە دەرەوە کار بکەن. هەڵبەت ئەو

کرێکارانەی بەردەوام لە نێو بیناکەدا کاریان دەکرد، دۆخیان باشتر بوو، ئەگەرچی ئەوێش هەر سارد بوو، بەڵام هێندەی دەرێ سارد نەبوو.

شەوێکیان کرێکارەکانی دەستەکەی من، پاش ڕۆژێک کاری تاقەتبڕ، جۆرێک خەوتبوون دەتگوت مردوون. دەرگای باراکەکەی ئێمە کە قەت ئەودەمانە نەدەکراوە، کرایەوە.

دوو پاسەوان بە دەنگی بەرز فەرمانیان دا هەستن. هەموو بە ترسەوە بەخەبەر هاتن. پرسیم چی بووە؟ یەکێک لە پاسەوانەکان گوتی، چەند ڤارگۆنێک ئاڵوودار هاتووە، دەبێ تا بەیانی بەتاڵ بکرێن. دەبێ ئەمشەو بەتاڵی بکەن، لەبری ئەوە سبەی ناچنەوە سەر کار. چار نەبوو. زیندانیی داماو جلوبەرگیان لەبەر کرد و خۆیان ئامادە کرد لە لاکەرەکە بچنە دەرێ. لە دەرەوەش سەربازی چەکدار چاوەڕێمان بوون. چووینە وێستگەی شەمەندەفەر و کەوتنە داگرتنی ئاڵوودارەکان. ڤارگۆن تا سەر لێوار پڕ کرابوون لە ئاڵووداری جەنگەڵیی قورسی بەستوو. من دەستەکەی خۆمم کردە دوو بەش. نیوەیانم ناردە سەر ڤارگۆنەکە، بۆ ئەوەی ئاڵوودارەکان فڕێ دەنە خوارێ و دەستەکەی دیکەش بیانبەن لەسەر یەکیان هەڵچنن. کرێکار بۆ ئەوەی بتوانن ئاڵوودارەکان فڕێ بدەنە خوارێ، دوو ئاڵووداریان تیلاوتیل بە ڤارگۆنەکەوە نا و ئەوانی دیکەیان بەسەردا خلۆر کردنەوە. من و دوو کەس لە بریگادیرەکانی دوو دەستەی دی، چووینە نێو

ڤارگۆنێکی بەتاڵ و تاوێک ڕاکشـــاین و خەومان لێ کەوت. وەختایەک بە دەنگەدەنگ و شـــەقی ســـەربازان وەخەبەر هاتین، من وەکوو شـــێتان دەرەپەڕیم. نەمدەزانی چ باســـە و هەر لەبیرم چووبۆوە هـاتووین ئـاڵوودار بەتـاڵ بکەین. خۆمـان فڕێ دایە خوارێ، ســـەیرم کرد زینـدانی بەڕیز ڕاوەستاون و چاوەڕێن بڕۆن.

دیارنەمانی ئێمە، هەم فەرماندەی ســەربازەکانی نیگەران کردبوو، هەمیش زینـدانییەکـانی وەدرەنگی خســـتبوو کە بگەڕێنەوە. ئیتر وێکڕا هـاتینەوە. بـاش بوو فەرمـانـدەی ســـەربازەکان پیاوەتییەکی دەرحەق کردین و ســـەرۆکی ئۆردووگاکەی ئاگادار نەکردەوە. خوا هەڵناگرێ هێندێ لە فەرماندەی سەربازەکان و تەنانەت سەربازەکانیش خەڵکێکی مەرد و ڕەند بوون.

## دوو زیندانیی کورد له ئۆردووگای بایکانور

له ئۆردووگای بایکانور، له هەموو میللەتێکی تێدا بوو، تەنانەت خەڵکی بیانییش. هەمووش به زمانی هاوبەشـــی ڕووسی یەکترمان دەدواند و هەموومان پێکەوە، خەریک بووین بینی ڕواڵەتی مەزنی کۆمۆنیســـتیمـان پتەو رادەگـرت. ڕۆژێـکـیـان عەلـی ئەکـبەری پـاکەوان له خەوتنگەکەی خۆمانەوە کەســـێکی هێنا لای من، لەخۆی ڕەشـــتاڵەتر. پیاوێکی چل ســـاڵانەی ڕەقەڵەی باڵابەرز. گوتی له کوردانی جەلالیم و خەڵکی قووچانم. قووچان و شـــارەکانی دیکەی کوردســـتان کوردیان زۆر لێیە، که هەموویان له ســـەردەمی نادرشـــای هەوشـــارەوە له نـاوچەی جەلالـیـیەوە بەڕێـی ئەوێ کـراون و دوور خراونەوە. ئەو کوردانە ســەرەڕای ئەوەی لەمێژ ســاڵە له خۆراسان نیشتەجێ بوون و له نیشتمان و زێدی خۆیان دوور خراونەوە، کەچی هێشـتا به کوردی قسـه دەکەن و ڕەچەڵەکی خۆیـانیـان لەبیر نەکردووە. دەیگوت حەوت ســـاڵە لەو ئۆردووگـایەیە. نـاوی عەزیز بوو. دەیگوت هەشت ساڵ لەوەپێش له سنووری باجگیرانەوە هاتووەتە ســـۆڤیەت و پانزە ســـاڵ حوکم درابوو و ئێســـتا پتر له نیوەی تێپەڕانـدووە. پرســـیم جگه له ئێوە، کورد یـان ئێرانیی دیکەشـــی لێیە ئێرە؟ گوتی من تەنیا پیرەپیاوێک دەناسم که خەڵکی قووچانە. داوام لێ کرد سبەینێ لەگەڵ خۆی بیهێنێتە بـاراکی ئێمە. پیر و گەنج قەڕقی نەبوو. هەمـوو وەک یەک بـووین. هەمـوو خەڵەتـابـووین و

ئازارچێشتووی وڵات و ئاو و خاکێک بووین. زۆریش هۆگری یەک بوون گیانێکمان بەیەکەوە بوو.

بۆ سبەینێ عەزیز، پیرەپیاوەی هێنا، کە تەمەنی شێست ساڵ دەبوو. پیرەپیاوە ناوی سادق بوو. لە هەمووان ڕەشترتاڵەتر بوو. یەکی کورتەباڵای پانکەڵە بوو. زۆر لە تورکمانان دەچوو. لووتێکی درێژ و دەم و لچی داچۆڕاو، ڕەشداگەڕاو، کە دیار بوو پێشتر تریاکی زۆر کێشاوە. ڕەشایی دووکەڵی تریاکەکە هێشتا هەر وا بەسەر لێوە ئەستوورەکانییەوە مابوو. زۆرم ڕێز گرت. پێم سەیر بوو و پرسیم، ئێمەی گەنج بێ ئەقڵ و بێمشوور بەشوێن داهاتووەکی باش و بەختەوەرانەوە بووین، ئەتۆ لە چی دەگەڕای؟ دەتویست لەم وڵاتە چی بدۆزیتەوە؟ گوتی کاکە خۆ من قەت بەتەما نەبووم بەو کاولبووەدا بێم.

شوانێک بووم لە نزیک سنوور، نەمزانیبوو بە مەڕەوە لە سنوور پەڕیومەتەوە. ئەو زاڵمە خوانەناسانەش گرتیانم و چەندی هاوارم کرد و پاڕامەوە، بە گوێیاندا نەچوو. سێ ساڵ لەوە پێش بوو. لەپێشدا بردیانمە سیبری. دوو ساڵ لەوێ بووم، ددانەکانم هەموو هەڵوەرین. ئەوەتا ددانێکیشم لە زاریدا نییە. چونکە لە سیبریا هیچ شتێکی لێ نییە بۆ زیندانییەکانی ڤیتامین سیی تێدا بێ. تەواویان تووشی ئەو نەخۆشییە دەبن. ئینجا دەڵێن پەتای "بێربێری" گەورەترین بەڵای باکوورە بۆ زیندانییەکان.

ئەو شوانە نەخوێندەوارە داماوەیان ٢٥ ساڵ حوکم دابوو، لە ئۆردووگاکانی کاری زۆرەملێدا بێگاری بکا. لە سۆڤیەت سزای سێدارە نەبوو. دیارە بە ڕواڵەت لایەنی

مرۆیی مەسەلەکەیان لەبەرچاو گرتبوو، بەڵام بەبارێکی دیکەدا، کارکردن بوو بە زیندانییەکان. لە جەنگەڵە ساردەکانی سیبریاوە بگرە تا گەرمێنەکانی تورکمەنستان و ئۆزبەکستان و کەنارەکانی دەریای خەزەر، لە هەموویدا زیندانییەکان حوکمی درێژخایەنیان بۆ بڕابۆوە بەبێ دادگایی و تەنانەت بێ ئەوەی پێیان بگوترێ لەسەری چی سزا دراون کاری تاقەتپڕووکێن و خۆڕایی و بێ حەق و مزیان پێ دەکرا. کۆشکی دیکتاتۆریی پرۆلیتاریایان پتەو دەکرد، نەشیاندەزانی هەناسەی سارد و بڵێسەی ئاهی ئەو مرۆڤە لێقەوماوانە، بەردی بناغەی ئەو کۆشکە دەردێنێ و دەیڕمێنێ. دنیا مەیدانی سزاکێشانە. سەیر ئەوەیە، هەر ئەو زاڵمە دیکتاتۆرییەکان، هەر کامە و بە دەستی یەکێکی دی تێدا دەچوون. ئێمە هەر لەو ئۆردووگای بایکانورە بووین، کە بیستمان یەمیلیانۆڤی وەزیری سامناکترین دەزگای سۆڤیەتی واتە ڕێکخراوی ئێم.گ.ب بە فەرمانی ستالین، ئەو زاڵمە مەزنە گوللەباران کرابوو.

وەرزێرە پیرەکە چەنێ باش وتی کوڕم
چیت چاندووە هەر ئەوەیە کە دەدروویەوە

لە ماوەی حەفتەیەکدا هەردوو کوردە هاونژادەکەمم هێنایە نێو دەستەکەی خۆم. لەوپەڕی هەژاری و نەداریدا، کۆمەڵێکی خۆمانە و گەرموگوڕمان هەبوو.

## مەرگی کاک سادق

ئەو کاک سادقە بنیادەمێکی زۆر باش و قسەخۆش بوو. گەلێ سەربردەی خۆشی لە ژیانی گوندی و شوانیی خۆی بۆ دەگێڕاینەوە. بەتایبەتی کە توتنەکەی دەکێشا، تەواو دەهاتەوە سەرخۆ. لوێچێ توتنی وێکڕا دەخستە بن زمانی. زاری لێک دەنا و وردە وردە توتنەکەی لە زاریدا دەخووساند و قووتی دەدا. پاشان تڵتەی توتنەکەی تف دەکردەوە. بەڵام کە زاری دەکردەوە، هەموو زمان و مەڵاشووی سوور دەبۆوە. چ لە شوێنی ئیش و چ لە ئۆردوو نەمدەهێشت کار بکا. جاروبار کاری سووکم پێ دەکرد. هەڵبەت هەر بۆخۆشی بنیادەمێکی تەمبەڵ بوو. بنیادەمێکی تا بڵێی دڵناسک بوو. زوو زویر دەبوو. کەس هێندە کەمدوو نەبوو. چەند سەعاتان لە گۆشەیەک دادەنیشت و دەفکرەوە دەچوو. بەڵام کە بەفر دەباری، ئیدی بێدەنگ نەدەبوو. بە پێچەوانەی هاوولاتییەکەی خۆی، ئاییینی گۆڕیبوو. بەڵام لای ئێمە هیچی نەدەگوت. بە لەهجەی خۆراسانی فارسیی قسە دەکرد. لەو سەرما و وەیشوومەی زستانەدا هەڵامەتێکی توندی پێوە نووسا. چەند ڕۆژێک لە خەوتنگەکە مایەوە، ئێمە، بەتایبەتی عەلی ئەکبەر زۆری پێ ڕاگەیشتین، بەڵام جار بە جار خراپتر دەبوو. بردیانە خەستەخانە. من و عەزیز هەموو ڕۆژێ دەچووینە سەردانی. هێندێ توتنیشمان بۆ دەبرد. ڕۆژێک کە چووینە سەردانی، لەوێ نەماندۆزییەوە. تەختەکەی بەتاڵ بوو. لە پەرستارەکانمان پرسی، گوتیان ئەمڕۆ مردووە و تەرمەکەی

هێشتا لە ساردخانەی خەستەخانەیە. گەڕاینەوە لاکەر و من چوومە لای سەرۆکی زیندان. داوام لێ کرد ڕێگەمان بدەن بە دابودەستووری ئایینی بینێژین، کەچی قبووڵی نەکرد. ئیتر ئەویشیان وەکوو هەزاران لێقەوماوی دیکە لە قووڵکە کۆمۆنیستییەکاندا خستە بن گڵ و بە دەردی خۆیان، خیانەتکارێک کەم بۆوە.

شەوێ لێک کۆ بووینەوە و پرسەیەکمان بۆ دانا. لەو پرسەیەدا چەند ئۆزبەک و تاجیک و تورکمانێکی ئۆردووگاکەش بەشدار بوون. فاتیحامان بۆ گیانی نارد. لەو ڕووداوانە هەموو ڕۆژێ هەبوون و زیندانی لەگەڵ ئەو نەگبەتییانە ڕاهاتبوون.

یەکێک لە خۆشی و سەرگەرمییەکانی ئۆردوو وەختێک بوو کە زیندانیی تازەیان دێنایە ئۆردووگا و زۆربەی جاریش ئەوە دەکەوتە ڕۆژانی پشوو. جا ئێمە دەهاتینە دەرێ و سەیری تازەهاتووەکانمان دەکرد، بەشکم ئاشنایەکیان لەنێودا بێ. هەڵبەت دیمەنێکی کەسەربار و دڵتەزێنیش بوو. دیتنی ئەو مرۆڤە لەڕ و لاوازانە بە جلوبەرگی شڕ و ڕیشی نەتاشراوەوە، زۆر دڵتەزێن بوو. لەبیرمە لە ئێران وەختێک قەرار بوو پزیشک ئەحمەدی لە گۆڕەپانی تۆپخانە لەسێدارە بدەن، خەڵکێکی زۆری تاران هاتبوونە سەیر. ئەگەرچی دەیانگوت پزیشک ئەحمەدی پیاوکوژ و میرغەزەبی ڕەزاشا بوو و دەیان زیندانیی بە دەرزیی هەوا کوشتبوو، کەچی ئاواش وەختێک بەو جەستە لەڕ و لاواز و

ڕوخسارە زەردهەڵگەڕاوەوە بردیانە سەر چوارپایەکە و پەتەکەیان لە ملی کرد، کۆمەڵێک ژن زریکاندیان و کەم کەس هەبوو بە ڕوویەکی شادەوە لەوێ ڕۆیبێ. نەک هەر دیتن، بگرە بیستنی ئەو دیمەنە دڵتەزێنانەش دەبنە هۆی خەم و خەفەت. هەرچەندە سزادانی تاوانکەران بۆ پەندوەرگرتنی خەڵکی کارێکی پێویستە، بەڵام کێ هەیە پەند و وانەی لێ وەرگرێ. مخابن، قەت نەبوو ئەو مێشە و دارستانی ژیانە، لەو دڕندانەی تێدا نەمێنێ.

ڕۆژێکیان کە لە کارگەوە دەهاتمەوە، لەپێش دەرگای لاکەرەکە ڕووداوێکی دی ڕووی دا. یەکێک لە زیندانییەکان دەیویست شووشەیەک ئارەق لەگەڵ خۆی بێنێتە نێو ئۆردوو، کەچی دەبینێ ئەو ڕۆژە پاسەوانەکان ورد دەیانپشکنن و ناهێڵن ئارەقەکەی بێنێ و بگرە سزاشی دەدەن. هەر بۆیە سەری شووشەکە دەکاتەوە و بین بەو ئارەقە گەرمەوە دەنێ، ئیتر پێش ئەوەی بگاتە بەر دەرگاکە، دەکەوێ. زیندانی بە هانایەوە دەچن، بەڵام چونکە جار بە جار پتر تێک دەچێ، دەیبەنە خەستەخانە. دواتر دەیانگێڕاوە، تا دکتۆر گەیشتە سەری، گیانی دەرچووبوو.

کوڕێکی گەنج بوو. دەیانگوت ئۆکراینییە. سەڵا لە دایک و بابەکەی. نەگبەتییەکانی ڕۆژانە، برسیەتی و شەکەتیی نەبڕانەوە، دەرفەتی نەدەدا بیر لەو چارەڕەشییانە بکەینەوە.

# لاکەرێکی دی

کاروباری بیناسازی لە ئۆردووگای بایکانور تەواو بیوون و هاوینی ساڵی ١٩٥٦یش خەریک بوو تەواو دەبوو. بەڵام خەم و پەژار و گرفتاریی ئێمە نەدەبڕایەوە و تەواوبوونی نەبوو. ڕۆژێکیان کە لە کاری هاتبوومەوە، ئاگاداریان کردمەوە سەرۆکی ئۆردوو کاری پێمە. وەختێک چوومە ژووری کارەکەی، چەند سەردەستەی دیکەش لەوێ بوون. سەرۆک گوتی سبەی لە لاکەر بمێننەوە و خۆتان ئامادە بکەن دەچنە لاکەرێکی دی. هەموو دەستەکەشتان ئاگادار بکەنەوە. بۆ من فەرقێکی نەبوو. هەموو شوێنێک و هەموو لاکەرەکان وەک یەک بوون. هیچ هیوایەکم بە داهاتوویەکی باشتر نەبوو. بەیانی زوو، چوومە عەمباری توێشوو، چاکەت و پانتۆڵەکەمم کە تاقە سامانی من بوو لەم دنیایەدا و یادگاری ڕۆژانی خۆشی و ئازادیم بوو، وەرگرتەوە. چەند ساڵێک بوو بۆ ڕۆژی خۆی هەڵمگرتبوو. پێش نیوەڕۆیە ڕیزیان کردین. لە ئۆردووگا چووینە دەرێ. نە کەس هەبوو ماڵاوایی لێ بکەم، نە خەمی بەجێهێشتنی شوێنەکەم بوو. شەمەندەفەر، ئەو ئامرازە هەمیشەییەی ڕاگواستنی زیندانییەکان ئامادە بوو. هەر بەو ڕێوشوێنەی کە ئیدی بۆمان ئاسایی ببۆوە، وەڕێ کەوتین. دوانیوەڕۆ گەیشتینە ئۆردووگایەکی دی. ئەو لاکەرە لە شاری تمیرتائۆ نزیک بوو، چەند کیلۆمەترێک لەولای شاری کاراگاندای قەزاقستان. لەبەر ئەوەی کانگەی

بەردەڕەژووی لێ بوو و پێویســـــت بوو جـادەی قیڕ و ئاســـنەڕێی بۆ بکێشـــن و بینای تازەی بۆ دروســـت بکەن، پڕ بوو لە ئۆردووگای بێگاری. جا من چونکە بە دەســـــتەی خۆمەوە نێردرابوومە ئەوێ، هەر وا ســـەردەســـتە مامەوە. لێرەش کاروباری بینایەکیان پێ ئەسپاردین. ئەو ئۆردووگایە بەڕاستی لە دوو ئۆردووگاکەی پێشـوو خاوێنتر و خۆشـتر بـوو. هەر وەژوور کەوتـیـن، خـۆشـــــیـیەک لەدڵـم گەڕا. خەوتنگەیەکیان پێ داین. من دیســـان عەلی ئەکبەرم کردەوە پاکەوان. بیستم کۆمەڵێک ئێرانیی دیکەش لەو ئۆردووگایەن. یەکشـــــەممە هەموویان هاتنە ســــەردانمان. عەلی ئەکبەر ئاشێکی بۆ لێنان و میوانداریمان کردن. گەنجێکی داڵگۆشتی کـورتەبـاڵای زیـرەکـیـان لەگەڵ بـوو بەنـاوی غەریـب. سەردەستەیان بوو. سێ کەسی دیکەشیان لەگەڵ بوو. دوو تورکمانی باڵابەرزی چوارشـانە، بەناوەکانی گوڵمحەمەدی و ئیمـامقولی. ئەوی دیکەش گەنجێکی ئەردەبیلیی زۆر میهرەبـان و بەئەدەب بوو بەنـاوی نەورووزی. هەموو یەکشـەممان لە دەوری یەکتر کۆ دەبووینەوە و لە سـۆنگەی ئەوان و قسـەخۆشـەکانی کاک غەریبەوە، سـوکنایییەکمان هاتبوو.

## محەمەد بیریا، وەزیری فەرهەنگ

لە ئۆردووگـای تەمیرتـائۆ، ڕۆژێکی پشـوو لە خەوتنگەکەمدا پشـووم دەدا. ئاگادار یان کردینەوە کە کۆمەڵێک زیندانیی نوێ دێننە ئۆردووگا. چوومە دەرێ، غەریب و کوڕەکانی دیکەش هاتبوون. زیندانییە تازەکان زۆر بوون. ورد ورد سـەیرم دەکردن بەشـکم ئاشنایەکیان لەگەڵ بێ. کتوپڕ قەڵافەتێکی ئاشنام بەرچاو کەوت. پیـاوێکی کورتەبـاڵای دەموچـاو وردیلە. کڵاوە چەرمینەکەی تونـد لە ژێر چەنەی گرێ دابوو و دەموچاوە وردەکەی بە زەحمەت دەبینرا. لەو جلوبەرگە فشـوفۆڵەی زینداندا و بەو چەکمە لبادییانەوە، ببووە شتێکی سەیر. ئاواش ناسینمەوە. ئەوە محەمەدی بیریا، وەزیری فەرهەنگی فیرقەی دیموکراتی ئـازەربـایجـان بوو. بە غەریبم گوت ئەو پیاوە وردیلەیەت نەناسـی؟ گوتی نەخێر. گوتم ئەوە محەمەد بیریـایە. کە لێی ورد بۆوە، گوتی وەڵڵا چاکت ناسـییەوە. غەریب بانگی کرد، کوڕە هۆی بیریـا. هەر ئێمەی دی، زانیی خەڵکی خۆوڵاتیین و ناسـیومانەتەوە. بزەی هاتێ و لە نێوان لێوە ڕەشداگەڕاوەکانییەوە ددانە خواروخێچ و بۆرەکانی دەرکەوتن. کە گەیشـتە لامان، سـڵاوی کرد و ئێمە لە ئـامێزمـان گرت. بردمە خەوتنگەی خۆم. لێـک کۆ بووینەوە. ڕۆژانی پشوو کارمان ئەوە بوو، بەڵام ئەمڕۆ توحفەیەکمـان لێ زیـاد ببوو. تـاقە جـارێکم دیتبوو، لە میوانداریی مەجلیسـی حکوومەتی میللیدا. غەریب بە

توركی لێی پرسی: ئەتۆ بۆ لێرەی؟ دا بۆمان بگێڕەوە. گوتی جارێ زۆرم برسییە. ئەگەر شتێکتان هەیە بۆم بێنن. عەلی ئەکبەر هێندێ نانی بۆ هێنا و ئەو دەمودەست کەوتە خواردن. دوایی پەرداخێک ئاوی بەسەردا کرد و تۆزێک هاتەوە سەرخۆ. گوتی ئێوە من دەناسن. من محەمەد بیریا، وەزیری فەرهەنگی پیشەوەری بووم. لەگەڵ هێرشی سوپای ئێران بۆ سەر ئازەربایجان ئاگاتان لێ بوو چۆن بەوپەڕی ئازایەتییەوە ڕامان کرد. ئەگەرچی من حەزم لێ نەبوو لە تەورێز بڕۆمە دەرێ، چونکە تازەم ژن هێنابوو، بەڵام بە زۆر هێنایانم. هەرچی هەوڵم دا لانیکەم ژنەکەشم لەگەڵ خۆم بێنم، بەڵام دایک و بابیشی ڕازی نەبوون. کە گەیشتینە سۆڤیەت، زۆری نەبرد پیشەوەرییان بە ڕووداوێکی ترۆمبێل کوشت. پێم وایە پیلانی غوڵام یەحیا بوو.

چونکە ئەو دەیویست بۆخۆی ببێتە سەرۆکی فیرقە. ماوەیەک توانیم لە هەمبەر چەوتییەکانی بێدەنگ بم و لەگەڵی بم، بەڵام دۆخی نالەباری فیرقەییەکان و فرتوفێڵ و گزی و فزییەکانی ئەو کە هیچی لەگەڵ نەدەکرا، لە هەموو شتێکی بێزار کردم. داوام کرد بمنێرنەوە ئێران، بەڵام ڕازی نەبوون. ناچار خۆمم شێت کرد و دەستم کرد بە کاری سەیر و سەمەرە. ڕۆژ تا ئێوارێ نوێژم دەکرد و پێداگریش بووم بمبەنە مزگەوتێک. جاری وابوو دەمکردە هات و هاوار، تا ئاخری بردیانمە باکۆ و لەوێ بردیانمە مزگەوت. مزگەوتەکە کەسی لێ نەبوو. گوتم دەبێ مەلایەکیش هەبێ کە پێشنوێژیم بکا و نوێژی لەپشت بکەم. پاش چەند ڕۆژ

مەلایەکی گەنجیان هێنا، بەڵام کە دواندم، دەمودەست زانیم ئەوە مەلا نییە، چونکە هیچ شتێکی لە شەرع و ئایین نەدەزانی، بگرە کابرا سیخوڕ بوو چەند ڕۆژێک لەپشتی نوێژم کرد، بەڵام بۆ ئەوەی ئەو بزانێ من کەر نیم، لە کاتی نوێژێدا ڕۆژێکیان بەردەوام لە پشتەوەڕا لێی نزیک بوومەوە و توند خۆم پێوە نا و لە ڕەکاتی کۆتایی نوێژەکەیدا تەواو خستبوومە سەر کۆشم. کابرا نوێژەکەی بڕی و ڕووی تێ کردم گوتی ئەوە چییە بۆ وا دەکەی؟ گوتم عەجەب سمت و قوونێکت هەیە؟ کابرا بە تووڕەییەوە هەستا و گوتی من لەوانە نیم. ئیدی مزگەوتی بەجێ هێشت. کاکە ئەوەی کە گێڕاوە لەبەر پێکەنین پسابووین. گوتی باشی بۆچووبووم، ئیدی بەولایەدا نەهاتەوە و بردیانمەوە لای غولام یەحیا. بەڵام من هەر ڕۆژە و بە شێوەیەک گاڵتەم پێ دەکردن و تەواو خۆمم لە شێتی دابوو. لەو حاڵەتەدا چیم حەز لێ بوایە پێم دەگوتن. هەر دەشمویست بمنێرنەوە ئێرانێ. بەڵام لەبری ئەوە ناردیانمە ئێم.گ.ب و ماوەی شەش مانگ لەوێ بووم، تا بە پێی بڕیاری ئەنجومەنی دەوڵەتی دە ساڵ حوکم درام. ئێستاش ئەوە لەلای ئێوەم. گوتمان بەخێر هاتی. هەر تۆمان کەم بووی. هەر ئەو ڕۆژە ئەویشم هێنایە نێو دەستەکەی خۆم. لە تەختی سەرەوە لە پەنا عەزیز جێی گرتەوە. گوتی من حەزم لە سەرەوەیە. گوتم حەقتە، وەزیر دەبێ لە سەرەوە بێ.

لە شـــوێنی کاریش نەمدەهێشـــت کار بکا و چەندی بکرابایە، خواردنی زیادەشـــم بۆ وەردەگرت. بە قســـەی خۆش خۆش دایمە دەیخافڵاندم.

ڕۆژێکیان لێم پرســـی، ئەرێ ئاغای بیریا بەڕاســـتی تۆ چۆن بوویە وەزیر؟ گوتی لە چـاپخـانە کـارم دەکرد، جاروبارەش بە ئازەری شیعرم دەنووسی. هەر ئەوە بووە هۆی لەوەی لە تەشـــکیلاتی حکوومەتیی فیرقەدا پۆســـتی وەزارەتم پێ بـدەن. گوتم جـا لەو مـاوەی وەزارەتەدا چ کارێکی باشـــت کرد؟ گوتی، هیچ، بەڵام جاروبار ســـەری قوتابخانەکانم دەدا. ڕۆژێکیان چوومە قوتابخانەیەک. پۆلی شەش دەرسیان هەبوو. یەکێک لە قوتابییەکان خەریک بوو جوگرافیای دەخوێندەوە و بە دەنگی بەرز دەیگوت، زەوی خڕە و بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە. من چوومە پێشـێ و ڕامگرت و گوتم، زەوی خڕ نییە، نەخێر زەوی تەخـت و ڕێکە و لەســـەر شـاخی گایەکە و گایەکەش لەســـەر پشـتی ماســی. ئینجا بە دەوری خۆریشـدا ناخولێتەوە، ئەوە خۆرە بە دەوری زەویدا دەســـــووڕێتەوە. مەگەر نـابینن هەموو ڕۆژێ بەیانیان لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێ و دەچێ لە ڕۆژئاوا، ئاوا دەبێ؟ هەموان بە ســەرســووڕمانەوە ســەیریان کردم. منیش وەکوو بلیمەتێک لەبەرانبەریان ڕاوەستابووم.

دەیگوت لە کۆڕ و کۆبوونەوەی حیزبیشـــــدا دایمە پاش پێشەوەری من قسەم دەکرد و، وتاری وا ئاگرینم پێشکەش دەکرد، هەموو ســـەریان ســـووڕ دەما. ئەمریکا و ئاڵمان و هەر مەملەکەتێکم لەو کاتەدا لەبیر بوایە، هێرشـــم دەکردە ســـــەری و دەمـگـوت ســـــوپـای ئـێـمە دەتـوانـێ لە

چاوترووکاندنێکدا ئەمریکا یان ئاڵمان تێک بشـــکێنێ و ئەگەر بمانەوێ، هەر بەو فیرقەییە گیانلەســـەردەســـتانە دەتوانین کام وڵاتمان پێ خۆش بێ، بیگرین. ئێران هەر هیچ نییە.

ئەوجار دروشـــمم دەدا: یاشـــاسـین فیرقە، یاشـاسـین پیشەوەری. هەموو چەپڵەیەکی توندیان لێ دەدا.

رۆژێکیـــان لەســـــەر چوارپـــایەیەک کە قســـــەم بۆ ســـەربازەکان دەکرد، دەســـتمم وا ڕاوەشـــاند، پێچکەکانی شـــکان و کەوتم دەســـتم شـــکا و ماوەیەک خەوێنرام و دەستیان لەگەچ گرتم.

پرســـــیم، لە ســـــەردەمی پێش فریقەدا کە لە چاپخانە کارت دەکرد، شـــیعرەکانتت چاپ نەکرد؟ دەکرێ یەکێ لەو شـــیعرانەمان بۆ وەخوێنی؟ گوتی شـــیعرێکم هەیە بە ناوی "تۆ سەیری قەمچی بکە، هەی لەبەرت مرم قەمچی". مەسەلەکە ئاوا بوو:

لە سەردەمی ڕەزاشادا، فەرماندەی پادگان و لەشکری تەورێز، ســــەرلەشـــکر شـــــابەختی بوو. من ئەودەمی چووبوومە سەربازی. زۆر دەترسام. گرووبانێکی سمێڵ زلمـــان هەبوو، بەردەوام لەبیـــانووەک دەگەڕا و دەبوو ســـــمێڵی چەور بکەی. منیش چونکە هیچم نەبوو، زۆرم لەگەڵ خراپ بوو. سەیرم کرد چار نییە، هەر دەبێ خۆی لێ گێل بکەم. وەختێک ڕگووبان فەرمانی "وریابن"ـــــی دەدا، من ورگم دەردەپەڕاند، تا دەیدیتم، دەهات و توند لە ورگی دەدام. ئەمیش بە ئانقەست ورگمم وەها دەبردە

دواوە، ئەوجار بەرەوپێشەوە دەچەمامەوە و سمتم دەردەپەڕین. جا دەچوو لە پشتەوەڕا شەقێکی تێ هەڵدەدام، من دیسان وەک ئەوەڵێ ورگمم دەردەپەڕاندەوە. سەرت نەیەشێنم هێندەم وا کرد، ئاخری شەکەت بوو، ئەمری کرد قەمچی بێنن. بە قەمچی هەتا بۆخۆی شل بوو لێی دام. چەند ڕۆژێک خەوێنرام. لەو ماوەیەدا شیعرێکم هۆنییەوە بەو ناونیشانە: "شلاق، باخ من..." لە حەفتەیەکدا سەرباز هەموو لەبەریان کرد و بە کۆڕ دەیانخوێندەوە. سەرلەشکەر شابەختی ئەوەی بە گوێ گەیشتەوە. ڕۆژێکیان کە خەریکی سانگرتنێ بوو، پرسیین ئەو سەربازەی شیعری قامچیی نووسیوە، بێتە پێشێ. بە ترسەوە چوومە پێشێ. پرسی، ئەوە تۆ هۆنیوتەوە؟ گوتم بەڵێ تیمسار. گوتی دا بۆم بخوێنەوە. دەستم بە خوێندنەوەی کرد و هەر جارێکی دەگەیشتمە شلاقە باخ، هەموو سەربازەکان دووپاتەیان دەکردەوە. فەرماندە زۆر پێ کەنی و پێی خۆش بوو. ئەمری کرد کارێکی گونجاوم پێ بسپێرن. ئیتر لە پادگانەوە ناردیانمە دەروازەی شار.

ڕۆژێکیش کە لەگەڵ کوڕەکان لە ئۆردووگا بووین و پێکەوە نانمان دەخوارد، بیریا زۆر بەپەلە قاپی ئاشەکەی لەپێش خۆی دانا و کەوتە خواردن. کتوپڕ کەوچکەکەی دانا و قاپەکەی هەڵگرت و بەسەرییەوە نا. دیار بوو دڵی بەوەش دانەکەوتووە، ئەوی تێیدا بوو بەسەر خۆیدا کرد. ئێمەش کەوتبووینە پێکەنین. پرسیم: ئەوە بۆ وات کرد؟ گوتی ئاخر بە کەوچک و لێواری قاپەکەش تێر نەبووم بۆیە.

ورده ورده له ئۆردووگاش خەریک بوو خۆی له شێتی دەدا و شتی وای دەکرد هەموو دەحەپەسـاین و پێ دەکەنین. بۆ وێنه له وەرزی هاوینێدا جلی گەرمی زستانێی لەبەر دەکرد و کڵاوی چەرم و چەکمەی لبادی ئەو شتانه، که نەک هەر ئێمه بگره هەموو ئەو ئۆردووگایەش که دەیاندی وەپێکەنین دەکەوتن و گاڵتەیان پێ دەکرد.

رۆژێکیان گوتم ئەو کارانه باش نین. جەنابی بیریا ئاگادار به خۆت تووشی گێچەڵێک دەکەی، دەتبەنه شێتخانه. دەیگوت حەزم لێیه ئاوا بکەم.

## کۆنگرەی بیستەمی
## حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت

چەند مانگێک بوو لەم ئۆردووگایە بووم. گۆڕانێکی بەرچاو لە دۆخی ناو ئۆردووگاکەدا هەستی پێ دەکرا. هەڵسوکەوتی هەیئە و بەرپرس و پاسەوانەکان لەگەڵ زیندانییەکاندا باشتر ببوو. ئاگادار بووینەوە کە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت، لە مۆسکۆ لەگەڵ سەرکردەی حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهان بەسترابوو و بڕیاری نوێ لەبارەی زیندانییەکانەوە بەگشتی درابوو.

یەکێک لەو بڕیارانە ئەوە بوو، ڕێک کەوتبوون کە لەبری ئەو کارەی بە زیندانییەکان دەکرێ، حەق و مزێکیان بدرێتێ. ئەوجار، ساڵ و ماوەی حوکمەکەشیان بە شێوازی جۆراوجۆر کەم بکرێتەوە. خواردن و جلوبەرگی حوکمدراوانیش لەو دۆخە کارەساتبارەدا نەمێنێ. ئەو بڕیارانە زۆر زوو لە ئۆردووگاکەدا شوێنەواریان دەرکەوت. خواردن باشتر بوو. جلوبەرگ نوێ کرانەوە و فەرمان بە سەردەستە درا، لەمەودوا بە ڕێکوپێکی لیستەیەک لە بەرهەمی کار لە زیندان بەتایبەتی و دەستەکە بەگشتی لە ماوەی مانگێکدا کە لە ژێر چاودێریی بەرپرسە ئازادەکانی کارگەکاندا ئامادە بکەن و ڕێکی بخەن، بۆ ئەوەی لە کۆتایی مانگدا، بەپێی ئەو کارەی کردوویانە و ئەو فۆرمۆڵ و خشتەیەی دەسنیشان کراوە، حەق و مزیان بدەنێ. هەڵبەت ئەوە، بووە هۆی چوونە سەری ئاستی کاری زیندانییەکان و کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر دانان و بەرهەمی کارەکەیانی زۆر خێرا بردە سەر. ئەگەرچی ئەو

حەقدەستە دیاریکراوە هەرگیز بەپێی کار و ماندووبوونەکە نەبوو. کەچی دۆخی ئۆردووگا و دڵ و دەروونی زیندانییەکانی تەواو گۆڕی. ئەو جموجۆڵەی کە لە نێو ئۆردووگادا دەبینرا، چاکبوونی دۆخی زیندانییەکانی پێوە دیار بوو. لەگەڵ ئەوەدا بازاڕی بەرتیلدان بە بەرپرسانی کارگەکان برەوی گرت. سەردەستەکان بۆ ئەوەی بتوانن پارەیەکی زیاتر بۆ دەستەکەی خۆیان وەرگرن، لەگەڵ ئەندازیار و چاودێرەکان ڕێک دەکەوتن، ئاست و بەرهەمی کارەکەیان زیاتر لەوەی دەکرا، نیشان دەدا و لەو پشکەی وەریشیان دەگرت، دەرسەدێکیان پێ دەدرا.

ئینجا فرۆشگایەکیش بۆ هێنانی کەلوپەل و پێویستیی زیندانییەکان لە ئۆردووگادا دانرا و ڕستورانتێکیشیان کردەوە.

ئەو گۆڕانکارییانە بوونە هۆی ئەوەی ترووسکاییەکی خۆشی و شادی بخزێتە نێو تاریکخانەی لاکەرەوە. سندووقێکیش لە ئۆردووگا دانرا. بۆ حەق و مزی زیندانییەکان و وەرگرتنی زیادە پووڵی ئەو. ئەو شتانە هێندە خێرا ڕوویان دا، هەموو سەریان سووڕ ما.

چەند ڕۆژ دواتر، هەیتەیەک هات و منی بردە نووسینگەی ڕەئیس. ڕەئیس وێڕای پیرۆزبایی کارتێکی دا بە من و گوتی بەو کارتە دەتوانی بچیە دەرەوەی ئۆردووگا و بێیەوە. زۆر خۆشحاڵ بووم، تا ئێستا کارتی وایان بە هیچ کەس نەدابوو. بە زمانی ڕووسی بەو کارتەیان دەگوت پرۆپوسک.

بەو کارتە، من بەیانیان دەهاتمە دەرێ و پاش دابەشکردنی کار لە کارگە بەسەر زیندانییەکاندا دەمتوانی بچمە شاری و تا لای ئێوارێ کوێم پێ خۆش بوایە دەچووم. بەڵام ئێوارێ دەبوو بگەڕێمەوە لاکەر. تەنانەت ڕۆژانی پشووش بۆخۆم بەتەنێ دەمتوانی لە ئۆرددووگا بچمە دەرێ و ئێوارێ بێمەوە.

پاش شەش ساڵ و چەند مانگ، ئەو نیوە ئازادییەی پێم درابوو، ئەگەر بکرێ ناوی بنێی ئازادی، نیعمەتێکی گەورە بوو. چەند ڕۆژێکی سەرەتا زۆر بە حەز و حەژمەتەوە، بە کامیۆنی کارگە چوومە شاری تەمیرتائۆ، بەڵام شارێکی بچووک بوو. زۆرم حەز لێ بوو بچمە کاراگاندا، بەڵام چونکە زۆر لە ئۆردووگا دوور بوو، دەترسام نەتوانم لەکاتی خۆیدا بگەڕێمەوە ئۆردووگا و لەو یەکەم هەنگاوەی ئازادیدا تووشی هەڵەیەک بم. هەر بۆیە بە تەمیرتائۆ قەناعەتم کرد. وردە وردە لە چوونە شارییش ماندوو بووم، چونکە هیچ ئاشنایەکم لە شاری نەبوو، شتێکیشی لێ نەبوو خۆی پێوە بخافڵێنی، تا ڕۆژێکیان شۆفێر کامیۆنێک کە کەلوپەلی دێنا بۆ کارگە و بە قاچاخی ڤۆدکیای بۆ زیندانییەکان دەبرد و پێی دەفرۆشتن، لە ترسی ئەوەی نەکا من ڕێی لێ بگرم، بانگهێشتی کردم بۆ ماڵەکەی خۆی. هەڵبەت من کارم پێی نەبوو، بەو حاڵەشەوە دەعوەتەکەیم قبووڵ کرد. کابرا لەگەڵ هاوسەری و کچەکەی و خوشکی ژنەکەی کە خانمێکی گەنج بوو و لە ئاپارتمانێکی بچووکدا دەژیا، ئاشنا کرد. دۆخی ژیانی ئەوانیش زۆر باش نەبوو. ئاپارتمانەکەی وی دوو ژووری خەو و هۆڵێک و

چێشـــتخانەیەکی بچووک و ئاودەســـتێک بوو کە هەم ئاودەست بوو هەم حەمام.

بۆخۆی و هـاوســـەر و کچە چوارســـاڵانەکەی، لە ژوورێکدا و ژنخوشـــکەکەشـــی لە ژوورەکەی دیکەدا دەنوســـتن. خۆی و هاوســـەر و ژنخوشـــکەکەی هەر ســـێکیان کاریان دەکرد. کەلوپەلێکی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام لەوپەڕی سـادەییدا ژیانێکی گەرموگوڕ و خۆشـیان هەبوو، هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی هاتوچۆم لەگەڵیان گەرم و بەردەوام بێ.

شـــۆفێرەکە ناوی ســـاشـــا بوو و خانمەکەی کاتیا. ژنخوشـــکەکەی ناوی ناتالی بوو، لە کارگەی داربڕیندا کـاروبـاری ئیـداریی بەڕێوە دەبرد. تـا پۆلی ســـێی دواناوەندی خوێندبووی. هەر جارێکی دەچوومە ماڵیان، کچە چکۆلەکەی ساشا هەرای دەکرد، مامە ڕامان هات و خۆی لە باوەشـــم داویشـــت. دایکی بە ڕاســـتی ژنێکی میهرەبان بوو و قەت نەمدی ڕووی گرژ و تاڵ بێ. منیش لە ئۆردووگاوە هێندێ وشـــکە و خۆراکم بۆ دەربردن. زۆر جار بۆ فراوین نەیـاندەهێشـــت بڕۆم. من زۆرم کواسی کە جۆرێک ساردی بوو، پێ خۆش بوو. کواسی وەکوو بیرە وابوو، کە بۆخۆیان دروســـتیان دەکرد. بەو جۆرە بوو، نانیان لە بەرمیلێکی ئاوی شـیلەتێن دەکوشـی و تۆزێکیش هەویرترشـــیان تێ دەکرد و توند ســـەری بەرمیلەکەیان دەبەســـت. پاش دە ڕۆژ کواســـی ئامادە دەبوو. ســـاردییەکی زۆر خۆش و بەتام بوو. جگە لەوە،

من زۆرم پیراشـــکی و پونچیک پێ خۆش بوو، کە کاتیان بۆخۆی لە مـاڵەوە دروســـتی دەکرد. وردە وردە ببوومە یەکێک لە ئەندامـانی بنەمـاڵەکەیـان. هەر دەرفەتم هەبوایە، بـێ شـــەرمـکـردن دەچـوومە مـاڵـیـان. وردە وردە دەروجیرانەکەشیانم ناسی.

# خوێندنەوەی لەپی دەست

ڕۆژێک لەپێش چاوی چەند ژنە دراوسێیەک کە هاتبوونە ماڵی کاتیا، دەستی کاتیام گرت و گوتم، ئیزن بدە با لەپی دەستت بخوێنمەوە و پێت بڵێم داهاتووت چۆنە. بە سەرسوورڕمانەوە سەیری کردم و پرسیی، مەگەر شتی وا دەبێ؟ گوتم بۆ نابێ. ئەوە زانستە، نەک سیحر و جادوو. من کتێبی ناولەپخوێندنەوەم خوێندووەتوە و لە ڕووی هێڵەکانی بەری دەستەوە تا ڕادەیەک دەکرێ داهاتوو پێشبینی بکەی. لە هێڵەکانی لەپی دەستی کاتیا ورد بوومەوە. لە ڕووی ئەو هێڵەوە کە لە خوارووی لەپی دەستییەوە بەرەو پەنجەتووتەی هەڵدەکشابوو، گوتم کاتیا تۆ تەمەنت زۆر درێژ دەبێ. پرسیی؟ بۆ نموونە چەند ساڵ؟ گوتم پێم وایە پتر لە ٧٠ ساڵ. گوتی، یانی من ٤٥ ساڵی دیکە دەژیم. گوتم لەوانەیە زۆر زیاتر. گوتی، چیی دیکەش دەبینی؟ گوتم منداڵێکی دیکەش لە چارەنووسیدایە. پرسیی کچ یان کوڕ؟ گوتم ئەوەیانم پێ پێشبینی ناکرێ، چونکە بە هێڵی دەست ڕوون نابێتەوە. پرسیی، چیی دیکەش؟ گوتم حەزت لە مۆسیقا و ئەدەبیاتە. گوتی، ئەوەیان ڕاست ڕاستە. من ئاشقی مۆسیقا و کتێبم.

دواتر زانیم چ هەڵەیەکم کردووە. جا ئەو جار نۆرەی خوشکەکەی بوو، کە دەبوو ناولەپی بخوێنمەوە. ناتالی هاتە پێشێ و بە تکا و پاڕانەوە گوتی سەیری لەپی دەستی ئەویش بکەم. دەستی چەپیم گرت و زۆر لێی

ورد بوومەوە. گوتم ناتالی، پیاوێک لە چارەنووسـتدا دەبینم. تۆ بەو زوانە شـــوو دەکەی. ئەو پیاوە، دووەمین و دوایین پیاوێک دەبێ کە شـووی پێ دەکەی. گوتی منداڵیشـم دەبێ؟ گوتم بەڵێ تۆش وەکوو خوشـــکەکەت دوو منداڵت دەبێ. بەڵام بە پێچەوانەی خوشـکەکەت زۆرت حەز لە مۆسـیقا و ئەدەبیات نییە. ژنەکان زۆر بە هۆگری و سـەرسـووڕمانەوە گوێیان لە قسـەکانم دەگرت و هەمووشـیان بە باوەڕەوە دەیانویسـت لەپی دەسـتیان بۆ بخوێنمەوە بەڵام من هەسـتام بە بیـانووی ئەوەی کە درەنـگ بووە، مـاڵاواییم لێ کردن. گوتم پەکوو لەو هەڵەیەی کردم، چونکە لەلایەکەوە ژنـان ئەوجار ناهێڵن لە ماڵی سـاشـا پشـوو بدەم و لەلایەکی دیکەوە ترس دایگرتم نەکا بەرپرسانی ئۆردووگا بیبیستنەوە و شـتەکە بە گوێی بەشـی زانیاری و پاراسـتنی سـۆڤیەت بگاتەوە. جا ئەودەمی وەرە ئەو کەرەی لەو قوڕە دەربێنەوە.

ناچار ماوەیەکی زۆر نەچوومە ماڵی سـاشـا، تەنانەت وەختێک ساشاش دەهاتە شوێنم، من بە بیانووی جۆراوجۆر خۆم لێ دەبوارد و نەدەچووم.

مـانگێـک پتر بوو نەچووبووم. کتوپڕ ڕۆژێـک چوومە ماڵەکەیان، هەر گەیشـتمێ، چەند ژن بەدووی مندا ئێزنیان وەرگرت و وەژوور هوتن.

ژنەکان هاتبوون لەپی دەسـتیان بۆ بخوێنمەوە. پەکوو لەو بەزمەی تووشـی خۆمم کرد. گوتم ڕاسـتە من هێندێ شتم لەبارەی خوێندنەوەی لەپی دەست خوێندووەتەوە و لە کتێباندا خوێندوومەتەوە بەڵام پێم وا نیە ئەو شـتانە ڕاست بن. زیاتر بۆ گاڵتە و سـەرخافڵاندنە و مەزەندە و گومانن

نەک ڕاستەقینە. ئینجا من لەوەشدا شتێکی وای لێ نازانم. زانیارییەکانم زۆر کرچوکاڵ و کەمن. خانمەکان گوتیان قەینا، با لەپی دەسـتیان بخوێنمەوە. منیش ناچار و بەناقایلی سـەیری دەسـتی هەردووکیانم کرد. ئاگادار بووم کە یەکێک لەو خانمانە ژنێکی بەڕهەڵدا بوو. هەر ڕۆژە و بیر و هەوەسـێکی لەسـەردا بوو. هەر بۆیە دەرفەتەکەم قۆسـتەوە بۆ ئەوەی وانەیەکی ئەخلاقیی پێ بدەم. گوتم تۆ دەبێ زۆرت ئاگا لە خۆت بێ. ژیان، هێمن و پڕ لە گرانوسـەنگینی و بەها و دوور لە ڕووداوی تاڵ دەبێ. هەر بۆیە تۆ دەبێ هەڵسـوکەوت و ڕەوشـی خۆت زۆر جڵەو بکەی، بۆ ئەوەی تووشـی ڕووداوی ناخۆش نەبی. هەرچۆنێک بوو لە چنگ ئەو دوو ژنە ڕزگار بووم. من ئیتر حەفتەی دواتریش نەچوومەوە ماڵی کاتیا و بڕیارم دا ماوەیەک خۆیان لێ ببوێرم و بەلایاندا نەچمەوە بەشـکم ئەو مەسـەلەی بەری دەسـت خوێندنەوەیە لەبیر بچێتەوە. بیسـت ڕۆژێک ڕابرد، سـاشـام دیت. گوتی دوانیوەڕۆ وەرە بۆ مـاڵمـان. گوتم چ بـاسـە؟ گوتی هەواڵێکی خۆش. کـاتیـا دەیویسـت بەشـوێنتدا بێتە ئۆردووگا. باش بوو چاوم پێت کەوت. گوتم تا نەڵێی چ باسـە، نایەم. گوتی ناتالی کوڕێکی دۆزیوەتەوە، سـبەی مـارە دەکرێن. گوتم کەوابوو بێ ئەملاوئەولا دێم. کە دوانیوەڕۆ چووم، کاتیا هەر دیتمی، وەکوو خوشـکێک باوەشـی پێدا کردم. گوتی ڕامان، مەزەندەکانت هەموو وەڕاسـت گەڕان. خوشـکەکەم خەریکە شـوو دەکا. تۆ

ئەوەی لەبارەی ناتاشـــاشـــەوە گوتبووت، ڕاســـت دەرچوو. گوتم نـاتـاشـــــا کێیە؟ گوتی هەر ئەو ژنەی گوتـت ئاگـات لەخـۆت بـێ. دوێـنـێ لەگەڵ کـامـیـۆنـێـک لـێکـیـان دا. بردوویـانەتە خەســـــتەخـانە. گوتم خوا بکـا چـاک بێتەوە و هیچی لێ نەیە.

پیرۆزباییم لە کاتیا و ناتالی کرد. ســــەعاتێک لەلایان دانیشـــــتم و گەڕامەوە ئۆردووگا. داوایان کرد شــــەوێ لە ڕێوڕەســـمی مارەبڕینەکەی ناتالیدا بەشـــدار بم. گوتم ئەگەر ئیزنم بـدەن دێمەوە. بۆخۆتـان دەزانن من تەنیـا ڕۆژانە ئازادم.

بۆ بەیانی، زوو لە کارگاوە هاتمەوە ئۆردووگا و چوومە لای ســــەرۆکی زیندان و مەســــەلەی زەماوەندی یەکێک لە برادەرەکانمم بۆ گێڕاوە. گوتی لەســەر بەرپرسیارەتیی خۆم ڕێگەت دەدەم بەڵام ئـاگـاداری خۆت بە. گوزتم دڵنیـا بە ســــبەی لە کاتی خۆیدا دێمەوە. دەمودەســـــت چوومە لای دەللاک و ســــەر و پرچم چاک کرد. چاکەت و پانتۆڵم لە عەمبارێ وەرگرتەوە و لەبەرم کرد. بەڵام بۆینباخم نەبوو، هەڵبەت دوو شت لە سۆڤیەت مۆد نەبوون، یەکێکیان بۆینباخ و ئەوی دیکە کڵاوی شـــاپۆ، کە مایەی گاڵتە و ســـوعبەتی کوڕەکـان بوو. هەڵ کەســـــیـان بەو کڵاوەوە دیتبـا، پێیـان دەگوت ئارتیستی ئەمریکی.

لەبیرمە کاتێک لە بادکوبە لە کۆلێژی پزیشکی دەمخوێند، یەکێک لە برادەرەکانی شـــەهریاری دایمە کڵاوی شـــاپۆی لەســـەر دەنـا. کوڕەکـان هەر ئێمەیـان دەدی وەدوومـان

دەکەوتن و لە سەری یەکتریان ڕادەکێشا و دەیانگوت سیلەندر.

ئیتر چاکەت و پانتۆڵ و پاڵتۆی گەرمی زستانیی کە پێیان دابووم کردمە بەرم و لە ئۆردووگا چوومە دەرێ. بەر لەوەی بچمە ماڵی کاتیا، دەستەگوڵێکم لە دەرەوە کڕی و چوومە ماڵەکەیان. لە دوورەوە دەنگی مۆسیقا دەهات. کە دەرگای ئاپارتمان کرایەوە، هۆڵەکە پڕ بوو لە ژن و پیاو. کاتیا بە هەموانی ناساندم. پیرۆزباییم لە بووک و زاوا کرد. ناتالی لەبەرچاوی زاوا ماچی کردم و گوتی پێشبینییەکەت وەڕاست گەڕا. زاوا کە ناوی ئالێکس بوو، پرسیی ئەوە دەڵێ چی؟ ناتالی بۆی گێڕاوە. گوتم تەنیا ئاگات لەو دوو منداڵە بێ کە پێشبینیم کردوون. ئالێکس گوتی لەوە باشتر هەر نابێ. من کوڕێک و کچێکم دەوێ. مێز و کورسییان لە دەر و جیران بە ئەمانەت وەرگرتبوو. نان و چێشتێکی باشیان ئامادە کردبوو. پاش ساڵانێک، شەوێکی خۆشم ڕابوارد.

## مەرگی دیکتاتۆرە مەزنەکە

ڕۆژێک لە شوێنی کارەکەم لەگەڵ چەند کەسێک لە سەردەستەکان دانیشتبووین، باسی عەرش و قورشمان دەکرد. کتوپڕ هۆڕنی شەمەندەفەر و کامیۆن و زەنگی کارخانەکان لە شارەکە گەڕا. لەو کاتەدا، ئەوە نیشانەی ڕووداوێک بوو. بە سەرسووڕمانەوە چووینە نووسینگەی بەرپرسانی کارگە و سەیرمان کرد هەموو بەپێوە ڕاوەستاون و کڵاوەکانیان داگرتووە. ئێمەش ڕاوەستاین. خولەکێکی پێ چوو، کە ڕێوڕەسمەکە تەواو بوو. گوتیان ڕادیۆ هەواڵی مەرگی ڕێبەری بڵاو کردووەتەوە و بەو بۆنە تاڵەوە، خولەکێک زەنگی کارخانەکانی سەرانسەری سۆڤیەت لێ دراون.

بەڵێ، ستالین، دیکتاتۆرە مەزنەکە مردبوو. گۆیا بە هۆی جەڵدەی مێشکەوە مردبوو. ئەوە ئاخر و ئاقیبەتی ژیانە، ئیتر چ لە نوێن و باندا بێ و چ لەسەر عەرز. لەوانەشە بە مەرگی کۆتایی بەو زوڵم و ناحەقی و بێدادییانە لەم وڵاتە پانوبەرینەدا بێ.

ئیتر باسی بیروباوەڕ و ڕێباز و ئەو شتانە هەر ناکەین. بەڵام ئەوەی ناوبراو کردی، جگە لە چارەڕەشی و ماڵوێرانی و زیندان و تیرۆر و ترس هیچ شتێک لەگۆڕێ نەبوو. داوەریکردن لەوەدا دەخەینە ئەستۆی مێژوو. بە دڵنیاییەوە مێژوونووسان بەگوێرەی پێویست ئاوڕی لێ دەدەنەوە. بەڵام مەرگی وی بۆ هەموو زیندانییەکانی وڵاتی سۆڤیەت

هەواڵێکی دڵخۆشکەر بوو و گۆڕانکاریی زۆر گرینگی لە ئۆردووگاکاندا بەدی هێنا.

یەکەمین کاریگەرییەکەی لە زیندان، ئازادبوونی هەموو زیندانییەکان بوو، کە بە تۆمەتی لنینیزم کەوتبوونە زیندانەوە. یانی کەسانێک کە لایەنگری لینین و بیروبۆچوونەکانی بوون و دژی بەرنامەکانی ستالین بوون.

لە دەرەوەش بیستمان، کۆمەڵێک لە سەرکردەکانی کۆمۆنیست و پۆلیت بۆرۆ سزا دراون و لە سێدارە دراون. یەک لەوان میرجەعفەر باقرۆف سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەریی کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەت و یەمیلیانۆڤ وەزیرە غەددار و زاڵمەکەی ئێم.گ.ب لە ئازەربایجان و ژەنەڕاڵ ئاتاکشیۆڤ هەڵسوڕێنەرانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و کۆماری کوردستان و سەرهەنگ پادارۆڤی لێکۆڵەری من، هەر هەموو لەسێدارە دران و هەموو سزای کار و کردەوە نامرۆییەکانی خۆیانیان دی. یەمیلیانۆڤ و پادارۆڤ منیان ناردە شوێنێک، کە هەرگیز نەگەڕێمەوە، بێخەبەر لەوەی ئەو چاڵەی بۆ من و کەسانی دیکەیان هەڵکەند، بۆخۆیان تێی کەوتن.

حکوومەتە زاڵم و دژەمرۆییەکان لەوانەیە بە زەبروزەنگ و زیندان و سێدارە ماوەیەک خۆ ڕاگرن، بەڵم بەدڵنیاییەوە خۆ ناگرن و نامێننەوە. جیهان بە دادپەروەری دەگیرێ نەک بە زەبروزەنگ. دیکتاتۆری بە

هەر ڕێچکە و ڕێبـاز و بیروبـاوەڕێکەوە بێ، چەوت و قێزەونە، جا دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا بێ یان هەر شـــتێکی دی.

گۆڕانێکی دی کە بەســەر دۆخی زیندانییەکاندا هات ئەوە بوو، کە لە هەمبەر هەر ڕۆژێک کارکردندا، ســـێ ڕۆژ لە مــاوەی زینــدانییەکەی کەم دەکراوە. بەرپرســــان و مەئموورەکانی زیندان ترســـێکی زۆریان ڕێ نیشـــتبوو. هەڵســـوکەوتیان لەگەڵ زیندانییەکان وا نەرمونیان ببۆوە، ســـەرت ســـووڕ دەما. شـــادی و حەژمەتێکی ســـەیر ئۆردووگـاکەی داگرتبوو. مەرگی دیکتـاتۆر، دۆخێکی وای دروســـت کردبوو، کەس بڕوای نەدەکرد. لە دەرەوەش ئەو گۆڕانە جوان بەدی دەکرا. خەڵکەکە ڕەنگ و ڕووی کرابۆوە و قەلافەت و ڕوخســـارەکان شـــاد و گەش ببوونەوە. فرۆشـــگاکان وەکوو جاری جاران بەتاڵ نەبوون. مەرگی دیکتاتۆری مەزن، هەڵاتنی خۆری ئازادیی نەتەوە چارەڕەش و لێقەوماوەکانی ســـۆڤیەت بوو. ئەو ڕووداوانەی پەیتاپەیتا ڕوویان دەدا، نیشـــانەی ئەوە بوون، کە هیچ شـــتێک لەم دنیـایەدا نەگۆڕ و بەردەوام نییە، هەموو شـــتێک گۆڕانی بەسەردا دێ.

بـاشـــبوونی دۆخی نـاوخۆی ئۆردووگـاکـان لە ڕووی خۆراک و جلوبەرگ و حەق و مزی کار و حیســـابکردنی ســـێ ڕۆژ لەبری ڕۆژێک کار، ئەو ڕووداوانە بوون کە لە ماوەیەکی کەمدا ڕوویان دا. من کە نیوەڕۆژ ئازاد کرابووم، پتر لە جاران چێژم لەو ئازادییە دەبرد. ماڵی کاتیا بۆ من مەکۆی خۆشـی و شـادی بوو. سـەرەڕای ئەوەی ئەو تۆزە

ئازادییە دەڵەمەیە چارەی دەردی منی نەدەکرد و جگە لە بەفیڕۆچوونی تەمەنم ئاکامێکی نەبوو و ئامانج و ئاواتی من شـــتێکی دیکە بوو، ئاواش هەر ئەوەندە ئازادییەش لەو دۆخەدا بۆ من نیعمەتێکی گەورە بوو و هاوکات هیوای ئەوەی خســتبووە دڵمەوە کە بێتاوانییەکەم ســەلماوە و لەوانەیە پەروەنــدەکەم تــاوتوێ بکرێتەوە و دەمتوانی مەزەندەی ئەوە بکەم، قۆناغی زیندانییەکەم زۆر ناخایەنێ.

# ئازادبوونم

چەند ڕۆژێکی مابوو بۆ بەهاری ١٣٣٣، ئەو ســـاڵ و ڕۆژانە زۆر لێک دەچن. جاری وایە ســـاردە و جار هەیە گەرم. بەڵام ئەوەی لێک ناچن، ئەو ڕووداوانەن کە تێیاندا ڕوو دەدەن. خۆشـــی و ناخۆشـــییەکان، ئی ڕۆژەکان نین، بەڵکوو ئی ئەو ڕووداوانەن. لە یەکێک لەو ڕۆژانەی پێش بەهاریدا بوو، کە ســـنوورم بەزاند و خۆم خســـتە داوە مەترســـیدارەکەی ئێم.گ.ب. ئاکامەکەی، حەوت ســـاڵ ســـووکایەتی و دەربەدەری و زەجر و کوێرەوەری بوو. حەوت ساڵ لە باشترین ڕۆژانی تەمەنم، باشترین قۆناغی گەنجیم بەفیڕۆ چوو و بوو بە تۆزی بانان. ئەگەرچی ئەو ڕۆژانە و ئەو دەرفەتە گرانباییانە هەرگیز ناگەڕێنەوە، بەڵام دەکرێ لانیکەم دەرس لەو ڕووداوانە وەرگرین. هەر شکستێک، پێشەکیی سەرکەوتنێکە، بەو مەرجەی بکرێ خاڵە لاوازەکان و هەڵەکانی خۆت بدۆزیتەوە، ئەگەرچی دەسنیشانکردنی ئەو شتانە ئەستەمە، بەڵام ئیتر مرۆڤ بەهێزتر و کۆڵنەدەرتر دەکەن و دەبێتە هۆی ئەوەی بە تێڕوانینێکی وردترەوە پرس و کێشەکان چارەسەر بکەی و بە بەرچاوڕوونییەکی زیاترەوە ڕێی ژیان بگریتەوە بەر.

ئیتر زۆری نەمابوو بۆ نەوڕۆز، کە لە شـــوێنی کارەوە دەگەڕامەوە ئۆردووگا. گرووبانەکەی زیندان بانگی کردم و گوتی بچمە نووسینگەی ئۆردووگا. سەرۆکی ئۆردووگا هەر لەوێ دیتمی گوتی، پیرۆزباییت پێ دەڵێم. نەمدەزانی مەسەلە چییە و باســـی چ دەکا. گوتی حوکمی ئازادیی تۆ و چەند

کەسێکی دی هاتووە. سبەینێ دەبێ ماڵاواییمان لێ بکەی. چوومە پێشێ و توند دەستیم گوشی و سەرەڕای ئەوەی زۆر لە گرووبانەکەی زیندان بێزار بووم، باوەشـــم پێدا کرد. لە خۆشیان نەمدەزانی دەبێ چی بکەم.

خێرا چوومە دەرێ. چوومەوە خەوتنگەکەمان. عەزیز و عەلـی ئەکبەر چـاوەڕێم بـوون. پێکەوە چـووینە خەوتنگەی غەریـب و کوڕەکـانی دیکەش. هەر دیتیـانم هوڕایان کێشـا. قریوەی شـادی و حەژمەتمان دەگەیشـتە ئاســـمان. ئەی ئازادی، چ نعمەتێکی مەزنی. پرســـییان ئاگاداری؟ گوتم ئەوە ئێسـتا ئاگادار کرامەوە. باوەشـمان بە یەکتردا کرد. هەموان وێکڕا ئازاد ناکەن، بەڵام ئازادیی هەموان مسۆگەرە. بایەکە و هەڵی کردووە.

بە عەلی ئەکبەرم گوت بچێتەوە بـاراک، هەرچیمـان هەیە بیهێنێ بیخۆین. ئەمشەو دەبێ لە دەوری یەکتر بین. چوو، هەرچی هەبوو، خواردنی چێشـــتخانە و پشـــکی زیندانیشیان هێنا. ئەو شەوە پێکەوە بە شادی و دڵخۆشی نانمان خوارد. شەو بە کۆڵێک خەون و خەیاڵی خۆشەوە خەوم لێ کەوت. تاقە شـەوێک بوو کە پاش حەوت سـاڵ بە خەیاڵی ئاسـوودەوە سـەرم دەناوە. بەیانی کە لەخەو هەســـتام، تاو هەڵاتبوو. جێگرەکەم، دەســـتەکەی منی بردبووە شـوێنی کار. دنیا هەر وایە، یەک دەڕوا و یەکی دی جێی دەگرێتەوە.

ســـەرۆکی ئۆردووگا پێش نیوەڕۆ ئێمەی کە نۆ کەس بووین، شـــەش ئێرانی و ســـێ ئاڵمـانی، بـانگ کردە

ژوورەکەی خۆی. پێی ڕاگەیاندین لە ئێستاوە ئازادن. بەلام چونکە کارەکەتان لە یەک شوێن ماوەتەوە و شێوازی گەڕانەوەتان جا بۆ ولاتی خۆتان بێ یان ولاتی ئێمە، لەوێ ڕوون دەکرێتەوە. هەمووتان لەگەڵ کاربەدەستێکی ئێمە دەڕۆن بۆ شوێنی دیاریکراو، کە نزیک مۆسکۆیە. ئاگادار بن لێی هەڵنەبڕێن. هەموومان چووینە ژمێریاریی ئۆردووگا، حیسابەکانمان بە نەقدی وەرگرت و بەڵگەی پێوەندیدارمان واژوو کردن. من چوومە عەمباری ئەمانەتەکان، جلوبەرگ و هێندێ وردە شتی دیکەم کە وردە وردە دابینم کردبوون، وەرگرتەوە و دامن بە عەلی ئەکبەر. بۆخۆم بەپەلە لە ئۆردووگا چوومە دەرێ و چوومە ماڵی کاتیا. باش بوو لە ماڵ بوو. ئاگادارم کردەوە و پێم گوت لەوانەیە ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ بچینە کاراگاندا. کچە چکۆلە و جوانکیلەکەی پرسیی، مامە ڕامان بۆ کوێ دەچی؟ گوتم، بەقوربان، بۆ ئازادی و ئەگەر قسمەت بێ بۆ ئێران. کاتیا چاوی پڕ بوون لە فرمێسک. گوتی ڕامان، پێشگۆییەکانت هەموو ڕاست بوون، تەنانەت ئازادییەکەی خۆشت. گوتم کاتیا خانم سپاس بۆ موحیببەتی ئێوە و بەڕێز ساشا و ناتالیی خوشکت، ئەمەگدارم. هەرگیز چاکەتان فەرامۆش ناکەم. وەکوو خوشکێک مالاواییم لەو ژنە میهرەبانە کرد و ئیتر ئەو ئازیزانەم نەدیتەوە.

## دنیای ئازادی تا شاری ویلادیمیر

نانی نیوەڕۆیەمان لە ئۆردووگا خوارد. دوانیوەڕۆ مالآواییم لە دۆست و ئاشنا و هاوڕێیان بەتایبەتی عەلی ئەکبەری ئەردەبیلیی لێقەوماو کرد و لە زیندانی تەمیرتایۆ هاتمە دەرێ. ئەمجار کە بە پیکەبێک دیواری بەرز و دەرگا گەورەکەی ئۆردووگام بەجێ هێشت، ئەو قەڵا شوومەم وەکوو قەفەزێکی ئاسنین دەدی کە کۆمەڵێک مەلی بێ پەڕوباڵیان تێدا زیندانی کردووە. خۆیشم تا چەند ساتێک لەوەپێش یەکێک بووم لەو چارەڕەشانە. دەشت و بیابان بەشێوەیەکی دیکە دەهاتە پێش چاوم. هێشتا چەند کیلۆمەترێک لە ئۆردووگا دوور نەکەوتبووینەوە، ژن و پیاوێکم دی کە بەرەو ئۆردووگا دەچن. هەستم کرد ئاشنان، کە ورد بوومەوە ناتالی و ئالێکس بوون. لە سەری ماشێنەکەم دا. شۆفێرەکە ڕای گرت. خۆم فڕێ دا، هەردووکیان ئامێزیان پێدا کردم. ناتالی گوتی، دوێنێ لە کاتیام بیست، گوتمان تا درەنگ نەبووە بەشکم بێم بتبینم. نەمدەزانی بە چ زمانێک سپاسیان بکەم. لەو وەزعە خۆشییەدا گریام. ناتالییش گریا. پرسییان ئێستا بۆ کوێ دەچن؟ گوتم کاراگاندا و قەول وایە لەوێوە بچینە مۆسکۆ. لە هەر شوێنێک بم نامەتان بۆ دەنێرم و تا هەم لەبیرتان ناکەم. وەکوو خوشک و برایەکی ئازیز ماڵوایيم لێ کردن. سواری ماشێنەکە بوومەوە و چەند ساتێک دواتر، لە گەوی ڕێیەکەدا لەچاوانم ون بوون. وەک ڕابردوویەکی زۆر

دوور، سـەعات ٥ی پاش نیوەڕۆ گەیشـتینە کاراگاندا. قەول وابوو بچینە وێسـتگەی شـەمەندەفەر، بەڵام داوامان لە ڕێنوێنەکەمان کرد تۆزێک بە شارەکەدا بمانگێڕێ. ماشێنەکە بە چەند شـەقامێکدا تێپەڕی. کارگاندا دیار بوو لە شـاری بادکوبە پاکوخاوێنتر و جوانتر بوو. ماشـین لەبەر دەرگای فرۆشگەیەک ڕای گرت، چووینە ژووری و هەر کەسـە و بە پێی گیرفانی خۆی شـتێکی کڕی. ئینجا چووینە وێسـتگەی شەمەندەفەر.

ڕێنوێن چووە لای بەڕێوەبەری وێسـتگەکە و جێی بۆ دابین کردین. چارەگێک بۆ حەوت سوار بووین. شەمەندەفەر پڕ بوو لە ژن و پیاو و پیر و لاو، دوو ژووریان بۆ تەرخان کردین. هاوڕێیان چوونە ڕسـتوڕانتی شـەمەندەفەرەکە و تێر و پڕ نـانیـان خوارد. نـاحەقیـان نەبوو، سـاڵانێک بوو لە شـوێنێکی ئـازاد نـانیـان نەخواردبوو. دەتگوت کۆمەڵێک باڵندەن، کە لە قەفەز ئازاد بوون. بە حەژمەتەوە سـەیری کچانی نێو ژوورەکانیان دەکرد.

دوو شەو و ڕۆژ لە شەمەندەفەردا بووین، کەچی هەستم بە ماندوویەتی نەدەکرد. پێش نیوەڕۆ شـەمەندەفەرەکە لە وێسـتگەیەک ڕای گرت. ئێمە دابەزین. وێسـتگەیەکی گەورە بوو. هۆڵێکی گەورەشـی هەبوو. ڕێنوێنەکە گوتی: ئێرە وێستگەی شاری کۆیبیشۆڤە.

شـەمەندەفەر لەو وێسـتگەیەدا ٨ سـەعات ڕادەوەسـتێ. تا حەوتی دوانیوەڕۆ دەرفەتە دەتوانن بچنە شـاری، بەڵام پێش سـەعات ٧ لێرە بن. بەرپرسـیارەتیی دواکەوتن لە ئەسـتۆی خۆتـانە. من و غەریـب پێکەوە چووینە دەرێ. بە دەم

شەقامێکی کەنار ڕووباری وێڵگادا ڕۆیشتین. بە ڕاستی شارێکی جوان بوو. لە پێشدا گەیشتینە بازاڕی میوەفرۆشان. هۆڵێکی گەورە بوو، لە هەر دوو بەرەوە میوەفرۆش، کە هەر هەموویان ژن بوون. هێندێ ترێ و هەرمێمان کڕی. نازانم ئەو میوە جۆراوجۆرانەیان لە کوێ هێنابوو. میوەمان لەگەڵ خۆمان بردە کەناراوەکە و لەسەر چۆمەکە، کە کەشتی تێیدا هاتوچۆیان دەکرد، دانیشتین. ترێیەکە، بە ڕواڵەت ڕەش بوو، بەڵام زۆر خۆش بوو. دیتنی ڕووباری وێڵگا و هاتوچۆی کەشتییەکان دیمەنێکی سەرنجڕاکێش و شیاوی دیتن بوو. نانی نیوەڕۆشمان لە ڕستوڕانەکەی کەنار خوارد. سەعات سێی دوانیوەڕۆ بەرەو شاری وەڕێ کەوتین، تا گەیشتینە بەردەم سینەمایەک، کە فیلمی "لەگلەگەکان دەفڕن"ی پێشان دەدا. دوو بلیتمان کڕی و ژوورینە ژووری. بە ڕاستی فیلمێکی باش بوو و کاری لە ڕۆح و ورەمان کرد.

سەعات شەشی ئێوارە گەڕاینەوە وێستگەی شەمەندەفەر و بۆ برادەرانمان گێڕاوە چۆن گەڕاوین. پێنج دەقەی مابوو بۆ حەوت، سواری شەمەندەفەر بووین. شێومان لە ڕستوڕانتی شەمەندەفەرەکەدا خوارد. سبەی نیوەڕۆیە گەیشتینە شوێنی مەبەست و لە وێستگەیەک بەناوی ویلادیمیر دایانبەزاندین. ئەو وێستگەیە لە قەراغ شارێک بوو، بەو ناوەوە.

ویلادیمیر شارێکی بچکۆلانە بوو، زۆر لە مۆسکۆی پایتەختی سۆڤیەتەوە دوور نەبوو. زۆرم حەز لێ بوو لە

نزیکەوە مۆسکۆ ببینم، بەتایبەتی زانکۆ گەورەکەی مۆسکۆ
بە ناوی لۆمۆمبا. ئەو زانکۆیە ناوبانگێکی جیهانیی هەبوو.

## ئۆردووگای نوێ

ئۆردووگا، یان ئەو وێستگەیەی ئێمەی چووینێ، لە نێو شار بوو. دەوروبەری وێستگەکە، تەختەبەند کرابوو. لە دیوی ژوورەوەی حەوت خەوتنگەی گەورە هەبوون. پێنج خەوتنگە بۆ پیاوان و دووانیان بۆ ژنان تەرخان کردبوو. ئێرە، پاسەوان و چاوەدێری لێ نەبوو. ئەوەندە نەبێ لە پەنا دەرگای وەژوورکەوتنەکەوە نووسینگەیەک هەبوو تایبەتی سەرۆکی وێستگەکە و چەند فەرمانبەرێکیش کە کاروباری ئۆردووگاکەیان ڕادەپەڕاند. هەموو کاروبارەکانی ناوخۆی ئەو شوێنە لە ئەستۆی کەسانی نێو ئەوێ واتە کۆنەزیندانییەکان بوو، کە ئێستا ئازاد ببوون. ئەو وێستگەیە ناوی "خاڵی بەڕێکردن" بوو.

ئەگەرچی هەموو ئەوانەی لەو وێستگەیەدا بوون، زیندانیی ئازادکراو بوون، کەچی تا تەکلیفیان تەواو ڕوون نەکرابایەتەوە بۆیان نەبوو لەوێ بچنە دەرێ، بەڵام هەر دەیانزانی زۆری نەماوە تەواو ئازاد بن. هەر بۆیە هیچ نارەحەت نەبوون و کێشەیان لەگەڵ دۆخەکە نەبوو. هەڵبەت ئەگەر یەکێک پێویستی بە دەرەوە بوایە، بۆ چەند سەعاتێک کارتی چوونەدەرەوەیان پێ دەدا. وردە وردە پەڕاوەکان تاوتوێ کران و لەگەڵ کەسەکان قسە کرا بۆ ئەوەی بنێردرێنەوە وڵاتی خۆیان، یان لە سۆڤیەت دەمێننەوە.

خەوتنگەیەک بۆ ئێرانییەکان تەرخان کرابوو. ناوی ئەو کەسانەی دەهێنرانە ئەو ئۆردووگایە، لە دەفتەرێکی

تایبەتدا دەنووسـرا. ژمارەی ئێرانییەکان لە ٤٠ کەس زیاتر بوو. پاش ئەوەی گەیشتینە ئەو وێستگەیەدەمودەست منیان کردە بەرپرسی چێشتخانە و پشکی خۆراک. ئەو بیانیانەی لەو وێستگەیە بوون، بریتی بوون لە ئەڵمانی و فەرەنسی و پۆلۆنی و ئیتالیایی و ئەفغانی و ئێران. زیاتریان خەڵکی ئێرانی بوون. ژنەکان کەم بوون، هەر سی کەسێک دەبوون. بەڵام تاقە ژنێکی ئێرانی یان ئەفغانیشیان لەنێودا نەبوو.

لەدەم چێشتخانەکەوە کە زۆر ڕێکوپێک بوو، عەمبارێک و دوو هۆدە هەبوون، مێزێکی نووسین و هێندێ دەفتەر بۆ تۆمارکردنی خۆراک و پێویستییەکان، ئەوە هۆدەی کاری من بوو. من لە پێشدا ئەو خۆراکەی لە عەمبارەکەدا بوو، لەگەڵ ئەوەی لە دەفتەرەکەدا نووسرابوو، پێکم گرتن و لە ژێر دوا ژمارەی خەتێکم کێشا و ڕێکەوتەکەیم نووسی و ئیمزام کرد.

کرێکاری چێشتخانە لە نێو ئەو کەسانە هەڵبژێردرابوون، کە لەو وێستگەیەدا مابوونەوە، بەڵام دوو چێشتلێنەریان لە لاکەرەکانی دیکە هێنابوو. دەمڕاستی چێشتلێنەرەکان دوانیوەڕۆ دەهاتە ژووری کارەکەی من و پشکەخۆراکی بەپێی لیستەی نووسینگەی وێستگەکە بە من دەدا و لەسەر تەرازووەکە دەیکێشا و دەیبرد. سێ جەمە خواردنیان دەدرایە.

هێندێ لە خانمەکان پشکەخۆراکیان وەردەگرت و بۆخۆیان لێیان دەنا. ئەگەرچی ڕۆژێ جارێک من دەچوومە دەرەوەی وێستگەکە و بە عارەبانە، بەشی چەند ڕۆژانم لە عەمبارە گەورەکەی شارییەوە دێنایە نێو وێستگەکە، چونکە

حەزم لێ نەبوو لەو شـــاره بچكۆلانەیەدا بگەڕێم، بۆیە هەر كـارم تەواو دەبوو دەگەڕامەوە. ڕۆژانە كە بێكـار دەبووم، لە نووسـینگەكەم خۆم بە خوێندنەوەوە خەریك دەكرد، چونكە كتێبخانەیەكی باشی لێ بوو.

زۆربەی شـەوانەش فیلمی سـینەمایی پیشـان دەدرا. جگە لەوەش، كەلوپەلی وەرزش و یـاریی تـایبەتی شــەترەنجی لێ بوو. بڕوا نـاكەم لە هیچ جێیەكی ئەم دنیایە هێندەی سـۆڤیەت شـەترەنج باو بووبێ. چەند ڕۆژ جـارێك كۆمەڵێك كەسـیان ئازاد دەكرد، جا چونكە ئەوانەی لەو وێسـتگەیە ڕاگیرابوون هەموو بیانی بوون، زۆربەیان بەڕێی وڵاتی خۆیان دەكرانەوە و لەبری ئەوان كۆمەڵێك كەسـی دیكەیان دێنا. تا دوا سـاتی مانەوەم لەوێ، ژمارەی كوردەكانی نێو ئەو وێسـتگەیە، هەر پێنج كەس بوون. یەكێكیان عەزیز بوو كوردی قووچان بوو، دوو كوردەكەی دیكە جەلالیی لای ماكۆ بوون بەناوەكانی گوزەل و ئێكیت. عەزیزی ئاسـەفی هاووڵاتیی خۆم و منیش. لە نێو ئەوانەدا ئەوی لە هەموان لەڕ و لاوازتر بوو، كاك عەزیزی ئاسـەف بوو، كە دەیتگوت هەموو ماوەی زیندانییەكیە لە سـیبریا بووە و، وەكی دەیگێڕاوە، لەگەڵ محەمەدی شـیرازی ڕایان كردبوو بۆ سـۆڤیەت. ئەنجومەنی تـایبەتی، یەكی ٢٥ سـاڵ بێگـاریی لە ئۆردووگاكاندا بۆ بڕیبوونەوە.

ئاسـەف، گەنجێكی تا بڵێی بەئەدەب و گرانوسـەنگین بوو. جاری وابوو ئەوەندە بەهێمنی قسـەی دەكرد، كە

گوێم لە دەنگی نەدەبوو. زۆریش نیگەران بوو. لە سـێبەری خۆی دەترسـا. هەر جارێکی دەمگوت کچێ مەترسـە، قاقای دەکێشـا. بەسـتەزمانە هاتبوو لە بەهەشـتی بەڵێنپێدراو میوەیەک لە داری تووبا لێ بکـاتەوە. بەڵێ میوەکەی زۆر تاڵ بوو، ٢٥ سـاڵ مەحکوومییەت بوو. زۆربەی جار دەهاتە نووسـینگەکەی من و پێکەوە دادەنیشـتینە قسـەکردن. ڕۆژێکیان پێم گوت ئاغای ئاسەف من لەگەڵ ڕەحیم ئاسەفی ئامۆزات هاوپۆل بووم، جا سەیر ئەوەیە وێنەیەکیشم لەگەڵی هەیە، کە تۆ لەسـەر کۆشـی دانیشـتووی، لەگەڵ محەمەد ئاسەفی ئامۆزاشت یەکترمان دەناسی. حەیفێک کە ئەو دوو گەنجە، جوانەمەرگ بوون. ئەو وێنەیەی کە ئێسـتاش ماومە، ئی ساڵی ١٣١٦ـیە، وەختێک کە من یەکی دواناوەندی بووم، پێم وایە وێنەکە لە باغی شـێخی بە کامێرای کاک محەمەدی ئاسـەف گیراوە. ئاغای ئاسـەف زۆری حەز لێ بوو بزانێ بۆچوونم لەسـەر گەڕانەوە بۆ ئێران چییە؟ ڕاشـکاوانە پێم گوت هیچ بەتەمـا نیم لەم وڵاتە بمێنمەوە. ئێسـتـا کە ڕوخساری ڕاستەقینەی ئەو ڕژیمەم ناسیوە، مانەوە لێرەوە شـێتی و بێ ئەقڵییە. حوکمەتێکی لەهیچ و خۆڕایی ٢٥ سـاڵ زیندانی بەسەر گەنجی وەک ئێوەدا بسەپێنێ، کوێی شیاوی متمانەیە؟ من لەگەڵ سـەد کەس لە حوکمدراوان قسـەم کردووە و لێم پرسـیون لەسـەر چی حوکم دراون، تەنانەت لە یەکدانەشیاندا دادپەروەرانە حوکم نەدراون.

خۆ ئێمە باسـی بیروباوەڕ ناکەین. من هیچ کـارم بە بیروبـاوەڕی کۆمۆنیسـتی نییە، بەڵام ئەوەی بە کردەوە دەیبینم، لەوانەیە خراپترین ڕژیمێک بێ، کە لە دنیـادا هەیە.

بە دڵنیاییەوە ژیان لە وەها ڕژیمێکدا بەتایبەتی بۆ ئێمە کە بێگانەشین، کارێکی ژیرانە نییە. من تەنانەت وەدەستهێنانی پلەی زانستیش لەو وڵاتەدا بەشتێکی بێبایەخ دەزانم و پێم باشترە لە دنیای سادەدا کرێکارێکی سادە بم. ئیتر ئەوە بیروباوەڕی خۆمە.

## ناسینی خانمێکی فەڕەنسی

لە نێو ژنەکانی وێستگەکەدا، خانمێکی فەرەنسی هەبوو بە ناوی ماری، کە تازە هاتبووە ئۆردووەکەی ئێمە. هەر جارێکی بۆ وەرگرتنی پشکی خۆراک دەهاتە نووسینگەی من، چەند قسەیەکیشمان بە فەڕەنسی دەکرد. ئەویش دڵی بەوە خۆش بوو کە یەکێک پەیدا بووە چەند قسەیەکی بە فەرەنسی لەگەڵ بکا. من داوام لێ کرد زیاتر بێتە نووسینگەکەم. بەشکم بۆ فێربوونی زمان کەلکی لێ وەرگرم. ژنێکی سی و چەند ساڵان بوو، زۆر بە نەزاکەت. زمانی ڕووسی زۆر باش فێر ببوو، بەڵام هیچ جوان نەبوو. هاتوچۆیەکەی وی بۆ نووسینگەکەم بیرێکی بە مێشکمدا هێنا و نەخشەیەکم کێشا. ئەوەی ڕاستی بێ، سەرەڕای ئەوەی هیچ حەزم لێ نەبوو لە سۆڤیەت بمێنمەوە، بەڵام پێشم باش نەبوو بچمەوە ئێران. لەلایەکەوە دەترسام دووبارە هاتنەوەم بۆ سۆڤیەت لەوانەیە بکرێتە بیانوویەک بۆ دەسبەسەرکرانم و لەلایەکی دیکەوە دڵنیا بووم کە بەهۆی ئەوەی کارەکەمم لەدەست دابوو و لە خوێندنەکەشم ببووم، لە مەینەت و کوێرەوەریی هیچ شتێک چاوەڕێم ناکا، بۆیە بیرم لەوە کردەوە، لەبری گەڕانەوەم بۆ ئێران، بچمە فەڕەنسا. لەوانەبوو لە سۆنگەی ماری خانمەوە، توانیبام ئەو ئامانجە باشە وەدی بێنم. هەر بۆیە ڕۆژێک لەگەڵی باسم کرد، پێم گوت گەڕانەوەم بۆ ئێران مەترسیی زۆری بۆ من هەیە، بیرم لەوە کردەوە کە ئەگەر ئیزن بدەی و ڕازی بی، لەگەڵت بێمە فەڕەنسا. پرسیی، مەگەر شتی وا دەبێ؟ گوتم

دەڵێم زەماوەندت لەگەڵ دەکەم. کەوابوو بڕیاری چوونی من بۆ فەڕەنسا، ماقووڵ دەنوێنێ. ئەگەر بەرپرسانی سۆڤیەتی ڕازی بوون، باشترە پێکەوە دەچینە فەڕەنسا و لەوێش هیچ کێشە نابێ. ئەودەم ئێمە هەردووکمان دوو کەسی پێگەیشتوو و ژیرین، ئەگەر ویستت پێکەوە دەژین، ئەگەر نا، هەر کامە و بە ڕێی خۆماندا دەڕۆین، بەڵام من بەڵێن دەدەم لە جوابی ئەو چاکەیەتدا لەسەر بەڵێنی خۆم سوور بم. ئەگەر ڕازییش نەبوون، ئەوە زەرەرێکمان نەکردووە. بیرێکی لێ کردەوە و بابەتەکەی تاوتوێ کرد، ڕازی بوو. لەو ڕۆژە بە دواوە، ماری زۆربەی کات دەهاتە هۆدەکەی من و ئەوانی دیکەش بڕوایان کردبوو، کە حەز لێک دەکەین، بەڵام لە ڕاستیدا من هێندەی سەرەدەرزییەک بە خراپ سەیری ماریم نەدەکرد. هێندێ کات ژیان، مرۆڤ ناچار دەکا کارێکی وا بکا، کە قەت بەنیازی شتی وا نەبووە و لەگەڵ ئەخلاق و هەڵسوکەوتیشی یەک ناگرێتەوە. پاییز بەسەردا هاتبوو، هەوا وردە وردە ساردی دەکرد. لە نووسینگەکەم، نوقمی دەریای خەیاڵ بووم. ئاغای ئاسەف هاتە ژوورەکەم و گوتی هەواڵی تازە. پرسیم چی بووە؟ گوتی ئەفسەرێک لە مۆسکۆوە هاتووە، دۆخەکەمان تاوتوێ دەکا.

دوا نیوەڕۆ یەک یەک لە کوڕەکانی کۆڵییەوە. بێ ئەملا و ئەولا هەموو گوتبوویان دەگەڕێنەوە ئێران. پاش ئەو هەمووە چارەڕەشی و سووکایەتییە، کەس ئامادە نەبوو لەو بەهەشتە بەڵێنپێدراوە بمێنێتەوە. بەهەشتێک، کە

لەپێناویدا هەموو شتێکی خۆیان لەدەست دابوو. نۆرەی من و ئاغای ئاسـەف و چەند کەسـێکی دی خرایە سـبەینێ. شـەوێ خەوم لێ نەکەوت. هێشـتا بڕوام نەدەکرد وا بە ئاسانی ئامادە بن کوڕەکان بنێرنەوە ئێرانێ. هەرچۆنێک بێ، دەبێ وەڵامێک بدرێتەوە کە دڕدۆنگی نەهێنێ و هۆکاری چوونەدەرەوەی سـۆڤیەت ئەگەرچی مافی یاسـایی هەر کەسێک بوو، بەڵام دەبوو بەشێوەی ماقووڵ بخاتە ڕوو.

بەیانی نۆرەی منیش هات. ئەفسـەرێک بە پلەی سـەروان لە پشت مێزێک دانیشتبوو، سڵاوم لێ کرد. فەرمووی کردم دانیشم. بە بزەیەکەوە پرسیی: بڕیارت چییە؟ تۆش دەتەوێ بچیەوە ئێران یـان دەتەوێ لێرە بمێنییەوە؟ هەڵبەت زۆر ڕاپۆرتی باشـمان لەبارەی تۆوە لە کاکەرەکانی پێشـوو و لێرەشـەوە بۆ هاتووە، هەر بۆیە کێشـەمان نییە ئەگەر لێرە وەمێنی.

گوتم سـەرەڕای ئەوەی هەسـتم کردووە ماوەیەکە زۆر چاکە و پیاوەتم لەگەڵ دەکرێ و گەلێ ئاسانکاریم بۆ کراوە، بەڵام مـانەوەی من لێرە هیچ سـوودێکی نییە. هەرچەندە دەزانم بچمەوە ئێران، زیندان و چارەڕەشـی چاوەڕێمە، هەر بۆیە ماوەیەکە بیر لەوە دەکەمەوە بچمە وڵاتێکی دیکە. گوتی بۆ نموونە کوێ؟ گوتم فەڕەنسـا. گوتی تۆ هـاووڵاتیی فەرەنسـا نی. گوتم بۆ ئەوەی ببمە هاووڵاتیی ئەوێ، لەگەڵ خانمێکی فەرەنسی کە لێرەیە، بوومەتە دۆست و قەول وایە پێکەوە زەماوەند بکەین، ئەودەم کێشە نابێ بچمە فەرەنسا.

گوتی، ئەی بـاشـە ئەگەر خـانمەکە بۆخۆی نەچۆوە فەرەنسـا؟ گوتم ئەودەم منیش لەگەڵی دەمێنمەوە. نـاوی

خانمەکەی لێ پرسـیم. گوتم جەناب سـەروان، ئەگەر بەڕاستی دەتانەوێ چاکەیەکم لەگەڵ بکەن و حەوت ساڵ بەبێتاوان زیندانیکران و دەسبەسەریم قەرەبوو بکەنەوە، ئەو چاکەیەم دەرهەق بکەن. بەوپەڕی میهرەبانییەوە قبووڵی کرد و گوتی تا حەفتەیەکی دی ئاکامەکەتان پێ دەڵێمەوە. لە ژوورەکەی چوومە دەرێ و دەمودەست ماریم ئاگادار کردەوە. هەر ئەو ڕۆژە ئەویشیان بانگ کرد و ئەویش قسەکانمی پژڕاست کردبۆوە.

مخابن پاش حەفتەیەک سـەروان ئاگاداری کردمەوە کە ڕازی نەبوون من بچمە فەرەنسا. گوتم کەوابوو چارم نییە دەبێ بگەڕێمەوە ئێران. گوتی کەوابوو خۆت ئامادە بکە سبەی وەڕێ دەکەوی.

چوومە لای ماری خانم و مەسـەلەکەم بۆ گێڕاوە. زۆری پێناخۆش بوو. گوتی دەی چی دەکەی؟ گوتم دەچمەوە ئێران. ماڵوایيم لێ کرد و توند دەستیم گوشی و سـپاسـم کرد کە بۆ جێبەجێبوونی ئەو نەخشـەیەی بەئاکام نەگەیشتبوو هاوکاریی کردبووم.

دوانیوەڕۆ دەفتەر و حیسـابی چێشـتخانەم ڕادەسـتی سەرۆکی وێستگەکە کرد. لەگەڵ هاوسەفەرەکانم وا دانرا شـەوێ لە دەوری یەک کۆ بینەوە. کەسـێکمان بەناوی عەلی ئـازەری لەگەڵ بوون یەکی کورتەبنەی تەورێزی بوو. دەیگوت هەر بگەڕێمەوە ئێران حیزبێک دروسـت دەکەم. گوتم عەلی ئاغا، تخوا واز لەو قسـانە بێنە، کە گەڕاینەوە ئێرانێ و ئازاد بووین، چیت پێ خۆشـە بیکە.

تکایە با ئاوێکمان بە ئاسوودەیی لە گەرووی بچێتە خوار.

ئەو شـــەوە غەریب و ئیمـام قولی و نەورۆز و چەند هاورێیەکی دی چووبوونە شـــاری. چەندی چاوەڕێ بووین هەر نەهـاتنەوە. گۆیا دەچنە ڕســـتوڕانتێـک و تـا زگیـان هەڵدەگرێ مەشـــرووب دەخۆنەوە. بە ســـەرخۆشـــی لەگەڵ کۆمەڵێک لاوی شـارەکە تووشـی شـەڕ و چەقۆکێشـی دەبن. غەریب و چەند گەنجێکی شـــاری زۆر پیس بریندار دەبن و هەموان دەبەنە خەســـتەخانە. دڵنیا بووین تووشـــی دادگا دەبن. بەو جۆرە غەریب و هاورێکانی لەو سۆنگەیەوە بەجێ مان. جا نازانم ئەو سیناریۆی شەڕ و لێکدانە ئانقەست بوو یـان بە ڕێکەوت؟ هەرچۆنێـک بێ، ئیـدی چـاومـان پێیـان نەکەوتەوە.

## له مۆسکۆ

بەیانییەکەی پاش بەرچایی خۆمان بۆ ڕۆیشتنێ ئامادە کرد. جلوبەرگی زیندانم ڕادەســــت کردەوە و چاکەت و پانتۆڵەکەی خۆمم لەبەر کرد. بەڵام بەو جلوبەرگە کۆن و شڕ و گنجاوییەوە لەنێو ئەوانی دیکەدا دەتگوت بازرگانی مایەپووچم. جلوبەرگی ئەوانی دیکە هەر زۆر زۆر شـــڕ بوون. بە جلوبەرگی زیندانییەوە هەر شـــتێک بێ، هەموو زیندانی بوون، بەڵام ئێســـتا زیاتر لە کۆمەڵێک مرۆڤی هەژاری نەدار دەچوون. لەســـەر یەک ١٦ کەس بووین. ٥ کورد و هەرمەنییەک و تورکمـانێک، ئەوانی دی هەموو ئـازەربـایجـانی بوون. بۆ یەکەمجـار بەبێ ســـەربـاز و چـاودێری چەکـدار لە وێســـتگەکە چووینە دەرێ. ســـەرپەرشـــتێکمان لەگەڵ بوو. من لە ژیانمدا دەســـتەی ئەوەندە نارێکوپێکم نەدیتبوو. تاقە خاڵی هاوبەشـــمان ئەوە بوو کە پێکەوە لە زیندانی ســـۆڤیەت ئازاد ببووین. چەند کەســـێکمان لەگەڵ بوون کە مایەی شـــەرمەزاری بوون. شێوەی بیرکردنەوە و هەڵسوکەوت و قسەکردنیان ئەوپەڕی بێئەدەبی و بێ فەرهەنگی بوو. ســـەرەڕای ئەوەی ئیدی ئەوە ئازاد بووم و خەریکم بەرەو ئازادی دەڕۆم، بەڵام دڵم هەر توند بوو. ڕێک وەکوو ئاســـمانە پـاییزییەکەی ئەوێ، کە پڕ بوو لە هەوری تـاڵ و ڕەش. چەندە بە ئاواتەوە بووم لەو هەشـــت ســـاڵەدا زوو ئازاد بم، کەچی ئێستا کە ئاواتەکەم وەدی هاتبوو، خەم لەدڵمدا

کەڵەکە ببوو. ئەو شیعرەی یەغمای جوندوقیم بیر کەوتەوە:

یەغما من و بەخت و شادی پێکەوە / سەفەرێکمان کرد لە دنیای نەبوونەوە / وەک ناشارەزایان لە نیوەی ڕێیە بەختم خەوت / شادی ملی ڕێی گرت و من و خەم ماینەوە.

بۆ هیوای گەیشتن بە بەختەوەری سەفەرم کردبوو، کەچی نەک بەدەستم نەهێنابوو، بگرە چیی خۆشیی هەشمبوو، لە دەستم دابوو. ئێستا بە دەردی یەغما خۆم و خەم مابووینەوە.

سەرەڕای ئەوەی مەودای نێوان ڤیلادیمیر و مۆسکۆ زۆر نەبوو، بەڵام هەر چووینکە وێستگەی شەمەندەفەر و لەوێوە بەرەو مۆسکۆ وەڕێ کەوتین. بەرەبەری ئێوارێ بوو کە گەیشتینە مۆسکۆ. چرای نیۆن و ڕەنگاوڕەنگی شەقامەکانی شار دیمەنێکی سەرنجڕاکێشیان هەبوو.

لەبەر ئەوەی پێشتر بیرمان لە شوێنی خەوتن نەکردبۆوە و لەو دەمودەستەشدا دابینکردنی شوێن کارێکی ئاسان نەبوو، وامان دانا شەوەکەی لە نێو شەمەندەفەردا بخەوین. ڕێنوێنەکە گوتی بەڵام نانەکەمان لە دەرەوە دەخۆین، ئەوەندەیە دوور مەکەونەوە. خۆ گوتم چەند کەسێکمان لەگەڵ بوو، هەڵسوکەوتیان حەیابەرانە بوو. یەکێکیان هاواری دەکرد، کێ خۆی بەپیاو دەزانێ بێتە پێش. هەڵبەت کەس نەیدەزانی دەڵێ چی، بەڵام هەموان بە سەرسوورمانەوە سەیریان دەکرد. هەرچی تێی ڕاخوڕین، بێسوود بوو. لە ڕستوڕانتی وێستگەی شەمەندەفەر نانمان

خوارد و ورده ورده بەرەو شـــەمەندەفەرەکە گەڕاینەوە، بچین بخەوین. سەرپەرشتەکەمان گوتی دەبێ بەیانی زوو وەخەبەر بێن، چونکە دەمانەوێ ســــەرێکی فرۆشـــگا گەورەکەی مۆسکۆ بدەین.

بەیانی زوو هەســـــتیان و لەگەڵی چووینە فرۆشـــگا گەورەکە. هێشتا نەببووە سەعات هەشتی بەیانی، لەپێش مارکێتە مەزنەکەی مۆســـکۆ، نزیک گۆڕەپانی ســـوور، کۆمەڵێکی بێهەژمار ژن و پیاو ڕیزیان بەســـتبوو. ئێمەش لەوسەری ڕیزەکەوە ڕاوەستاین. هەر سەعاتە گەورەکەی گۆڕەپانی سووری مۆسکۆ زەنگی سەعات هەشتی لێ دا، دەرگای ســۆپەرمارکێک کرایەوە و خەڵکەکە هرووژمیان کرد. ئەو حەشـامەتە زۆر لە چەند خولەلێکدا بەو مارکێتە وەربـــوون. لە نـــهـــۆمـــی عەرزی، نـــزیـــک دەرگـــای وەژوورکەوتنەکە تابلۆیەکی گەورە هەڵواسرابوو، کە لێی نووســـرابوو هەر نهۆمە و چ کەلوپەلێکی لێیە. ئێمە لەبەر ئەوەی بەتەمای کڕینی شـــتێکی دیاریکراو نەبووین، بە ئاســـانســـوار چووینە نهۆمی هەشـــت و لەوێ کەوتینە ســـەیرکردنی کەلوپەل و ئەو شـتومەکانەی ڕیز کرابوون و نهۆم نهۆم داگەڕاین. من بەو پـارە کەمەی پێم بوو، کامێرایەکی هەرزانباییم کڕی. بەرەبەری نیوەڕۆیە هاتینە دەرێ و چووینە مەیدانی سوور.

جەســـتەی مۆمیاکراوی لێنین لە شـــوێنێکی تایبەت دانرابوو. بەڵام بۆ ئەوەی لێی بچیتە پێشـــێ، دەبوو ئیزن وەرگری و بە دابودەســـتوورێکی تایبەت بچی، کە ئێمە

ئەوانەمان نەبوو. زۆرم حەز لێ بوو بچمە زانکۆی لۆمۆمبا، بەڵام سەرپەرشتەکە گوتی بۆ ئەوە دەبێ چەند ڕۆژێک لە مۆسکۆ بمێنینەوە. نانی نیوەڕۆشمان لە ڕستورانتێکی بچووک خوارد. پاش نانی نیوەڕۆ بۆ دیتنی میترۆ، بە پلیکاندا چووینە ژێرزەمینەکەی. بە ڕاستی میترۆی مۆسکۆ هەر دەبوو بێیە سەیری. دەوروبەری پلیکانە کارەباییەکان و بە درێژایی ڕەوگەی شەمەندەفەرە کارەباییەکان، دیوارەکان وێنەی مەزنانی سۆڤیەت و دیمەنی زۆر جوانیان لێ هەڵکۆڵرابوو. کە بە پلیکانە کارەباییەکاندا هاتینەوە سەرێ،، کۆمەڵێک ئەفغانیم دی، بە سەرومەندیلەوە لەبری ئەوەی لەسەر پلیکانەکە بە پێوە بوەستن، دانیشتبوون.

تا سەعات هەشتی شەوێ بەشارەکەدا گەڕاین. سواری تراموای کارەبایی بووین و چەند وێستگەیەکیش بە پاسی کارەبایی ڕۆیشتین. لە ڕۆژنامەفرۆشییەک، چەند ڕۆژنامەیەکی پراڤدا و ئیزۆسیتام کڕی. حەیف و مخابن دەرفەتی زیاترمان نەبوو. لە ڕستورانتی وێستگەی شەمەندەفەر نانی ئێوارەمان خوارد و سەعات ٩ی شەوێ، شەمەندەفەرەکە لە مۆسکۆ وەڕێ کەوت. چراکانی ئەو شارە مێژووییە و پێتەختی سۆڤیەت لە دوورەوە وەکوو ئەستێرە پڕشنگیان داویشت و چاویان دادەگرت تا ئیدی لە چاوان ون بوون. هاوڕێ بێ ئۆقرە و بە دەنگ و دۆڵەکان، سەریان بە مەی قورس ببوو و خەویان لێ کەوتبوو و من لە پەنجەرەوە سەیری دنیا تاریکەکەم دەکرد. دەرەوە وەکوو داهاتوو تاریک و نادیار بوو. دەنگی وێککەوتنی چەرخی ڤارگۆنەکان و ئاسنەڕێیەکە و گرمە و نەڕەنەڕی لۆکۆمۆتیو

لەو بیابانە بێدەنگەدا ســـات بە ســـات هەودای خەیاڵمی دەپساند. شـەمەندەفەر سات بە سات لە مۆسکۆ دوور دەکەوتەوەز وەک چۆن ساڵەکانی هاتنی من بۆ سۆڤیەت دوور کەوتبوونەوە.

ســۆڤیەت لە ڕووی پیشـەسـازی و زانسـتەوە زۆر پێشــکەوتبوو و گەشـــەی کردبوو، بەڵام ژیان زۆر دوا کەوتبوو. وەختێک میترۆ ژێرزەمینییەکەی مۆسـکۆم بەو مەزنی و شـــکۆیەوە لەگەڵ ژیانی تاڵ و پڕکوێرەوەریی خەڵکەکە بەراورد کرد، هەســـتم کرد هەمـوو ئەو پێشـکەوتنانە بایی پووشـێکن. باقوبریقی بێ ناوەرۆک چ ئاکامێکی هەیە. لێگەڕێ با باڵەخانەی کرملین خشـــتێکی زێڕ و یەکی زیو بێ، جا با میترۆ و شـەقامەکانی شـار و گۆڕەپانەکان شـــاکاری میعماری و هونەر بن، وەختێک خەڵک لەو باقوبریقەدا بۆ نـانی شـــەوێ مەحتەلن، ئەو شتانە چ سوودێکیان هەیە.

بە دەردی سەعدیی خوالێخۆشبوو:

ماڵەکە لە هیم و بناغەوە وێرانە، کەچی ئاغا مشووری نەخشونیگاری دیوەخانی دەخوا.

## گەڕانەوە

سەرەڕای ئەوەی بەتلێک لە شەو ڕاشکابوو، کەچی خەوم لێ نەدەکەوت. ساڵانی ڕابردوو، لەو کاتەوە کە ساڵی ١٣٣٤ پێم نایە بادکوبە، دە ساڵی بەسەردا تێپەڕیبوو، وەکوو پەردەی سینەما بە بەرچاومدا دەهاتنەوە و ڕادەبردن. دەمدی دە ساڵ لە باشترین ڕۆژانی لاوی و تەمەنی گەنجیەتیم لەخۆڕایی ئەویش بەدەم ئازار و دەرد و کوێرەوەرییەوە بەڕێ کردووە. مخابن بۆ ئەو تەمەنە بەنرخەی تێپەڕی. هەڵەیەک و خلیسکانێک، لاوێتیمی بردە هەڵدێری فەوتان. هەموو سەرمایەی لاویمم لەدەست دابوو و ئێستا دەبوو بە دەستی بەتاڵ و کۆڵێک بیرەوەریی تاڵەوە بگەڕێمەوە بازاڕی ژیان.

**شەهریاری شاعیر دەڵێ:**

وەشوێن ژین کەوتم و لاویم وەکوو مۆمێکی داگیرساند

ژیانم لێ بزر بوو، سەرلەبەر گەنجییەکەشم فەوتاند

ئیتر چاوم بڕیبووە تاریکاییەکە و سەردەمی مەینەت و خەم و بەفیڕۆچوونی لاویمم وەبیرخۆم دێناوە. لەوەدا بەو ئاکامە گەیشتم، کە خەفەتی ڕابردوو بێسوودە. ڕابردوو تێپەڕیوە و نایەتەوە. ئەوەندەی لە گەنجیەتیم ماوە، بەسمە و دەبێ قەدری بزانم. ئینجا ڕاهاتن لەگەڵ چەوتی و چەتوونیی ڕۆژگاردا، هەر نەبێ ئەوەندە سوودەی هەیە کە ژیان پاشی ئەوە ئاسان و سادە دێتە پێش چاو. دەبێ بە

کەمترین شـــتەکان قایل بی. ئەوجار تاڵی و ســـوێریی ڕۆژگارم چێشتووە و لە با و باهۆزان بێباکم.

تاقە لایەنێکی باشـــی ئەو قۆناغە مەینەتبارە هەیبوو، هەر ئەوە بـوو و دەرفەتـی ئەوەی دەدامـێ بەهەمـوو هێزەوە بەرەو پێشـــەوە بچم و لەهیچ کەند و کۆســـپێک نەپرینگێمەوە. بەو خەیـاڵ و فکرانەوە بەرەبەری بەیـانی خەوم لێ کەوت، وەختێک لەخەو هەستام، ئاغای ئاسەف لەلام بوو. گوتی بـاش خەوتی. گوتم خەوی چی تـا بەرەبەری بەیـانی نەخەوتووم. تـاوێـک دەبێ خەوم لێ کەوتووە. یادی ڕۆژانی ڕابردوو دەرفەتی خەوتنی نەدەدا. گوتی منیش چیی بیر دەکەمەوە نازانم دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆچی ئاوای لێ کردم. خۆ ئێمە هیچمان نەکردبوو. گوتم ســـیاســـەت لەم وڵاتەدا بەدەســـت کۆمەڵێک کەســـی دەمـارگرژی کورتبینەوەیە، ئەوانە ســـەریـان لە قـاوغی خۆیـان نـاوە و هەموو شـــتێک لە ڕوانگەی خۆیـانەوە دەبینن. لە حاڵێکدا ئەمڕۆ هەموو پرسـێک بووەتە شـتێکی جیهانی و دەبێ بە ڕوانگەیەکی ئاوەڵاوە شتەکان تاوتوێ بکەی. ئەوانە هەر شـتێک بن، سـیاسـەتمەدار نین و هەر فریان بەســـەر ســـیاســـەتەوە نییە. مەگەر نەتبیســـتووە، چییان بەســـەر مەلا مســـتەفا بارزانی و خەباتگێڕ و هۆزەکەی هێنا؟

هەموویانیان دوور خســـتنەوە و ناچاریان کردوون بەکاری زۆرەملێ. مەگەر مەلا مســـتەفا چیی کردبوو؟ ســـەید عەبدولعەزیزی گەیلانیزادەیان چۆن ناردووەتە

ئۆردووگاکانی بێگاری لە ئۆزبەکستان؟ یەکێک دەیگوت زۆر نەخۆشــە و بەحاســتەم ماوە. لە بادکوبە ئێســتا کۆمەڵێک فیرقەیی و بە ڕواڵەت کۆمۆنیســـت کۆ بوونەتەوە و بزانن هەر کەسێک تۆزێک دژیانە، شوێنبزری دەکەن یان کۆمەڵێک مۆرکی لێ دەدەن. ئەگەر ئەو دەوڵەتە هەر تۆزێک سیاسەتی هەبوایە، کاری ئاوای دەکرد؟ لەبری ئەوەی بەباشــی لەگەڵ ئەو برادەرانە هەڵسوکەوت بکەن و پەروەردەیان بکەن و بۆ ڕۆژی خۆی ئامادەیان بکەن، بەو هەڵســـوکەوتە چەوتانە هەمووان بێزار دەکەن. یەکێکیان بۆخۆم، ســـەرەڕای ئەوەی هیچ دژی بنەمــاکــانی کۆمۆنیزم نیم و لەوانەیە لە زۆر لایەنەوە بەدڵیشـــم بێ، بەڵام تا هەم بەحاســـتەمێکیش چییە ئاوڕی لێ نادەمەوەز ئینجا مەگەر بۆخۆت نەتدی، هەموو شـــتێـک هەر ڕواڵەتی بوو؟ بەرنـامەی ئـاوەدانی دەبوو بەخێرایی تەواو بکرێن، بەڵام هەموو پووچ و نــاوبۆش. وەختێک ئێمە بەو زســـتانە بناغەی دیواری بیناکانمان بە چیمەنتۆ دادەڕشـــت، چیمەنتۆ هەموو بەســـتبووی. دەی خۆ دیــارە دیواری ســـــەر ئەو بنــاغەیە چۆن دەردەچێ و چ کارەســـاتێکی بەدواوەیە. گرینگ ئەوە بوو شـــتەکان لەکاتی دیاریکراودا تەواو بن. بەڵێ چەندی بڵێی قوتابخانە و زانکۆ هەبوو و بە لێشـــــاو دەرچوویـان دەردەچواند. بەڵام تـاقە شــتێکی هەر نەبوو، تێگەیشــتن و شــعووری کۆمەڵایەتی و ســـیاســـی بوو. بناغەکانی دەوڵەتداری، وەختێک لەســـەر بنەمــای زەبروزەنــگ و ترس و پیــاوکوژی و ئــازار و ئەشـــکەنجەی مرۆڤەکـان دامەزرێ، بڵێی و نەڵێی ڕۆژێک

دادەکشـــێ و دادەڕووخێ. بەو باس و قســـانە خەریک بووین مەودای نێوان مۆسکۆ و عیشقابادمان دەبڕی.

نەمـانـدەزانی بۆچی بەو ڕێگە دوورەدا دەمـانـنێرنەوە ئێران. لە حـاڵێکدا ڕێگەی بـادکوبە بۆ ئێران زۆر نزیکتر بوو. شـــەمەندەفەر وەکوو دێوەزمەیەک بە گرم و هۆڕ ڕێی نێوان دەریـای خەزەر و زنجیرە چیـای ئۆراڵی دەبڕی. هەڵبەت من خۆم زۆر دڵخۆش بووم کە بەو ڕێیەدا ڕادەستی ئێرانمان دەکەنەوە نەک بە ئازەربایجاندا. چونکە ســـەرەڕای نەفرەتێکی لە فیرقەییەکـانی ئەو مەڵبەندەم هەبوو، باوەڕم وابوو فارســـەکان زیانیان بۆ ئـێـمەی کـورد کەمـتـرە و بـێـزەڕتـرن لەچـاو ئـازەربـایجـانییەکـان. هەڵبەت هۆیەکەشـــی ئەوەیە کە ژینگەی کۆمەڵایەتیی فــارس لە ئێمە دوورە و کەمتر تێکهەڵچوون و بەرەوڕووبوونەوەمان کەمتر بووە. بەڵام کورد و ئــازەری هــاوکەوشـــەنن و لە هەمـوو ئەو بزووتنەوانەدا کە لە ناوچەکەی ئێمە جا چاک یان خراپ ســـەریان هەڵداوە، لە ســـۆنگەی دنەدانی حوکمەتەوە تووشـــی پێکدادان و شـــەڕ بووین و یەکەم زەبرێکی لە ئێمە درابێ، ئەوان لێیـان وەشـــانـدووین و دایمەش حکوومەتەکـانی نـاوەند ئەو کێشـــە و نـاکۆکییـانەیـان دروســـت کردووە و دوژمنایەتییان خســـتووەتە نێوان ئێمەوە.

هـاوڕێی ئـازیز، ئێمە کە هەموو کەمـایەســـییەکـانی ســـۆڤیەتمـان لەقـاو دا، بێ ئینســـافییە ئەگەر لایەنە

باشەکەشی نەڵێین. با سەیرێکی ئەو تورکمەنستانە یان کۆمارییەکانی دراوسێی بکەین. لانیکەم سەدا نەوەدی خەڵکەکەی خوێندەوارن. هەبوونی ئەو هەمووە قوتابخانە و کارخانە و لاقی ئاسنەڕێ و پێشکەوتنی زانست و پیشەسازییە خۆ گاڵتە نییە و ناکرێ نەیانبینی. هەر ئەو قەزاقستانەی ئێستا لەگەڵ چەند ساڵ لەوەپێشی بەراورد دەکەم. لەوە باشتر، ئێمە زۆرمان نەماوە بگەینە تورکمەنستانی ئێران، جا لەگەڵ تورکمەنستانی سۆڤیەت بەراوردی دەکەین و ژیانی دواکەوتوو و کشتوکاڵی نەریتیی و دێمەکارانەی سەد ساڵ پێشوو دەبینین. لە گوندەکانیان، نە ئاوی خواردنەوە هەیە و نە کارەبا و نە جادە و قوتابخانە و نە ناوەندی تەندروستی. ئێستاش ئەگەر زستانان بەفر دەباری، ڕێی نێوان گوندەکان و شاری دەگیرێ و پەیوەندییەکان دەپسێن. بنکەی تەندروستی و دکتۆر و دەرمان لە گوندەکان هەر نییە. جا نەخۆشیی جۆراوجۆری وەکوو کوێری و کەچەڵی و خروێلکە ئێستاش بەشێکن لە شتە سروشتی و باوەکانی ئەو ناوچانە، سەرەڕای ئەوەی لەسەر دەریای نەوت دانیشتووین، لە گوندەکان نا، بگرە لە شارەکانیش زستانان، لەبری نەوت خەڵووز و ئاوردوو دەسووتێنن.

بەو قسانە کاتمان تێپەڕاند و گەیشتینە وێستگەی عیشقابادی پایتەختی تورکمەنستان. شەمەندەفەرەکە لە وێستگەی عیشقاباد ڕای گرت.

لەگەڵ ڕێنوێنەکەمان دابەزین. بردینی بۆ هۆڵی چاوەڕوانی. بۆخۆی چووە دەرێ و گوتی دێمەوە. سەعاتێک

دواتر هـاتەوە و گوتی وەرنە دەرێ. کە چووینە دەرێ، ماشینێکی سەربازی لە دەرەوە ئامادە بوو بە دوو سەربازی چەکدارەوە. بە لای شـــاری عیشـــقاباددا بەرەو بنکەی ســـنووریی ئێران کە لەســـەر بەرزاییەک بوو، وەڕێ کەوتین.

# ئێران

مەودای نێوان شـــار تا پاســـەوانگەکانی ســـنوور، زۆر نەبوو. لەوێش دابودەســتوور و ڕێوشـوێنی مەئموورەکانی ســنووری ئێران زۆری نەخایاند. هێشـتا نیوەڕۆ دانەهاتبوو، کە ئێمە لە نێو خـاکی ئێرانێ بووین. چەنـد کەســـێـک لە کوڕەکان وەگریان کەوتبوون. خۆڵ و خاکی ســنوورەکەیان لە ســەر و ڕووی خۆیان دەخشـاند و ماچیان دەکرد. ئەوێ پاسەوانگەی باجگیران بوو. سەربازی چەکدار ئێمەیان بردە ژوورێک. ســـەرەڕای ئەوەی مەئموورەکان زۆر لەگەڵ ئێمە باش بوون، هەســـــت دەکرا هەر لە ســـــەرەتاوە خەریکن دەسبەسەرمان دەکەن. شەو و ڕۆژێک لە باجگیران بووین. پشـکنینی پزیشـکی و ڕێوڕەسـمی قەرەنتینە ئەو ڕێوشـوێنانە بەتەواوی لەگەڵمان کران. زۆربەی هاوسـەفەرەکان تووشـی نـاڕەحەتی دڵ و دەمـار ببوون. پـاش ئەوە ئێمەیـان بەڕێی مەشـــهەد کرد، ســـەرەڕای دنیایەک تکا و ڕجا نەیاهێشـــت زیارەتی ئیمام ڕەزا بکەین و بە شـــەمەندەفەری مەشـــهەد تاران بەرەو پایتەختیان بەڕێ نەکرد. مانگی ڕەزبەر بوو و هێشـــتا ســـاردی نەکردبوو. ئەوە دووەم جار بوو کە ئەو ڕێیەم بە شـــەمەندەفەر دەبڕی. ئەو گەنجەی لە ڕێیە و لە سـۆڤیەت هەر دەینەڕاند و دەیگوت پیاوم دەوێ، لێرە فزەی لێ بڕابوو. ئیتر لە وێستگەی شەمەندەفەری تاران دابەزیین، پاش تاوێک چاوەڕوانی ســواری ماشــێنێکی ســـەربازییان کردین. ماشـــێنەکان بە شـــەقامی ئەمیرییەدا بەرەو باکوور دەچوون.

له شاری چووینه دەرێ، ڕێیەکە ڕێک بەرەو تەجریش بوو. بەڵام پێش ئەوەی بگەینە ئەوێ، ماشـێنەکان چوونە نێو کووچەباخێک و لە نزیک شوێنێکی تەلبەندکراو ڕایان گرت. چەنـد خێوەتێکی لە نێودا دیـار بوو. کۆمەڵێـک سـەربـازی چەکداریش لەوێ ئێشـکیـان دەکێشـا. سـەرگرووبانێک هاتە پێشـێ و بەسـەری کردینەوە. بردیانینە نێو تەلبەندەکە و گوتی بچینە نێو خێوەتەکان. دڵنیا بووین ئێرە شـوێنی دەسـبەسـەرکرانمانە. ئێمە پێنج کوردەکە خێوەتێکمـان پێکەوە گرتەوە. ئەوانی دیکەش چوونە نێو خێوەتەکانی دی. هەرچۆنێک بێ ئێرە ئیدی ئۆردووگـای بێگـاری و زۆرەملی نەبوو و لەو بـاخە خۆشـەدا هەسـتمان بە ئارامی دەکرد و بە گشـتی هیچ نیگەران نەبووین و دڵەڕاوکێمـان نەبوو. سـەربـازە چەکدارەکان لە دەوروبەر ئێشکیان دەگرت. دوو هۆدەش لە دەرەوەی تەلبەندەکە بۆ ئەوان تەرخان کرابوو.

بەرەبەری نیوەڕۆیە یەکی کەوچـک و چەنگـاڵێکیـان داینێ. لە نێو خێوەتەکـان چەند بەتـانییەک لەبری فەڕش ڕاخرابوون و چەنـد بەتـانییەکی دیکەش هەبوون بۆ پێخەف. بەرەبەری نیوەڕۆیە ڕیزیان کردین و لە مەنجەڵە پلاوێک کە بۆ سـەربازەکانیان هێنابوو، قاپێکیان پڕ لە پلاو و خۆرشت و لەتێک نانی سەنگەکە داینێ. سـالانێک بـوو پـلاوم نەخـواردبـوو. سـەرەڕای ئەوەی پـلاوی سەربازخانە بوو، بەڵام تام و بۆنەکەی زۆر خۆش بوو.

لەو ڕۆژەوە ئیدی خواردنەکەمان خواردنی سەربازی بوو. نازانم لەو نزیکانەوە پادگانی لێ بوو یان نا، هەرچۆنێک بێ لە سەربازخانەیەکەوە نانیان بۆ دێناین. بە دەم قسەکردنەوەوە لێم ڕوون بۆوە ئەوێ باخی میهرانە. پێشتر تایبەتی ئالوودەبوانی موخەدەرات بوو. هەر بۆیە لەپێشدا پێیان وابوو ئێمەش موعتادین. حەفتەیەکی خایاند. کاری ئێمە پاش پاکوخاوێنی، پیاسەکردن بوو.

سەرەڕای ئەوەی شوێنەکەمان هیچ لە زیندان نەدەچوو، بەڵام لە ژێر چاودێریی توندوتۆڵی سەربازەکاندا بووین. یەکێک لە سەرگرووبانەکان پیاوێکی زۆر تووڕە و تۆسن و ڕژد بوو. هەر جارێکی نۆرەی پاسەوانیی ئەو دەهات، کەس فزەی لێوە نەدەهات. ڕۆژێکیان لە حەوشەکەدا پیاسەمان دەکرد، گرووبانی گۆرین بە تووڕەییەوە هاتە ژووریّ و ڕووی لە یەکێک لە گەنجەکان کرد و گوتی، ئەوە تۆ بووی گوتت دەبێ مان بگرین؟ تۆ بەتەمای بیکەیە توودەبازی؟ چیی گەنجەکە سوێندی خوارد کە شتی وام نەگوتووە، بەگوێیدا نەچوو. بە دوو سەربازی گوت، ئەو پەیژە بچووکەی لە دەرەوە بوو، بهێننە ژووریّ. گەنجە ئازەرییە داماوەیان لێ بەست. گرووبان بە قایشەکەی هەتا هێزی تێدا بوو هەر لێی دا. گەنجی داماو هاواری دەچووە ئاسمان و دەپاڕاوە، کەچی ئەو وەکوو گورگێکی دڕندە تێی بەربوو. کە شەکەت بوو، وازی هێنا و گوتی جارێکی دیکە گوو دەخۆی قسەی وا دەکەی. سەربازەکان، گەنجەکەیان لە پەیژەکە کردەوە. ئەوانی دی لەباوەشیان کرد و بردیانەوە نێو خێوەتەکە. هەموو سەرمان سووڕ مابوو. وای دانی

گەنجەکە باسی مانگرتنیشی کردبێ، کێ دەڵێ مەبەستی ئەوە بووە لەوێ مان بگرین؟ جگە لەوەش، ئەو گرووبانە بەرپرسی ئێمەیە بمانپارێزێ یان دادوەر و سزادەری ئێمەیە؟ هەستم کرد لەخۆوە وا ناکا. بێ و نەبێ هێندێ شتی لە بەرپرسەکان بیستووە، ئەگینا لەخۆوە چۆن ئاوا دەکا.

گەنجەکە سێ ڕۆژان بەجێوبان کەوت و نەیتوانی لە خێوەتەکە بێتە دەرێ.

چەند ڕۆژ دواتر کۆمەڵێک کەسی دیکەشیان هێنا. دەرەبەگێکی کوردی لای ماکۆیان لە نێو دابوو. دەیگوت گوندەکەمان لەسەر سنووری سۆڤیەتە. بە تۆمەتی پێوەندی لەگەڵ خەڵکی ئەوبەری گرتوویانم، هیچ واش نییە. بەڵام بە ددانی زێڕ و جلوبەرگە ڕێکوپێکەکانی لە نێوماندا دەتگوت لۆردە. دەیگوت پارەیەکی زۆرم پێ بووە، بەڵام هەموویان لێ ئەستاندووم. قەول وایە حەفتەی دە تمەنم بدەنێ بۆ جگەرە.

لەوانەی لە سۆڤیەت هاتبوونەوە، گەنجێکی خەڵکی ڕەشتمان لەگەڵ بوو. من لە هاتنەوەدا لەگەڵی ئاشنا بووم. شۆرەتی حەقیقی بوو و پێشتر لە ئێران خوێندکاری کۆلێژی ماف ببوو. ئەویش لە سۆڤیەت سەرەڕای ئەوەی ئەندامی حیزبی توودەی ئێران ببوو، دە ساڵ بێکاریی بۆ بڕابۆوە. بەڵام ئەو زۆر نیگەران بوو. زیاتر لەگەڵ من قسەی دەکرد و دەیپرسی چیمان لێ دەکەن؟ پێم دەگوت ماوەیەک ڕامانده‌گرن و هێندێ

پرسـیار و لێکۆڵینەوەمان لێ دەکەن و ئەگەر هیچ شـتێکی خراپمـان نەکردبێ، بە دڵنیـاییەوە بەرمـان دەدەن. دەیگوت ئـاخر من توودەیی بووم. گوتم دەی خۆ لە ئێران زۆر کەس توودەیی بوون، گرینگ ئەوەیە هیچ تاوانێکت لەسـەر نەبێ. حیزبی توودە ئێسـتاش ماوە و بە نایاسـایی لەقەڵەم نەدراوە.

ڕۆژێک نازانم بۆچی هەموومانیان لەپێش خێوەتان ڕیز کرد و سەرگرووبانە تووڕە و تۆسنەکە سەربازێکی هێنا و گوتی کام لەوانە نامەی دایە دەستت؟ سـەربازەکە دیار بوو شـەرم دەکا و نازانێ بڵێ چی؟ دڕدۆنگ بوو ناوی کێ بڵێ. سـەرگرووبـان تێی خوڕی و گوتی بیڵێ، ئەگەر نەیڵێی بۆخۆت دەزانی چیت بەسەر دێنم. سەربازەکە هاتە پێشێ و ئامـاژەی بە ئـاغـای حەقیقی کرد. گرووبـانە، حەقیقیی بردە دەرێ. ئەمری کرد پەیژەی گۆرینیان هێنا و لێیان شـەتەک دا. چاوم لێک نا، تین و ورەی ئەوەم تێدا نەبوو خوێندکارێکی مـاف لەو دۆخەدا ببینم. هیچیشـم لەدەسـت نەدەهـات. گرووبان بەهەموو هێزی خۆی ئەو قایشەی لە شان و پیلی کوڕە ڕادەکێشـا. یەک بەخۆی دەیناڵاند و هاواری دەکرد. گۆیان ئاغای حەقیقی بە دزییەوە نامەیەکی داوە بە سەربازە گەنجەکە، کە ئەویش ڕەشتی بووە، بیداتە براکەی. دەیویست بەو جۆرە براکەی ئـاگـادار بکـاتەوە کە هـاتۆتەوە ئێران. نەمـدەزانی ئەو کـارە کوێی تـاوانە. ئێسـتـا لەبری ئەوەی بۆخۆیـان ڕێیەکمـان بۆ بـدۆزنەوە پەیوەنـدی بە خزم و کەسـمـانەوە بگرین، بەوەنـدەیەش ڕازی نەبوو. ئـاغـای حەقیقیمان پاش لێدانەکەی بردەوە خێوەت. دیار بوو حەقیقی

بەر لەوەی بڕوا بۆ سـوڤیەت، کارێکی وای کردبوو، کە ئێستا تۆقیبوو لێی ئاشکرا بێ.

پاش چەند ڕۆژان دوو ئەفسەر لە ناوەندی فەرماندەیی ئەرتەشەوە هاتن و لە دەسبەسەرکراوەکانیان کۆڵییەوە. لێکۆڵینەوەکە دوو حەفتەی خایاند و لەو ماوەیەدا هێندێ ڕۆژ ئەفسـەری ئەمریکاییشـمان دەدیتن کە لەگەڵ ئەفسەرە ئێرانییەکان لە لێپرسینەوەکەدا بەشدار دەبن.

پاش تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکان، چەند ڕۆژ جارێک کۆمەڵێک کەسـیان بەر دەدا. ئیدی دادگایی و شـتی وا لەگۆڕێ نەبوو. لێکۆڵینەوەی ئاغای حەقیقی لە هەموان پتری خایاند. هەر جارێکی لە لێپرسـینەوە دەهاتەوە پتر پەرۆش و ینگەران دیار بوو. ئاخری خۆی پێ نەگیرا و ڕۆژێکیان گوتی لەوانەیە من دادگایی بکرێم. گوتم بۆچی؟ گوتی دەڵێن لە تیرۆر شـادا بەشدار بووم. ئەو تیرۆرەی کە خوێندکارەکان قۆڵیان لێ هەڵماڵی.

چوار کوردەکەی گەڵ منیان چەند ڕۆژ دواتر بەر دا. ئاسـەف و ئێکیت و گوێزەل و عەزیز. ماڵاواییمان لێک کرد. ئاغای گوڵمحەمەدیی خەڵکی گونبەدیش قەول وابوو زوو بەر بدرێ. زۆر بەداخ بوو کە هیچی بە دیاری بۆ خـانمەکەی پێ نییە. من سـنـدووقێکی کەلوپەلی خۆجوانکردنی دەسکاری زیندانییەکانم پێ بوو. ئەوەم پێ دا. بە خۆڕایی لێی وەرنەدەگرتم. دەیگوت دەزانم پـاش ئەوەی ئازاد دەبی پێویسـتت بە پارە دەبێ. ئاخری پاش چەلەحانێیەکی زۆر وامان دانا پاش ئەوەی ئازاد بووم،

پارەیەکم بداتێ. جا سێ ڕۆژ پاش وی ئازاد کرام. گوتی باوکم لە شەقامی چرا بەرقیی تاران میوانخانەی هەیە. بەڵێنی لێ وەرگرتم کە بەر بووم، سەری لێ بدەم. هێشتا دە ڕۆژی مابوو بۆ جێژنی نەورۆز. ئاغای حەقیقییان دادگایی کرد و هەشت ساڵیان زیندان بۆ بڕییەوە. زۆر بۆی بەداخ بووم. بەستەزمانە لە سۆڤیەتیش تووشی ئەو نەگبەتییە ببوو، لێرەش ئەوە چارەنووسەکەی. سەرەڕای ئەوەی بۆخۆشم هیچم نەکردبوو، نیگەران بووم.

ڕێک ڕۆژێکی مابوو بۆ جێژنی نەورۆز، بردیانمە نووسینگەی گرتووخانەکە. لەوێ بەڵێنیان پێ نووسیم، کە پاش ئازادی، مانگێ جارێک خۆم بە ڕوکنی دووی فەرماندەیی ئەرتەش کە لە شەقامی سێی ئیسفەندە، بناسێنمەوە. پێم وایە ئەو بەڵێننامەیەیان لەوانی دیکەش وەرگرتبوو. ئەوەندەم لێ ڕوون بوو کە بەڵێننامەکە شەبەقی ئازادیم بوو. سەعات ٢ی بەیانیی ڕەشەممەی ساڵی ١٣٣٤ بوو کە لە باخی میهران ئازاد بووم. بە ماشێنێکی ئەرتەش لەگەڵ چەند کەسی دیکە ئێمەیان بردە شاری. خەم و نیگەرانییەکان تەواو ڕەوینەوە.

پێم وابوو ئەگەر من هاوولاتیی سۆڤیەتی بوایەم و ئاوا لە ولاتی خۆم ڕام کردبایە و دوایی گەڕێنرابامەوە ئەوێ، لانیکەم بیستوپێنج ساڵ زیندانیم بۆ دەبڕدرایەوە. جا ئێستا دەکرێ ئەو وڵتە کۆمۆنیستی و خەڵکییە و ئەم ولاتە دژەکرێکار و بە دەردی ئەوان سەرمایەدارییە پێک بگرێ. ئەویش بەپێی ئەوەی ولاتی ئەوان سزای سێدارەی تێدا نەبوو. ئەگینا بەوپەڕی بێبەزەیی لە سێدارەیان دەداین،

ئاواش پاش هەشت ساڵ دەربەدەری و سووکایەتی و زوڵم و ناهەقی جا ئازادیان کردم.

هەر بەڕاستی ئازادی چ نیعمەتێکی گەورەیە، کە دەبێ قەدری بزانین. لە مەیدانی تۆپخانەی تاران لە ماشێنی ئەرتەش دابەزیم و ماڵاواییم لە شۆفێرەکەی کرد و سپاسم کرد. بەو هیوایەی هەرگیز شوێن و دۆخی وا نەبینمەوە. پاش هەشت ساڵ زیندان و سووکایەتی و تاڵی و سوێری و سەرما و گەرما و برسیەتی، ئێستا ئیدی لە هەموو کۆت و بەندێک ڕزگار ببووم. هەوای خۆش و بەهاریی تارانم بەوپەڕی چێژەوە هەڵدەمشت. ئەگەرچی نە ماڵ و حاڵێکم هەبوو نە حەشتەبای خودام لەگیرفانیدا بوو، کە جەمە خواردنێکی پێ بکڕم. کەچی هەموو گیانم پڕ بوو لە خۆشی و شادی.

دەتگوت تازە زیندوو بوومەتەوە. بڕوام نەدەکرد لەو دۆزەخە نەفرەتییە ڕزگارم بووبێ. دار و نەدارم جانتایەکی بچووک بوو، کە فلچەیەکی ددان و خاولی و کامێرایەکی هەرزانبایی تێدابوو، وا لە فرۆشگا مەزنەکەی مۆسکۆ کڕیبووم. لەسەرخۆ و بە هێمنی و بەبێ خەم و خەیاڵ بەرەو چرابەرقی وەڕێ کەوتم. بەتەما بووم سەرێک لە میوانخانەی گوڵمحەمەدی هەڵێنم. بەشکم بیبینم و ئەگەر بکرێ لەوێ بمێنمەوە. لەسەرەتای شەقامی چرابرقی تابلۆی میوانخانەیەکم دی. میوانخانەکە لە نهۆمی دووەم بوو. بە پلیکانەکاندا سەر کەوتم. پیرەمێردێک لە پشت مێزی میوانخانەکە دانیشتبوو

نێرگەلەی دەکێشــا. ســلاوم کرد. گوتم ئاغای گوڵمحەمەدی تەشــریفی لێرەیە؟ گوتی بۆخۆمم. فەرموو. گوتم کارم بە هـاوڕێکەم بوو کە چەنـد ڕۆژێـک لەوەپێش ئـازاد بوو. گوتی من باوکیم، جەنابت کێی؟ خۆمم پێ ناساند.

پیرەپیاو خۆشــحاڵ بوو و گوتی شــوکرانەبژێرم تۆش ئـازاد بووی. فەرموو. دانیشـــتم. پیرەمێردە تورکمـانە بە ڕیشــێکی تەنـک و بـالایەکی بەرزی چەمـاوەوە، تـا بڵێی میهرەبـان بوو. دەتگوت لە خەمی دووری و دەربەدەریی کوڕەکەی پشتی چەماوەتەوە. بانگی کرد چایەکیان بۆ هێنام. لە حـاڵێکدا مژی زۆر قووڵی لە نێرگلەکەی دەدا، ســەری قســەی لەگەڵ کردمەوە. گوتی شــوکرانەبژێرم کە خودا کوڕەکەی دامەوە. ئاخر من هەر ئەو کوڕەم هەیە. نازانی لە دووریی ئەو چۆن بووم. دوو مونـافیق هەڵیـانفریواند و لەگەڵ خۆیان بردیانە سۆڤیەت. مەگەر ئێمە لە وڵاتی خۆمان لە چیمان کەمە وا دەچنە وڵاتی بێگانان. وەباڵم بۆ قســەی ژیرانەی پیرە کێشــا. گوتم ئێتر گەنجیەتییە و کرچوکاڵی. ئێســتا کوڕەکەت ســارد و گەرمی ڕۆژگاری چێشــتووە و باشــتر دەتوانێ مل بداتە کار و ژیانی خۆی و قەدری تۆ و خانەوادەکەشـی دەزانێ. ئەو دەبێ شـوکرانەبژێر بێ کە ماڵ و ژیان و ژنی هەیە و بابێکی وەک تۆ میهرەبانیشــی هەیە. پرســیم ئەی ئێســتـا لە کوێیە؟ گوتی چووەتە گونبەد. خانمەکەی لەوێیە. تاوێک تێی ڕامام و هەســتام گوتم من هاتبووم ئەو ببینم، ئەگەر ئیزنم بدەی دەڕۆم. گوتی نامێڵم. نیو سەعاتێکی دی نان حازر دەبێ. ئەگەر حەز دەکەی بچیە دەرێ، بڕۆ، بەڵام نیو سـەعاتی دیکە وەرەوە. قبووڵم کرد و

جانتاکەمم لە نووسینگەی میوانخانە دانا و چوومە دەرێ. لەسەرخۆ و بە هێمن بە شەقامی لالەزاردا هاتمە سەر. شەقامەکە هیچ نەگۆڕابوو. بەڵام دووکانەکان خاوەنتر و لۆکستر لەجاران دەهاتنە پێش چاو. تا چوارڕێیانی لالەزار بەدەم سەیری جامخانەی دووکانانەوە ڕۆیشتم و بەرەو شەقامی سەعدی وەرسووڕامەوە و لەوێوە ڕاست بەرەو میوانخانە گەڕامەوە. چارەگێک لە دوازدە لای دابوو. پیرەپیاو چاوەڕێم بوو. نانی نیوەڕۆمان کە پڵاوێکی بە خۆرشتی قیمە بوو، خوارد. چایەکم خواردەوە و هەستام ماڵوایيم لێ کرد. دەستی لەگەڵ لێ دامەوە و هێندێ پارەی لە مستم نا و گوتی ئەوە قابیلی تۆی نییە، هاوڕێکەت ڕایسپاردووم بدەمێ، تکایە وەریگرە. دەستی ئەو پیاوە شەریفەم نەگێڕاوە. بەوپەڕی سوپاسەوە ماڵاواییم لێ کرد و بەڵێنم پێ دا دیسان بچمەوە سەردانی. لە دەرێ پارەکەم ژمارد، سەد تمەن بوو. ئەی لە خوای بەزیاد بێ. یەکەم ڕۆژی ئازادیم سەد تمەنم بە نەسیب ببوو.

بەرەو شەقامی فێردەوسی ڕۆیشتم، تا بچمە هوتێل گیلانی نوێ. بە ورەی بەرز و دڵێکی خۆشەوە چوومە هوتێلەکە. لە ڕاڕەوە پانوبەرینەکەی هوتێل، گەنجێک لە پشت مێزێکی بەرز ڕاوەستابوو. سڵاوم کرد و گوتم ژوورێکم دەوێ یەک تەختی تێدا بێ. سەیرێکی جلوبەرگە کۆن و شڕەکانم و جانتا بچووکە کرێکارییەکەمی کرد. لەپێشدا ویستی بڵێ جێمان نییە، بەڵام گوتی ئێرە

کرێیەکەی زۆرە. پرسـیم شـەوێ چەند؟ گوتی یەک تەختی، شـەوێ حەوت تمەنە. بیسـت تمەنم لەسـەر مێزەکەی دانا. گوتم ئەوە بۆ دوو شەو. گوتی ناسنامە؟ گوتم بەداخەوە پێم نییە. ناو و شۆرەت و شتی لە دەفتەری هوتێلەکەدا نووسیم و کلیلێکی دامێ ، گوتی بچۆ نهۆمی دووەم هۆدەی ژمارە ٩. بە پلیکـانـانـدا سـەر کەوتم. دەرگـای هۆدەکەم کردەوە. هۆدەیەکی بچووکی یەک تەختی و مێزێکی بچووک و کورسـییەک. جانتاکەمم لەسـەر تەختی خەوەکە دانا و بە جلەکانمەوە ڕاکشـام. نوقمی دەریای خەیاڵ بووم. ئەوە چ دنیایەکە. لە هیچ شـوێنێک بەبێ پارە ڕاتناگرن. دەبێ قەدری ئەو هەشـتا تمەنەی دیکە بگرم. کەوابوو دەبێ هەر ئەو دوو شـەوە لێرە بم. دوای ئەوە بچمە میوانخانەیەکی هەرزانبایی. بەو خەیاڵانەوە خەوم لێ کەوت.

که بەخەبەر هاتم ئێوارە بوو. لەو هەشـت سـاڵەدا قەت ئاوا ئارام نەخەوتبووم. ئەوە یەکەم خەوی ئازادیم بوو. لە هوتێلەکە هاتمە دەرێ. شەوانە، شەقامی لالەزار و سەتەنبوڵ زۆر خۆش بوو. بە چرای فلۆرسـێنتی، دیمەنێکی جوانیان دروست کردبوو. زۆرم حەز لێ بوو بچمە کافەی شـمشـاد، بەڵام گیرفانم ڕێی نەدەدام. ناچار چوومە سـاندویچییەک لە شـەقامی لالەزار. دوو تمەنم خەرج بوو. تۆزێک گەڕام و هاتمەوە هوتێلەکە.

بەر لەوەی بخەوم، بە کرێی هۆدە و سـێ جەم خواردنەوە ڕۆژێ پـازدە تمەنم پێویسـتە. بەو جۆرە ئەوەی پێمە هەر بەشـی حەفتەیەکم دەکا. کەوابوو باشـترە بچمە میوانخانەیەکی هەرزان. بەشکم ئەو پووڵە بەشی پازدە ڕۆژێکم بکا.

ئینجا کامێراکەش دەفرۆشـــم، تا ئەودەم کارێک هەر دەدۆزمەوە. شەو دووکیانە خوا بزانێ بەیانی چیی دەبێ. چوومەوە ژوورەکەم و خەوتم. یەکەم شـــەوی ئازادیم بوو.

دووەم شـــەوی جێژنی نەورۆزی ســـاڵی ١٣٣٥ی هەتاوی. بەیانی لە دەرگای ژوورەکەم درا، بەخەبەر هاتم. دەرگام کردەوە، ســەیرم کرد کاک محەمەدی شـیرازییە. لە باوەشــم گرت. زۆر خۆشـــحاڵ بووم. هیچ چاوەڕێم نەدەکرد لە ئێرانێ ببیینمەوە. ئەویش لە ڕۆژی جێژن و دوای ئـازادیـدا، پیرۆزبـایی ســـاڵی تـازەم لێ کرد. دەمودەست جلوبەرگم لەبەر کرد و دەست و دەموچاوم شوشت و چووینە ڕستوڕانتی هوتێلەکە. چەندی حەولم دا گوتی نانی بەیانیی خواردووە.

پاش بەرچاییەکی سـادە گوتی با بچینە مزڵەکەی ئەو. گوتم لە کوێیە؟ گوتی لە شـــەقامی شـــاباد، ژوورێکم بەکرێ گرتووە. جـانتـا بچووکەکەمم هەڵگرت و پـاش پاکانەحیسـاب لەگەڵ هوتێلەکە، وەدەر کەوتم. لە ڕێیە لێم پرســـی تۆ چۆنت زانی لەو هوتێلەم و ئازاد بووم؟ گوتی ڕۆژنامەکان چەند ڕۆژێک لەوەپێش باســـی ئازادبوونی چەند زیندانییەکیان کرد لەوانەی لە سـۆڤیەت گەڕاونەوە. ناوی کەسـیان نەنووسـیبوو، بەڵام من بە ڕێکەوت ناوی گوڵمحەمەدیم دیت. پێی گوتم قەول وایە ئەگەر ئازاد بی، بێیتە هوتێل گیلانی نوێ. منیش ئەمڕۆ هاتم پرســـیم و گوتیـان لێرەی. دەمزانی بـارودۆخت چۆنە، بۆیە هـاتمە

شـوێنت. خۆ هوتێل شـوێنی ژیان نییه. وەره باشـه لانیکەم من شـــوێنێکم هەیه. خەرجی ژوورەکەش زۆر نییه. ڕاوەســـتام، توند باوەشـــم پێدا کرد و ماچم کرد. چاوم پڕ ببوون له فرمێسک. گوتم محەمەد تۆ فریشـتەیەک بووی بۆ من. پرســـیم ئەی خەبەری براکەت؟ گوتی ئەو له زیندانه. زیندانی لەشکری ٢ی زرێپۆش. ڕۆژانی هەینی دەکرێ بچینه ســەردانی. تا ئێســتا هیچ هاوشـاری و دۆسـتێک نەچوونەته ســەردانی، بەڵام من هەموو حەفتەیەک دەچم. پرسـیم بۆچی گیراوە؟ گوتی ئەنـدامی حیزبی توودە بووه. گوتم جومعه پێکەوە دەچینه ســەردانی. گوتی باش نییه، نەکا تۆ تووشـی کێشـــه بی. گوتم ئی من لەوەی گوزەراوە. له هیچ شـــتێ ناترسـم. جگه لەوەش، مەگەر چی دەکەین؟ چوونەسـەردانی هاوڕێ کوێی خەتەرە؟ ژیان ئەو هەمووە ترسه ناهێنێ نا.

گەیشـــتینه بەر ماڵەکەی. دەرگای کردەوە. له ڕاڕەوەکەدا دەرگـای ھۆدەیەکی کردەوە، که پەنجەرەکەی دەیڕوانییه حەوشــه. دوو بەتانیی ڕاخسـتبوو. دوو دەســت نوێنوبانیش لەوێ بوون. پرســـیم مەگەر تەنیا نی؟ گوتی نەخێر، لەگەڵ کاک قادری بابامیری که شاگرد بەرگدروویه، هاومزڵین. من کاک حەمەدەمین بابامیریی بابی کاک قادرم باش دەناســی، بەڵام کاک قادرم نەدیتبوو. گوتم باشـتر، دەبینه ســێ کەس. گوتم بەڵام ئاغای شـیرازی منیش پێویسـتم به دۆشـەگ و پێخەفه. گوتی دوانیوەڕۆیه دەچینه حەســـەنـابـاد، لەوێ نوێنوبانی خاوێنی دەســـتی دوو دەفرۆشـــن. پاش نیوەڕۆیه چووین. شـــەوێ بابامیریش هاتەوە. ســێ کەســی کەوتینه قســه، تا نیوەشــەوێ نەخەوتین. وەختی خەوێ، شـوکرانەی

خوام کرد، چونکە پاش هەشـت سـاڵان نوێنوبانی خۆمم هەبوو و تێیدا دەخەوتمەوە و لە بەرایی ئازادیشمدا کە بێ ماڵوحاڵ و نەدار بووم، پووڵ لە سـایەی دۆسـتانمەوە بوومە خاوەن پووڵ و ماڵ و دوو هاوشـاریی خۆشـمم دیتەوە کە تەنیا نەبم. لە ڕۆژانی تاڵ و ناخۆشـیدا هیچ نیعمەتێک ناگاتە دۆسـت و هاودەردێک. کە دەکرێ پشـت و پەنـای یەکتر بی. بەو خەیـاڵانەوە خەوتم. بەیـانی کە هەسـتـام، هەردووکیـان ڕۆیبوون. ئـاغـای بـابـامیری چووبووە کـارگەی بەرگـدروون و شـیرازی چووبووە کەرەج، بۆ بەشـداربوون لە خولی میکانیکیی تەراکتۆردا. بەتەنێ بووم و دەمتوانی مشـوورێک لە ژیانی داهاتووم بخۆم. هەژاری و چارەڕەشـی بیر و مێشـکت بەهێزتر دەکەن. دۆخەکەم بە وردی هەڵسـەنگاند و هاتمە سـەر ئەوەی دەبێ زۆر شـێلگیرانە وەدووی دوو شـت بکەوم. یەکێکیان بچمە کۆلێژی پزیشـکی، بەشـکم بتوانم لەوێ درێژە بەخوێندن بدەم. ئەوی دی بەشـداری لە تاقیکاریی شـەشـی دواناوەندیدا. بەڵام هەردووکیان دەبوو بخەمە پاش پشووی نەورۆز.

## دیپلۆمی ئەدەبی

ڕۆژی هەینی لەگەڵ کاک محەمەدی شـــیرازی چووینە زیندانی لەشکری ٢ی زرێیی لە کۆنەجادەی شـەمیران. زۆر بە ئاسانی دەرەتانی چاوپێکەوتنەکە ڕەخسا. دکتۆر شیرازی بە دیتنی من سـەری سـوور ما. پێی وا نەبوو لە ئێران بم. دیداری هاوڕێیەک لە زیندان هەم خۆشـە هەم زۆر ناخۆش بوو. بەداخ بووم کە بۆچی ژیـانی ئێمە دەبێ ئەو هەمووە کوێرەوەری و نـاخۆشــییەی تێدا بێ. دەمزانی لەو مـاوە کورتەی ژیاندا تا ئێستا چەندەی زەحمەت کێشاوە و تاڵی و سـوێریی چاشــتووە. گاڵتە نییە بەخێوکردنی ژن و منداڵ و دایـک و برا و کـارکردن و خوێنـدن لە زانکۆ، ئەویش بە مووچەیەکی کەمی مامۆسـتایەتی و ئێسـتاش لە گۆشـەی زیندانێدا بی. کوردبوون، گەورەترین تاوانی ئێمە بوو. بەداخ بووم لەوەی کە دەتگوت بەرگی کوێرەوەری و بەشمەینەتی و ئازاری زیندانیان بە بەژنی ئێمە بڕیوە.

مـخابن وەک بڵێی هەنگاوی من سـووک بووبێ، چونکە سێ ڕۆژ پاش ئەو ملاقاتە، ناوبراو ئازاد کرا. دوو شـەو و ڕۆژ پێکەوە بووین. بۆ قەرەبووی زیندان و کوێرەوەرییەکان، دوو شـەومان بەخۆشـی بەڕێ کرد. بەڵام جا فایدەی چی، سێیەم ڕۆژ هەواڵێکی تاڵمان بیست. گۆیا عیسمەت خانمی کچی قازی محەمەد، کە مارەبڕاوی دکتۆر شـیرازی بوو، خۆی کوشتووە.

دکتۆر ناچار بوو بۆ ناشتنەکەی بچێتەوە مەهاباد. مخابن من نەمدەتوانی لەو ڕێورەسمەدا بەشدار بم. ئەو ڕۆیشتەوە

و ماوەیەکی زۆر لە مەهاباد ماوە. شیعری "ئای گوڵەکەم"ی بۆ ئەو کۆستە نووسیوە، کە زۆر جوان و سەرنجڕاکێشە.

حەوت ڕۆژی سەرەتای جێژن تێپەڕی و دامودەزگای میری کرانەوە. لەپێشدا سەرێکی ئیدارەی فەرهەنگی پارێزگام دا، بۆ ئەوەی بزانم تاقیکارییەکانی شەشی دواناوەندی کەی و چۆنن؟ تا کۆتایی مانگی خاکەلێوە دەرفەتی ناونووسی هەبوو و ١٥ی مانگی گوڵانیش تاقیکارییەکان دەستیان پێ دەکرد. پێنج حەفتەی پتر نەمابوو بۆ ئیمتیحانەکان. دەبوو لەگەڵ ناوی خۆم لەگەڵ ئەوانە بنووسم کە ئیمتیحانی دەرەکی دەدەن. بۆ سبەینێ لە بواری ئەدەبیدا ناومم نووسی و چوومە شەقامی شاباد، بۆ کتێبکڕین. سەیرم کرد کتێبخانەی عیلمییە هەموو کتێبەکانی شەشی ئەدەبیی هەیە و بە کرێش دەیداتە خەڵکی. من هەر شەوەی کتێبێکم بە کرێ وەردەگرت و پاش خوێندنەوە و یادداشتهەڵگرتنەوە بۆم دەبردەوە و یەکی دیکەم وەردەگرت.

دوو ڕۆژی مابوو بۆ ئیمتیحان، هەموو کتێبەکانی شەی ئەدەبیم خوێندبۆوە. هەر ئەو ڕۆژەش کارتی چوونە سەر ئیمتیحانم لە ئیدارەی فەرهەنگ، کە بەرانبەر پارکی شاری بوو، وەرگرت. ڕۆژی ١٥ی گوڵان لە تالاری تاقیکارییەکان لە قوتابخانەیەک سەرەتای شەقامی تەختی جەمشید ئامادە بووم.

ئیمتیحانەکان بە نووســراو و زارەکی تا کۆتایی گولانیان خایاند. ڕۆژی پازدەی جۆزەردانیش ئاکامی تاقیکارییەکان ڕاگەیەنراو و زۆر خۆش بوو کە لە ڕیزی دەرچووەکـانـدا بووم. ســـەرکەوتنێکی زۆر گەورە بوو. هەنگاوێکی گەورە بوو پاش ئەو هەمووە کەوتن و شـکسـت و کوێرەوەرییانە، هەنگاوێک کە بناغەی ژیانی دواترم لەسەری دامەزرا.

## وەرگێڕانی کتێبێک

لەگەڵ تەواوبوونی ئیمتیحانەکان، گیرفانی منیش بەتاڵ بیوو. ناچار کامێراکەمم فرۆشت. ئینجا لە ڕۆژانی بێکاری و دەسبەتاڵیدا خۆمم بە وەرگێڕانی کتبۆکەیەکی ڕووسیی بەرهەمی ئانتۆن چیخۆڤەوە خەریک کرد. ناوی کتێبەکە بە زمانی ڕووسی کاشتانکا بوو، کە تێیدا شەرحی حاڵی خەیاڵیی سەگێکی دەگێڕاوە. من لە وەرگێڕاندا ناویم نا "سەگە بەڕەڵلاکە". کتێبەکەم بردە ناوەندی چاپوپەخشی عەتایی لە ناسرخەسرەو. گوتیان هەڵیدەسەنگێنین، ئەگەر بەدڵمان بوو، چاوی دەکەین.

حەفتەیەک دواتر چوومەوە. پەسندیان کردبوو. وایان دانا شەششسەد تمەنم بدەنێ و منیش ئیمتیازی کتێبەکەیان بدەمێ. چار نەبوو، بەو نەداری و دەستبەتاڵیە ئەو پارەیە زۆر بوو. قبووڵم کرد و گرێبەستەکەم واژوو کرد.

لەو سەروبەندەدا بوو کە کاک محەمەدی شیرازی ماڵی گواستەوە بۆ کەرەج و لە بەشی تەعمیراتی تەراکتۆردا لە کۆلێژی کشتوکاڵ دەستی بەکار کرد. لەو ماوەیەدا کاک برایەکی کاک قادری بابامیری هاتبووە لامان. هەردووکیان زۆر کوڕی چاک بوون. بەڵام من چونکە بەردەوام خەریکی خوێندنەوە بووم، بۆیە پێویستم بە شوێنێکی بێدەنگ هەبوو. بە یارمەتیی میرزا خەلیلی خەسرەوی لە شەقامی باستیۆن، نزیک مەیدانی حەسەناباد ژوورێکم لە داپیرەی گوگووش بەکرێ گرت و لە هاوڕێیان جیا بوومەوە. مەحبووبەخانمی خاوەنماڵ،

لەو ئازەربایجانیانە بوو کە لە سـۆڤیەتەوە هاتبووە ئێران.
مەحبووبەخانم بۆخۆی لە خەستەخانەی سۆڤیەت کاری
دەکرد. بەیانیان لە خەستەخانە بوو و دوانیوەڕۆیانیش
بەکاروباری ماڵەوەڕادەگەیشت. ئەو جگە لە ژوورەکانی
خۆی، ژوویەکەی منیشی خاوێن دەکردەوە، کە دایمە
دەرگای لەسەرپشت بوو، یانی من قەت دامنەدەخست.

تەنانەت جلوبەرگەکانی ژێرەوەشمی وەکوو دایکێکی
میهرەبان لەگەڵ جلەکانی خۆیان دەشوشت. چاکە و
میهرەبانیی ئەو خانمە هەرگیز لەبیر ناکەم. مەحبووبە خانم
دوو کچی هەبوو و پێکەوە دەژیان. ڕەفیقەخانم، کچە
گەورەکەی وی کە ناوی خوازراوی نەسرین بوو، لە
مێردەکەی پێشووی، سابیری ئاتەشین کچێکی هەبوو
بەناوی گوگووش، کە سەرەڕای ئەوەی کچۆڵەیەکی
کەمتەمەن بوو، بەڵام لە کابارەکاندا سەمای دەکرد و
گۆرانیی دەگوت. دواتر ناوبانگی دەرکرد.

کچەکەی دیکەی مەحبووبە خانم ناوی فەخری بوو.
ژنێکی زۆر گەنج بوو و منداڵێکی لەبەردلانی هەبوو.
مێردەکەی لە کوێت کاری دەکرد. گوگووش خانمە چکۆلانە
لەگەڵ بابی دەژیا، بەڵام جاروبار دەهاتە ماڵی داپیرەی و
سەری دایکی دەدا. بەرنامەیەکی منداڵانیشی بەڕێوە دەبرد.
بە ڕاستی لەتەمەنی منداڵیشیدا هەر هونەرمەند بوو. سابیری
ئاتەشین واتە باوکی ڕاهێنەری بوو، کە ئەویش لە بواری
شانۆدا زۆر بەهرەمەند بوو.

من کە چوومە ماڵی مەحبووبە خانم، بەو پووڵەی لە
فرۆشتنی تەرجومەی کتێبەکە دەستم کەوتبوو، توانیبووم

ڕاخەرێکی پلاستکیی جوان لەبری فەرش لەگەڵ دەستێک مێز و کورسیی دەستی دوو و تەختی خەوێک بکڕم و سەرەڕای ئەوەی ژوورەکە زۆریش لاچەپ و کپ نەبوو، چونکە زۆربەی شەوان هەموویان لەمن کۆ دەبوونەوە و یاریی کۆنکەنمان دەکرد یان گوێمان لە مۆسیقا دەگرت، کەچی هیچ زیانێکی بۆ خوێندنەوەی من نەبوو و هەرگیز نەبوونە هۆی نارەحەتیم. لەو قۆناغی بێکەسی و تەنیاییەدا ئەو خانەوادەیە وەکوو دایک و خوشکی میهرەبان لەگەڵ من دەجووڵانەوە. یادیان بەرز و بەڕێز و ڕۆحی مەحبووبە خانم شاد بێ و وەبەر ڕەحمەتی پەروەردگار بکەوێ. ڕۆژێکیان کە هاتمەوە ماڵێ، سەیرم کرد ئاوێنەی سەر ڕەفەی ژوورەکەم نەماوە. شەرمم دەکرد و لە ڕووم هەڵنەهات لە مەحبووبە خانم بپرسم. تا بۆخۆی هات و گوتی دەزانی، گوگووش ئاوێنەکەتی شکاندووە. چووە سەر کورسییەکە بۆ ئەوەی پرچی داهێنێ، ئاوێنەکەی لەدەست بەربۆوە و شکا. گوتم بەلاگێڕی ئەو بێ، ئەو لە ئاوێنە ئازیزترە، هەر خۆی ئاوێنەیەکە.

ئیتر من پتر لە ساڵێک لەگەڵ ئەو خانەوادەیە بووم و لەبەر هێندێ شت ئەوێم بەجێ هێشت، بەڵام هەرگیز ئەو ڕۆژە پڕ بیرەوەرییانەم لەبیر ناچێ.

## وەزارەتی فەرهەنگ(پەروەردە)

لە بارەی کاری دووەمیشـــەوە، واتە دامەزرانەوەم لە وەزارەتی فەرهەنگ، دەم لەپووش مامەوە. بەشـی کارگێڕی بە نامەی ژمارە ١٥٨٥٤/٨ بە ڕێکەوتی ١٣٣٥/١١ وەلامی نەرێی دامەوە.

من لە سـۆڤیەت گەڕابوومەوە. لەو جیهـانەی کە بۆ خەڵکەکەی خۆی و بۆ وڵاتانی دیکەش مەترسیدار بوو. هەم لە زانکۆی پزیشـکی وەرنەگیرام و هەم لە وەزارەتی فەرهەنگ. هەڵبەت ئەو ناسـازگارییانەم پێشـبینی کردبوو و خۆمم بۆ زۆر هەلومەرجی تاڵ و نالەبار و پڕکوێرەوەری ئـامـادە کردبوو، بە مەرجێـک ئـازاد بم. ئەو مۆرەی بە چوونەوەی سـۆڤیەت لە نێوچاوانم درابوو، پەڵەیەک بوو پاک نەدەبۆوە و ببووە ناسنامەی من.

سێ مانگ و نیو بوو کە لە زیندانەکەی باخی میهرانی تـاران ئـازاد ببووم و لە کـاتی چوونە دەرەوەمـدا بەڵێننـامەیان لێ وەرگرتبووم کە لانیکەم مـانگێ جارێک خۆم بە ڕوکنی دووی ناوەندی فەرماندەیی ئەرتەش بە جەناب سەرهەنگ بەهارمەست بناسێنمەوە و ئینجا هەر کاتێکیش سـەفەری شـاری بکەمەوە، شـارەوانیی گەڕەکەکەی خۆم ئاگادار بکەمەوە. ئەو دوو بابەتە زۆر ناڕەحەت و ڕەشـبینیان کردبووم و تامی ئازادییەکەیان لەو زارمدا تاڵ کردبوو.

یەکەمجار کە پاش ئازادی سـەردانی ڕوکنی دووم کردەوە، سـەرهەنـگ بەهـارمەسـت گوتی دەبێ

پەژیوانینامەیەک بنووسـم، لە سـەر حیزبی توودە. گوتم قوربـان خۆ من ئەنـدامی توودە نەبوومە. گوتی قەینا. پێم سەیر بوو. وەختێک من ئەندامی ڕێکخراوێک نەبووم، پەژیوانینـامە و بێزارینـامە مـانـای چی؟ بەناچاری گوتم بەسـەر چاو. بەڵام ئەوەی ڕاسـت بێ زۆرم گوێ نەدایە. جاری دووەم کە چوومەوە، گوتی پەژیوانینامەکەتت نووسی؟ گوتم نەخێر قوربان. گوتی بۆ؟ گوتم چوومە نووسـینگە ڕۆژنامە بۆ هەر دێڕێک داوای سـێسـەد تمەنیان دەکرد. لەو هەلومەرجەدا کە من نە کارم هەیە و نە پارە، لە کوێی بێنم. دەمودەست زەنگی لێ دا، سەروانێک هات و دەستی بەرز کردەوە.

سـەرهەنگ بەهارمەسـت پێی گوت تێچووی چاپی پەژیوانینامەمان هەیە؟ سـەروان گوتی نەخێر قوربان. دەمێکە ئەوەیـان لێ بڕیوین. سـەرهەنگ ڕووی تێ کردم و گوتی زۆر باشـە، هەر کاتێک هەتبوو چاپی بکە. من لە ڕوکنی دوو هـاتمە دەرێ و بڕیـارم دا وا زوو نەچمەوە. مەگەر بـانگم بکەنەوە. جـا زۆری پێ نەچوو چوومەوە مەهاباد و لەوێ خۆمم بە شارەوانیی ئەوێ ناساند.

ئیتر ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ بووم، بەردەوام یەکێک لە مەئموورەکانی پۆلیس بەشوێنمەوە بوو و بەردەوام چاوی بە سـەرمەوە بوو. هەر بۆیە ئاد و پەیمـانم لەگەڵ خۆم بەست قەت قەت خۆمیان پێ نەناسێنمەوە

و خۆمیان پێشان نەدەمەوەز خۆ ئەوە ڕێک نەقڵی ئەوەیە عەسعەس ئەوەتام وەرە بمگرە.

وەزعم تـا بڵێی شـــپرز بوو. لەلایەکەوە وەزارەتی فەرهەنگ داواکەمی بۆ دامەزرانەوە ڕەد کردبۆوە، لەلایەکی دیکەوە کۆلێژی پزیشـــکیش لە چوونەوە بۆ زانکۆ بێبەریی کردبووم. تاقە ڕێیەکم بۆ مابۆوە، کەلک لەو ســـەرکەوتنە وەرگرم کە لە ئیمتیحانە دەرەکییەکان بەدەســتم هێنابوو، کە بڕوانامەی شەشی ئەدەبیم پێ وەرگرتبوو و بەوە دەمتوانی لانیکەم درێژە بە خوێندنەکەم بدەم. جا چونکە زۆرم حەز لە بەشـی ماف و یاسا بوو، دەبوو لە کۆلێژی ماف بخوێنم. ئینجا بەشـوێن کارێکیشـدا بگەڕێم کە بتوانم تێچووی ژیانم دابین بکەم. لە نەگبەتیی من کۆلێژی مـاف چەنـد ڕۆژێـک دواتر ڕایگەیاند کە لەمســاڵەوە خولی ســێ ســاڵەی کۆلێژ دەبێتە چوار ساڵ. ئینجا بۆ بەشداربوونیش دەبێ ئیمتیحانی کونکور بدەن و ســـەد خوێندکار وەردەگرین و دەبێ لە پۆلەکانیش ئامادە بن، کەچی ساڵانی پێشوو کۆلێژ سێ ساڵ بوو و هیچ ســـنوورێکیش نەبوو بۆ ئەوانەی دەیانویســـت ناویان بنووســـن و بەشـــدار بن. ئینجا بەشـــداربوون لە پۆلەکانیش خوێندنیشدا ئەرک نەبوو. بەو جۆرە هەر کەسێک لەوێ ناوی خۆی نووســـیبایە، لە کۆتایی ســـاڵدا دەچوو بەشـــداری تـاقیکـارییەکـان دەبوو و ئەوەش دەرەتـانی دەرەخســـاند بۆ ئەوەی ئەوانەی خوێندکاری پرۆفیشـــنال نەبوون، وێڕای خوێـنـدنەکەیـان بتوانن کـاریش بکەن. بەتـایبەتی ئەو دۆخە بۆ مـامۆســـتـا و فەرمـانبەرانی فەرمانگەکان زۆر باش و بەســـوود بوو. بەڵام بەو دۆخە

تازەیەی دروســـت ببوو، بۆ من کە هیچ ســـەرچاوەیەکی داهاتی سەربەخۆ و بژیوێک نەبوو، زۆر ئەستەم بوو یان لانیکەم دەبوو هەم بەڕێکوپێکی بچمەوە پۆل و بخوێنم و هەم کار بکەم. ڕێی دیکەم پێ شک نەدەهات. هەرچۆنێک بێ ئەو فکر و خەیاڵانەم بۆ دوایی هەڵگرت. جارێ شتێکی کە بۆ من پێویســـــت بوو، بەشـــــداری لە کونکور و دەرچوون لەو ئیمتیحانە بوو.

شـــەو و ڕۆژ دەمخوێند. لە کونکور دوو دەرس زۆر گرینگ بوون، بەتایبەتی لە کونکوری بەشی ماف و یاسا، یەکێکیان زمانی عەرەبی بوو، ئەوی دیکە زمانی بیانی. تەنانەت زمانی ڕووســـــی. من نیگەرانی ئەوەیان نەبووم، چونکە دڵنیا بووم لە نێو بەشـــــداربواندا لەوانەیە کەس نەبێ شـــــارەزای زمانی ڕووســـــی بێ. هەر بۆیە هەموو هەوڵی خۆمم بۆ زمانی عەرەبی و ئەدەبیاتی فارســـی تەرخان کرد. ڕۆژی پانزەی خەرمانان بەشداری کونکور بووم. لەو ماوەیەدا بۆ پەیداکردنی کاریش ســـەرم بە هەموو کونێکدا دەکرد و کەس نەمابوو ڕاینەســـپێرم ئەگەر کارێکیان پێ شـــک هات ئاگادارم بکەنەوە. بەو جۆرە چاوەڕێی دوو ئەنجام بووم، یەکێکیان ئەنجامی کونکور و ئەوی دیکە کار. هەڵبەت پێش ئەوەی ئەنجامی کونکور ڕابگەیەنرێ، بەختی خۆم بە ڕێکەوت لە کۆلێژی ماف کارێکی ڕۆژانەم دۆزییەوە. ئەوەش بەو جۆرە بوو، کە هـــاوینـــان زۆربەی ڕۆژەکـــان دەچوومە لای کـــاک عەودلڕەحمانی ئیمامی کە ئەودەم بەرپرســـی ژمێریاریی

سکرتاریای زانکۆ بوو. لە سەردەمی کۆمەڵەی ژێکافەوە یەکترمان دەناسی. دەیزانی من بێکارم. ڕۆژێکیان پێی گوتم کارێکم بۆ دۆزیویەتەوە. گوتم لە کوێ؟ گوتی لە کۆلێژی ماف، بەڵام بە ڕۆژمز[1]. دەسبەجێ قبووڵم کرد. ناوبراو یادداشتێکی نووسی و گوتی هەر ئێستا ببیە کۆلێژی ماف و بیدە بە بەرپرسی ژمێریاریی کۆلێژ، جەنابی زەینەدین. دەمودەست خۆمم گەیاندە ئەوێ. یادداشتەکەم دا بە جەنابی زەینەدین. جا بە ڕێکەوت مێزێک لە ژوورەکەیدا بەتاڵ بوو. ڕێک لەو ڕۆژەوە و لە پشت ئەو مێزە دەستم بەکار کرد. مووچەی مانگانەم چوارسەد تمەن بوو. کارەکەش لە هەشتی بەیانییەوە تا نیوەڕۆ بوو. هەڵبەت بۆ زێدەکاری دوانیوەڕۆیانیش پارە دەدرا. ڕێکەوتی دەستبەکاربوونەکەم ٢٥ی خەرمانانی ١٣٣٥ بوو.

زۆر درەنگ ئەنجامی کونکوریان ڕاگەیاند. پێم وایە دە ڕۆژ لە مانگی ڕەزبەر تێپەڕیبوو. ڕۆژێکیان لە ژمێریاریی کۆلێژ خەریکی کار بووم کە یەکێک لە بەشداربوانی کونکور هات و گوتی مزگێنیم بدەیە قبووڵ بووی. گوتم جا چووزانی؟ گوتی ناوی دەرچووەکان لە ڕۆژنامەکانی ئەمڕۆدا نووسراوە. لەڕادەبەدەر خۆشحاڵ بووم. لە

---

[1]. مز: حەق. دەسحەقێک لەپێناو کاری دیاریکراودا. ئەم وشەیە کە فارس کردوویانەتە ئی خۆیان، تەواو کوردییە. ڕۆژ + مز. ئەوان "د"یەکیان لە مزەکە زیاد کردووە. ئەوەتا مامۆستا هەژار دەڵێ:

لەسەر دوو بۆقەی مزی.... لەملاولەولا دەیدزی.

خۆشـیان باوەشـم پێدا کرد و ماچم کرد. کابرا، محەمەد جەعفەری لسانی بوو، کە دوایی بوو بە پارێزەر.

لە کۆلێژی ماف ناومم نووسی. بەو جۆرە لە ڕەزبەری ئەوێ سـالێدا هەم خوێنـدکاری کۆلێژ بووم و هەم فەرمانبەری ڕۆژمزی ئەوێ. ئەو دوو سەرکەوتنە یەک لە دوای یەکە زۆر گرینگ بوون. بەڕاستی ژیان سەیرە. جاری وایە هەموو دەرگاکانت لێ دادەخرێن و جاری واشە هەموو دەکەونە سەر پشت. ئەو دۆست و ئاشنایانەی تا دوێنێ هەر ئاوڕێکیشـیان لێ نەدەدامەوە، ئێسـتا ئیرەییان پێ دەبردم. هەم لە کۆلێژێکی گرینگ خوێندکار بووم و هەم ماف و مووچەیەکی باشـیشـم وەردەگرت. سـەری مانگ کە مووچەم وەرگرت، توانیم ڕادیۆیەکی ئاڵمانی و هێندێ کەلوپەلی پێویسـت لە فرۆشـگای زانکۆ بکڕم. لەگەڵ هەموو ئەوانەشـدا ئەو سـوکنایی و هێمنییەی لە ماڵی مەحبووبەخانم هەمبوو، وێڕای موحیببەتی دایکانەی ئەو، نیعمەتێکی گەورە بوو. ئەگەرچی سەرکەوتنەکەی یەکەمم واتە کارکردن لە کۆلێژی ماف زۆری نەخایاند. لە بیستی ڕەزبەرەوە، جەنابی دکتۆر سـەفدەریی سـەرۆکی کۆلێژی ماف بانگی کردمە نووسـینگەکەی و وێڕای پیرۆزبایی دەرچوونەکەم پێی گوتم، ئەو کـارە لەگەڵ یـاسـا و ڕێسـاکانی کۆلێژ ناتەبایە. یانی ناتوانی هەم خوێندکاری کلێژەکە بی و هەم فەرمـانبەری ئەوێ. بـاشـتر وایە یەکێکیـان هەڵبژێری. هەڵبەت بەو پێیە کە خوێنـدن لە کۆلێژی ماف زۆر قورس و ئەستەمە و چوار سـاڵیشـە،

باشتر وایە خەریکی کارەکە بی، چونکە حەق و مووچەیەکی کەم نییە. دەمودەســـت مەســـەلێکی کوردیم بیر کەوتەوە. ببوومە گیســـکەکەی هەیاس. هەر دەهاتم تۆزێک گۆشـــت بکرمەوە و قەڵەو بم، گورگێکم دەدی و گۆشـــتم پێوە نەدەماوە. وەڵامی جەنابی دکتۆر ســـەفدەریم داوە و گتم قوربان من زۆرم زەحمەت بۆ خوێندنەکەم کێشاوە و خۆمم پێوە مـانـدوو کردووە، ئێســـتـاش کە دەرچووم، بە هیچ شـــێوەیەک نامەوێ لە دەســـتی بدەم. واز لە کارەکەم دێنم. بەڵام چونکە بـاری مـاڵی و مـاددیم بـاش نییە و هیچ ســـەرچاوەیەکی بژیوم نییە، ڕێگەم بدەن مانگێکی دیکە کار بکەم، چونکە مووچەی ئەو دوو مانگە بەشی تا سەری ساڵم دەکا. گوتی زۆر باشـــە. گوتم منیش بەڵێن دەدەم ڕێک لە کاتی خۆیدا دەســـتلەکارکێشـانەوەکەم پێشـکەش بکەم. بەو جۆرە لەگەڵ دکتۆر سەفدەری ڕێک کەوتم و هاتمە دەرێ.

چەنـد ڕۆژ دواتر وەختێـک چوومەوە مـاڵی مەحبووبە خـانم، نـامەیەکم لەســـەر مێزەکەم دی. لە وەزارەتی فەرهەنگەوە هـاتبوو، کە پێیـان ڕاگەیـاندبووم لە وەزارەتی کار دامەزراوم.

ئەو حوکمە ڕۆژی ٢٤ی ڕەزبەر بەدەستم گەیشتبوو. بۆ سبەینێکەی چەند سـەعاتێک ڕوخسـەتم لە جەنابی زەینەدین وەرگرت و بەپەلە خۆمم گەیاندە وەزارەتی کار. حوکمەکەم پێشـان دان. گوتیان کۆپیی ناسـنامە و وێنەیەک پێویســـتە. وێنە و کۆپیم پێ دان و ئەوانیش دەمودەســـت کارتێکیان بۆ چاپ کردم. دەبوو حەفتەی جارێک وەکوو فەرمانبەر لەوێ بم و کاروباری نووســـینگە و ئیدارە ڕاپەڕێنم و دەفتەری

هاتن و ڕۆیشتن ئیمزا بکەم و سەری مانگیش مووچەی خۆم وەرگرم. ئەوە سەرکەوتنێک بوو خوا گەیاندبووی.

## بە حیکمەت دەرکێک دابخاتەوە
## بە ڕەحمەت یەکی تر دەکاتەوە

هەڵبەت ئەو مووچەیەی ئیدارەی فەرهەنگ دەیدامێ، زۆر کەمتر بوو لەوەی لە کۆلێژی ماف وەرم دەگرت. بەڵام ئەوەندەش بەشی خەرجی ڕۆژانەمی دەکرد و لەسەریشم زیاد بوو.

جا ئەوە چۆن بوو کە وەزارەتی فەرهەنگ لەبری ئەوەی بمباتەوە سەر کاری مامۆستایەتییەکەم، بەڕێی وەزارەتی کاری کردبووم، دواتر ئاماژەی پێ دەدەم. لێرەدا ئەوەندە پێویستە بڵێم کە تەواوی ئەوانەی وەکوو من فەرمانبەری وەزارەتی کار بوون و بە کردەوە کاریان نەدەکرد، بەڵام سەری مانگ مووچەیان وەردەگرت، ئەندام و لایەنگرانی پێشووی توودە بوون، کە پاش دەسبەسەرکران و زیندانی و نووسینی پەژیوانینامە ئازاد ببوون. دەوڵەت ئەوانەی بە شیاوی ئەوە نەدەزانی کاری پەروەردەیان پێ بسپێرێ.

ئیتر بەو جۆرە خەمی بژیو و داهاتم نەما. باش بوو لەبری کارکردن لە کۆلێژ، خوێندنی کۆلێژەکەم هەڵبژارد. سەری بێ ڕۆزی لە بن گڵدایە. ڕێک لە کاتی خۆیدا دەستلەکارکێشانەوەکەمم پێشکەشی دکتۆر سەفدەری کرد و مووچەی دوو مانگەکەمم لێ وەرگرت و ماڵاواییم لە فەرمانبەرەکان کرد.

## بەزمەکەی کۆلێژی پزیشکی دووپاتە دەبێتەوە

بزنەکەی هەیـاس لەکۆڵم نەدەبۆوە. وێڕای خوێنـدن لە کۆلێژی ماف و وەرگرتنی مووچە، تۆزێک ئاســـوودەییم بە نەســـیب ببوو و خەریک بووم بیرەوەرییەکانی پزیشـــکیم لەبیر دەچوونەوە. تـا ڕۆژێکیـان هەواڵنـامەی حەوتوانەی زانکۆ، کە بە خۆڕایی دەخرایە بەر دەســـتی خوێندکارەکان، گەیشـــتە دەســـتم. مانگی ســـەرماوەز بوو. بە خوێندنەوەی هەواڵەکانی، کتوپڕ دنیای هێمن و ئاســـوودەم شـــێوا. هەر کەس لە جێی من بوایە ئاگری دەگرت و تووکی لە هەموو شتێ دەکرد.

لەو هەواڵنامەیەدا، هەواڵێکی کۆلێژی پزیشکی چاپ ببوو. هەواڵەکە بەو جۆرە بوو.

ئەنجومەنی کۆلێژی پزیشـــکیی تاران ڕەزامەندیی خۆی دەربڕیوە کە کۆمەڵێک لەو خوێندکارە ئێرانییانەی لە وڵاتانی ئەمریکا و ئەڵمان دەرسیان خوێندووە و گەڕاونەتەوە ئێران، بێن لە کۆلێژی پزیشکیی تاراندا بخوێنن، کە بریتین لە:

١. بەڕێز...

٢. بەڕێز...

٣ـــــ بەڕێز مەنووچێهری زاوش، ســـاڵی ســـێی پزیشـکیی ئاڵمان، خاوەنی دیپلۆمی ئەدەبی لە دووەم ســـــاڵی کۆلێژی پزیشکیی تاران.

کە ئەوەم خوێندەوە هەر تاســـام. خوایە من لە چ وڵاتێکدا دەژیم. ئەو ئەنجومەنە، ئەو مامۆســـــتا پایەبەرزانەی کۆلێژ، ئەو سەرۆکایەتییەکی کۆلێژی پزیشکی و زانکۆیەی تاران و

وەزیری دەرباری شاهەنشایی شەرم ناکەن؟ هیچ تامی مرۆڤبوونیان چێشتووە؟ ویژدانیان هەیە. هێشتا چوار مانگ نابێ کە ئەنجومەنی کۆلێژی پزیشکی بڕیاری لەسەر من داوە. هێشتا مرەکەبی ئەو بڕیارە وشکەوە نەبووە. منیان لە خوێندنی پزیشکی بێبەش کرد، چونکە دیپلۆمی ئەدەبیم هەبوو، سەرەڕای ئەوەی لە کۆلێژی پزیشکیی باکۆش دەرسم خوێندبوو، بەڵام بەڕێز زاوشیان قبووڵ کردووە کە ڕێک هەلومەرجەکانی منی هەیە. پەکوو مەملەکەتێکی سەیرە. تەح لەو ئەنجومەنە. ئاخر جیاوازیی مەرجەکانی من و زاوش چ بوو، کە هەردووکمان دیپلۆمی ئەدەبیمان هەیە، ئەو وەرگیرێ و من وەرنەگیرێم؟

ئەوەندە بوو ئەو لە ئاڵمان گەڕابۆوە و من لە سۆڤیەتەوە. لێرەدا ئەوەی بەلامەوە گرینگ بوو، مەسەلەی خوێندنەکە نەبوو، مەسەلەی بەکەمگرتن و جیاوازیخستنەکە بوو.

ئەنجومەن بەو بڕیارەی، پەلاماری کەسایەتیی سیاسی و کۆمەڵایەتیی منی دابوو. دەبوایە لەو زوڵم و بێدادییە وەدەنگ بێم و بەگژیاندا بچمەوە و ئەو بیرمەند و مامۆستا سووک و نەشیاوانە ڕیسوا بکەم و پەتەی ئەو ساواکییە نیشتمانفرۆش و خۆفرۆشانە بخەمە سەر ئاو.

شەوێ دانیشتم و عەریزەیەکی تێروتەسەلم بۆ جەنابی دکتۆر مەنووچێهری ئیقباڵ نووسی. بەیانی بەر لە سەعات هەشت خۆمم گەیاندە سکرتاریای زانکۆ. باش بوو، سەرەڕای ئەوەی یەکێکیشی لەلا بوو، کەچی

بەردەستەکەی ڕێگەی دام بچمە ژووریٚ. دکتۆر ئیقبال لەگەڵ ئەو کەسە چەنەی گەرم داهاتبوو. هەر منی دیت، نێوچاوانی تێک نا و بە تووڕەییەوە گوتی، کاکە ئەوجار دەڵێی چی؟ مەگەر ئەنجومەن ڕای خۆی پیٚ نەگوتووی؟ گوتم بەڵیٚ قوربان. باشتر کە جەنابت حوکمەکەی ئەوانت لەبیر ماوە. بەڵام ئەوە دروستە کە ئەنجومەنی کۆلێژ بەو مامۆستا پایەبەرز و کەسایەتییە زانستیانەوە لە چەند مانگێکدا دوو بڕیاری ناتەبا و لێکدژ و جیاواز دەردەکا؟ ئەنجومن منی بۆیە وەرنەگرت چونکە دیپلۆمەکەم ئەدەبی بوو. بەڵام کەسێکی دیکەی هەر بەو دیپلۆم و مەرجانەوە قبووڵ کردووە.

گوتی شتی وا نابیٚ. گوتم فەرموو. هەواڵنامەی زانکۆم لە گیرفانم دەرهێنا و لەسەر مێزەکەیم دانا. کە هەواڵەکەی خوێندەوە، ڕەنگی بە ڕووەوە نەما. تۆزێک خۆی هێنا و برد. جوان دیار بوو دەستی دەلەرزین. پێم وابوو کارێکی خراپم لەگەڵ نەکردووە. وێڕای ئەوەی کاری ئاوا لەگەڵ دڵ و دەروونی من یەکی نەدەگرتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەمزانی هەر ئەو وا نییە، هەم ئەو و هەم مامۆستاکانی ئەنجومەن و هەم بەڕێوەبەری کۆلێژ، جەنابی دکتۆر حەفیزی، هەموان لە قوماشێک بوون. دەمزانی بە درێژایی ساڵانێک، ورەی بەرەنگاربوونەوەیان لە ئێمەی کورددا کوشتووە. پشوویان لیٚ بڕیوین، بەڵام ئەو هەشت ساڵ زیندان و دەربەدەرییە ئازایەتی و بوێریی ئەوەی پیٚ بەخشیبووم کە بتوانم قسەی خۆم بکەم.

گوتم قوربان، تا ئێســـــتا جیاوازیخســــتنی وا زەق و بەرچاوی گەورە و زانســـتی، بەو ناشــیرینییە لە لیژنەی زانستیی زانکۆیەک نەبینرابوو و چاوەڕێ نەدەکرا.

گوتی شــتێک بنووســـە و بۆم بێنە. گوتم نووســـیومە. دەستم لە گیرفانم نا و عەریزەکەمم دایێ.

عەریزەکەی کردەوە و چەند دێڕێکی خوێندەوە. گوتی ســــبەی دوانیوەڕۆ کۆبوونەوەی ئەنجومەنمـــان هەیە، دەتوانی بێی و ئەنجـامەکە وەرگریتەوە. لەســــــەرخۆ لە ژوورەکەی چوومە دەرێ. بەدڵ خۆشحاڵ بووم. دەمزانی ئامانجەکەمم باش پێکاوە. ســــەرکەوتنم مســــۆگەر بوو. منیش وەکوو زاوش لە دووەم ســـاڵی کۆلێژی پزیشــکیدا قبووڵ دەکەن.

لەوە باشـــــتر نابێ. زۆری نەمابوو بۆ کۆتایی ســــاڵی خوێندن. نیگەرانی مووچەش نیم. بووکی ئاواتم ئەگەرچی بە درەنگییەوە، بەڵام خەریـــک بوو لە ئـــامێز دەگرت. دوعای بەخێرم بۆ بەڕێز زاوش کرد. ئەگەر ئەو نەبوایە بەو ئاواتەم نەدەگەیشتم. هەڵبەت ئەنجومەن پێی وانەبوو ئەو هەواڵە لە هەواڵنامەی زانکۆدا بڵاو دەبێتەوە یان پێی وانەبوو من دەیخوێنمەوە. کابرا منی هەر لەبیر نەمابوو. دەســــکەلایەکی باشـــم وەدەســــت کەوتبوو و زەبرێکی کاریگەرم لە پەیکەری ئەو هێلانەی گەندەڵییە وەشاندبوو. بەو بەڵگە زیندووە پەتەیانم خســـتبووە ســــەر ئاو، ناچار بوون قبووڵم بکەن. ئەگەرچی ئەوانە وەک سۆنە وابوون و تەڕ نەدەبوون و بەو بـایـانە نەدەلەرزین و لە ڕوو

نەدەچوون. ئینجا پشتیشیان قایم بوو و پشتیان بە ساواک گەرم بوو و چییان پێ خۆش بوایە دەیانکرد.

بۆ سبەینێ دوانیوەڕۆکەی لە زانکۆی پزیشکی و پشت دەرگای ئەنجومەن ئێشکم گرت. تەواو شەکەت ببووم. کتوپڕ دەرگای هۆڵەکە کرایەوە و قەڵافەتی زەبەلاحی دکتۆر ئیقباڵ وەدەر کەوت. لەشکرێکی شکستخواردووی بەدووەوە بوو. هەر لە دوورەوە منی دی ئاماژەی کرد، چوومە پێشێ و سڵوم کرد. گوتی ئەنجومەن تۆشی قبووڵ کرد. دوایی بچۆ بڕوانامەکەت بدە بە سکرتاریا. جەنابی دکتۆر حەفیزیی سەرۆکی کۆلێژی پزیشکی وەکوو بەورێکی ئەنگێورابێ، فایلێک لەبن باڵیدا بەدوویدا دەهات. تەنانەت بە خێسەیەکیش سەیری نەکردم. سوپاسم کرد و بەدوویاندا ڕۆیشتم. ئەوان شکستخواردوو و من سەرکەوتوو. بەڵم نازانم بۆچی ژیان کردبوومی بە گاڵتەجاڕ و شادی وەکوو منداڵان چاوشارکێی لەگەڵ دەکردم. جاری وابوو هەموو شتێک بەدەممەوە پێ دەکەن و جاری واش بوو لە خەم و پەژارە و تاریکی بترازێ هیچم نەدەدی. دەتگوت تەونی بەختی منیان بە ڕەشی چنیوە. بەڵام من لەگەڵ چارەڕەشی ڕاهاتبووم.

بەیانی بڕوانامە و پشتگیریی سکرتاریای زانکۆ و بڕوانامەی ئیدارەی ئیمتیحانات (دیپلۆمی ئەدەبی) و کۆپیی ناسنامە و چەند وێنەیەکم لەگەڵ خۆم بردە سکرتاریای کۆلێژی پزیشکی و بە دڵێکی خۆشەوە چوومە ژووری دکتۆر حەفیزی. شتەکانم ڕادەستی کرد. ناوبراو سەیرێکی کردن و گوتی ئەی کوا کارنامەکانی خوێندنت لە کۆلێژی پزیشکیی باکۆ. گوتم نەیانداومەتەوە، بەڵام پشتگیریی

سـکرتاریای زانکۆم هێناوە، کە دەڵێ لەوێ خوێندوومە. گوتی ئەوە بەس نییە و بەبێ کارنامە ناتوانم وەرتگرم. گوتم جەنابی دکتۆر ڕێگەم بدەن با من بچمە سەر خوێندن، لە ڕێی وەزارەتی دەرەوە داوای بڕوانامەکانیشم دەکەم. ئەگەر نەهاتن، دوایی دەرم کەن. گوتم هاوپۆلەکانی من کە پێشتر لە سۆڤیەتەوە هاتوونەوە و لێرە خوێندوویانە، هیچ کامیان کارنامەیان پێ نەبوو. گوتی ئەو دەم بەسەر چوو. ئەودەم بە گوشـاری توودە ئەو کارە کرا. چەندی لەبەری پاڕامەوە و تکام کرد، گوتم چەندین ساڵ ئازار و مەینەتی و زیندانم چێشتووە، بەزەییتان پێمدا بێ، تا هەم دوعـای بەخێرت بۆ دەکەم. چەنـدی من پتر پێم دادەگرتەوە، ئەو توورەتر دەبوو تا بەسەرمدا نەڕاندی و گوتی من ناهێڵم کۆمۆنیست بێنە نێو کۆلێژ. ئەو سەردەم بەسـەر چوو. ئاوێکی سـاردی بە دەسـتمدا کرد. زانیم یەکەم جاریش ئەنجومەن بۆچی وا توندی گرتبوو و ئەو حوکمەی دابوو.

منیش نەڕاندم و گوتم، بەڕێزم من کۆمۆنیسـت نیم. من لە دۆزەخی کۆمۆنیسـتان ڕام کردووە. گوتی هەر ئەوەیە پێم گوتی. بەردەسـتەکەی، دەرگای ژوورەکەی کردەوە. کۆمەڵێک خوێندکار لەبەر دەرگا وەسـتابوون. ناچار بووم بچمە دەرێ. بە دڵێکی شـکاوەوە لە کۆلێژ چوومە دەر. دنیایەک فکر و خەیاڵم بەمێشکدا هاتن. بیری مەترسـیدار. چیم پێ دەکرا؟ پەنام بۆ کێ بردبایە؟ دڵنیام

ئەگەر پارەم هەبوایە دەمتوانی ســـمێڵی ئەو بێغیرەتەی پێ چەور بکەم و وام بەسەر نەدەهات.

نامەیەکی تێروتەســـەلم بۆ ئەنجومەنی کۆلێژی پزیشــکی نووســـی و بـاســـی بیـانووگرتن و پەڵپی نـامـاقووڵ و نـامرۆیـانەی دکتۆرم کرد. لە وەڵامی نـامەکەدا بەڕێوەبەر وەڵامێکی دوور لە ڕاســـتگۆیی و ڕاســـتیی بۆ ناردمەوە، کە وێنەکەی لە کۆتایی کتێبەکەدا دانراوە.

یەکەم، دەڵێ: ئەو خوێندکارانەلە ساڵانی ١٣٢٥ و ١٣٢٤دا وەرگیراون. لە حاڵێکدا ئەوانە ســـاڵی ١٣٢٥ لە ســـۆڤیەت هاتوونەوە و ئەگەر قبووڵیش کراون ئەوا ساڵەکانی ١٣٢٦ و ٢٧ بووە.

دووەم: ئەو خوێندکارانە کە بۆخۆشـــم لەگەڵیان بووم، هیچ کـامەیـان کـارنـامەی خوێنـدنیـان لە بـادکوبەوە نەهێناوەتەوە، نە کۆلێژی پزیشـــکیی باکۆ دەرفەتی ئەوەی بـوو کـارنـامەمـان بـداتێ، نە دەرفەتـی ئەوەی دایـنـێ وەریگرینەوە. بۆیە ئەو قسەیە درۆی پەتی بوو.

سێیەم، دەڵێ: هەمووان دیپلۆمیان خستووەتە ڕوو.

کەوابوو دیارە ئەو بەڕێزە تەنانەت لە مانای خستنەڕووش نەگەیشتووە. خستنەڕوو یانی پێشاندان، نەک ڕادەستکردن. بەو جۆرە، خوێنـدکـاران لە کـاتی دەســـپێکی خوێنـدن لە کۆلێژی پزیشکیی تاراندا تەنیا دیپلۆمەکەی خۆیانیان پیشانی بەڕێزان داوە.

چوارەم، دەڵێ: من تەنانەت دیپلۆمە ئەدەبییەکەشـــمم بۆ ئەو کۆلێژە نەناردووە.

لە حاڵێکدا من پشتیوانیی ئیدارەی ئیمتیحاناتم ڕادەست کردبوون، چونکە هێشتا دیپلۆمەکەم ئامادە نەبوو.

پێنجەم: بەڕێز مەنووچێهری زاوش، جگە لە ڕادەستکردنی دیپلۆمی تەواو، بڕوانامەی دیکەشی هێناوە. دیار نییە دیپلۆمە ئەدەبییەکەی زاوش چ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەوی من هەیە؟ ئی ئەو تەواو بووە، بەڵام ئی من ناتەواو؟

شەشەم: بەڕێز مەنووچێری زاوش بەڵگەنامەی دیکەی داوە بە زانکۆ.

جا ڕوونی نەکردووەتەوە بەڵگەنامەکان چی بوون؟ هەرچۆنێک بێ، کارنامە نەبوون. دەی باشە منیش پشتگیریی سکرتاریای زانکۆی تارانم بردبوو، کە بەڵێ سێ ساڵ لە کۆلێژی پزیشکیی باکۆ خوێندوومە. دەی لەوە زیاتر؟

ئیتر ئەو وەڵامە پڕ قین و بێمانایەی ئەوم بە شەرح و لێکدانەوە و هەموو بڕوانامەکانی پێشوومەوە ناردە ئەنجومەنی کۆلێژی پزیشکی و داوام کرد ئەنجومەن خۆی قەزاوەت بکا، بەڵام نە ئەنجومەن وەڵامی دامەوە و نە سکرتێری بەڕێزی کۆلێژەکەش.

لەگەڵ ئەوەدا لەبەرگیراوەیەکی نامەی سکرتاریەت و کۆپیی هەواڵنامەی زانکۆم لەگەڵ وتارێک بۆ ڕۆژنامەی ئیتلاعات نارد، چاپیان نەکرد. بۆ کەیهانیشم نارد، چاپیان نەکرد. ناچار وازم لەو بابەتە هێنا. هەڵبەت چونکە لە

کۆلێژی ماف دەمخوێند، زۆری وەدوو نەکەوتم، ئەگینا بە هیچ شێوەیەک وازم لێ نەدێنا.

سالّی ١٣٣٥، بەڕاستی ساڵێکی پڕ لە ڕووداو و چارەنووسساز بوو بۆ من. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا ڕووداوێکی دیکەش ڕووی دا، کە گێڕانەوەی ناخۆش نییە.

بەتەما بووم بۆ نەورۆزێ بچمەوە مەهاباد. جا چونکە ئەو پارەیەی لە کۆلێژم وەرگرتبوو، خەرجم نەکردبوو، بڕیارم دا لە بانک پاشەکەوتی بکەم، بەڵام دەفتەرۆکەی پاشکەوتەکەمم بزر کردبوو. ژمارەکەشیم نەدەزانی. چوومە بەشی پاشەکەوتی بانکی میللی لە شەقامی فێردەوسی و بۆ یەکێک لە فەرمانبەرەکانم باس کرد. گوتی قەی ناکا. دوو تمەن تێ بکە. تێم کرد. فەرمانبەرەکە ناونیشانمی نووسی و گوتی سبەی وەرەوە، دەفتەری تازەت دەدەینێ.

سبەی کە چوومەوە، دەفتەرۆکەکەی بەدەستەوە بوو. گوتی چەندەت لە حیسابدا هەبوو؟ گوتم لە بیرم نییە. تەنیا دە تمەنم تێ کردبوو، ئەویش بۆ بەشداری لە تیروپشکی ساڵانەدا. دەفتەرۆکەکەی دامەوە. کە خوێندمەوە، سەیر دەکەم، هەزار و هەشسەد و سی و دووتمەنی تێدا بوو. هەزار تمەنی دیکەشم دایە خستییە سەر حیسابەکەم. دڵنیا بووم لە تیروپشکەکەدا بۆم دەرچووە.

## ساڵی ١٣٣٦

نەورۆزی ســـاڵی پاش ماڵاوایی لە مەحبووبە خانم و کچەکەی بەرەو مەهـابـاد وەڕێ کەوتم، بەڵام ئەمجـارە ئیدی نەچوومە شـارەوانی و خۆمم نەناسـاند. هەر بۆیە ئەو دە ڕۆژەی لە مەهـابـادێ بووم، بەو پێیەی بـاری داراییشـــم بـاش ببوو و جلوبەرگێکی پـاکوخـاوێن و ڕێکوپێکم لەبەردا بوو، زۆرم خۆش لێ گوزەرا.

لەو ماوە کورتەدا خوشـــکەکەم زۆری بۆ هێنام ژن بێنم. بۆخۆشم حەزم لێ بوو، چونکە خەریک بوو تەمەنم دەچووە ســـەرێ و ئیدی وردە وردە بۆ ژنهێنان درەنگ دەبوو. ئەگەرچی ئەو چەند کچێکیشـی بۆ هەڵنابووم و م چووم چـاوم پێیـان کەوت، بەڵام لەبەر ئەوەی دەرفەتم کەم بوو، هەڵمگرت بۆ هاوینێ. سـاڵی خوێندن تەواو بوو و سـاڵی یەکەمی کۆلێژی یاسـام سـەرکەوتووانە تێپەڕاند و ووەک بەڵێنم بە خوشـکم دابوو، لە پووشـپەڕدا بەرەو مەهـــابـادێ کەوتـمەوە ڕێ. لەو مەودایەدا مـــووچەی مامۆســـتایەتییەکەم تەواو پێ دەدرا و مانگی ٢٤٠ تمەنم وەردەگرت. هاوکات سەردانی وەزارەتیشم هەر دەکرد و حەفتەی جارێک دەفتەری هاتن و چوونم ئیمزا دەکرد و هەر کاتێکی کارم هەبوایە یان چووبامە ســـەفەر، یەکێک لە هاوڕێیانم ڕادەســـپارد لە بری من دەفتەری هاتن و چوونەکە ئیمزا بکا. خوشـــکەکەشـــم هەر وا بە شـــوێن بەشـــوێن ئەوەوە بوو ژنم بۆ بخوازێ. بەڵام من بە کاوەخۆ و چوونە ســـەر شـــایی و زەماوەندان خۆمم لێ

دەگنخاند. چەند ڕۆژێک ددانم ژانی تێ گەڕا. بە ڕاسپاردەی دۆست و برادەران چوومە لای دکتۆر دیانزادە، کە ددانپزیشکێکی جوولەکە بوو و لە باڵەخانەی ڕەحیمزادەدا کلینیکی هەبوو و پاش چەند جار هاتوچۆ بووینە دۆست. بە جۆرێک پاش چارەسەری ددانیشم ئیدی هەر سەردانیم دەکردەوە. دوانیوەڕۆی ڕۆژێک دکتۆر پێی گوتم سبەینێ جومعەیە، بانگهێشت کراومەتە یەکێک لە گوندە خۆشەکانی سەر سنوور. تۆش وەرە با پێکەوە بچین. پرسیم کێ بانگهێشتی کردووی؟ گوتی سەید ڕەسووڵی بابی گەورە. من سەید ڕەسووڵم نەدەناسی، بەڵام گوتم قەیناکا. دامانناپێش سەعات هەشت بچمە کلینیکەکەی. بەیانی پێکەوەبە پێیان هاتینە دەرەوەی شاری و قەرار وابوو لەوێوە بە ئەسپ بڕۆین.

کە گەیشتینە ئەوێ، کاک ڕەحمانی مودەڕسیشم لەوێ دی. پێم سەیر بوو، ئاغای دیانزادە ئەوەی پێ نەگوتبووم. ئیتر، نۆکەری خانەخوێیەکەمان سێ ئەسپی لەگەڵ خۆی هێنابوو. لەگەڵی سوار بووم و ڕۆیشتین. لە نزیک شار، گەیشتینە داوێنی چیایەک، کە چەند خێوەتێکی لێ هەڵدرابوو. جێیەکی زۆر خۆش بوو. تا چاو بڕی دەکرد سەوزایی و جوانی و جۆگەیەکی ئاوی زوڵاڵ لە کانییەکەوە بەرەوخوار دادەگەڕا. لەگەڵ سەید ڕەسووڵی بابی گەورە، کە لاوێکی کورتەباڵای جوان بوو، ئاشنا بووم. دیانزادە دەیگوت، سەید ڕەسووڵ یەکێکە لە مشتەرییەکانی و هەر لەو سۆنگەیەشەوە پێکەوە ئاشنا بوون.

دکتۆر دیانزاده بۆ تێپەڕاندنی قۆناغی سەربازییەکەی هاتبووە مەهاباد. ئەو ڕۆژە بۆ فراوین گۆشتی بەرخیان برژاندبوو و خواردمان و گەشت و سەیرانێکی خۆشمان کرد لە داوێن و لاپاڵی ئەو چیا سەربەتەمانە. جەنابی دکتۆر، کامێرایەکیشی پێ بوو. چەند وێنەیەکی یادگاریشمان گرت. عەسرێ پاش ماڵاوایی و سپاسی سەید ڕەسووڵ و پیاوەکانی، بە کوێدا هاتبووین بەوێدا گەڕاینەوە مەهاباد. چەند ڕۆژێکی بەسەردا تێپەڕی. ڕۆژێک، یەکێک لە مەئموورەکانی دژبانی(پۆلیس)ـی مەهاباد هاتە ماڵی خوشکم، کە من لەوێ دەمامەوە. بانگی کردم بۆ دیژبانی. کە چوومە هۆدەی سەرۆکی دژبانیی مەهاباد، ــ ئەودەم لە نزیک بانکی سپەی ئێستا بوو ــ ئەفسەرێک بە پلەی سەرگوردی لە پشت مێزەکە دانیشتبوو، فەرمووی کرد دانیشم. دەستبەجێ دەستی کرد بە پرسیاران. منیش شتەکە چۆنی ببوو ئاوا بۆم گێڕاوە و گوتیشم من سەید ڕەسووڵم نەدەناسی و پێشتر هیچ ئاشنایەتییەکم لەگەڵی نەبووە، ئەوەندەیە بە قسەی جەنابی دیانزادە بۆ سەیران و گەڕانێکی ڕۆژی هەینی دەعوەتەکەیم قبووڵ کرد. لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، چاوم بەو وێنانە کەوت کە دکتۆر دیانزادە گرتبوونی، لەگەڵ ڕاپۆرتێک بە خەتێکی جوان لەسەر مێزەکەی دانرابوون، بەڵام ئیمزاکەم نەناسی. پاش تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکە، جەنابی سەرگورد ئازادی کردم. من دەمودەست چوومە ماڵی چەند ئاشنایەک و لەبارەی

سـەید ڕەسـوولەوە پرسـیارم لێ کردن. گوتیان ناوبراو یەکێکە لە دژبەرە هەرە توندەکانی دەوڵەت و تا ئێسـتا چەند جاریش لەگەڵ هێزەکانی میری شـەڕی کردووە و ئەندامێکی کاریگەر و چالاکی حیزبی دیموکراتی کوردستانە.

دەمودەسـت هەسـتام چوومە لای دکتۆر دیانزادە و بە لۆمەوە پێم گوت، ئەوە چ کارێک بوو کردت؟ بۆچی تووشی چەرمەسـەریت کردم؟ گوتی منیشـیان بردووەتە دژبانی. پرسیم ئەی ئەو وێنانەیان لەکوێ دەست کەوتووە؟ گوتی لە منیان ئەستاندووون.

هەوڵم نەدا بزانم کێ ڕاپۆرتەکەی داوە. دەسـبەجێ گەڕامەوە بۆ تـاران و لە خێروبێری ژنهێنـان گوزەرام. بەلایەک بوو هـاتبوو. هەڵبەت هیچم نەکردبوو، بەڵام هەر ئەو چاوپێکەوتنە لەگەڵ سـەید ڕەسوول لەو دۆخەدا بۆ من کە لە سـۆڤیەت هـاتبوومەوە، دەکرا شـتی خراپی لێ بکەوێتەوە. هەر سـووکە تۆمەتێک بەس بوو. تا هـاتبام بێتاوانیی خۆم بسـەلمێنم، کەوڵم ڕەحاجەت دەکەوت. بڕیارم دا بەو زوانە تخوونی مەهاباد نەبمەوە.

## گواستنەوە

لە قرچەی گەرمای هاوینێدا بەناچاری گەڕامەوە تاران. چەند ڕۆژێک کە ڕابرد، بیرم لەوە کردەوە شوێنی نیشتەجێبوونم بگۆڕم و سەرەڕای ئەوەی مەحبووبەخانم و کچەکانی ئەو هەمووە لەگەڵم چاک بوون، بەجێیان بێڵم. یەکێکیان لەبەر ئەوەی بڕیارم دابوو ژیانی هاوبەش پێک بێنم، کە لەو حاڵەدا ئەو ژوورە چکۆلە بوو و هەم لەبەر ئەوەی، ئەویّ بۆ ئەو کارە شیاو نەبوو.

لەلایەکی دی بۆ ئەەی ماوەیەک ناونیشان و شوێنی مانەوەم دیار نەبێ، چونکە هێشتا نیگەرانی ئەو شتە بووم کە مەهاباد بەسەرم هاتبوو، بەتایبەتی لە ماڵی مەحبووبە خانمیش بم کە بۆخۆی پەنابەری سۆڤیەتی بوو و لە خەستەخانەی سۆڤیەتیش کاری دەکرد، دەترسام ئەوەش ببێتە دەردی سەرباری دەدران و ئەوەندەی دیکە تووشی کێشەم بکا. بیر لەوە کردەوە، کە دەبێ زۆر بەپارێز بم، چونکە لەم وڵاتەدا هەر هەنگاوێک و تەڵەیەکت بۆ نراوەتەوە.

لەوە دەترسام تووشی کاری نەکردە بم، ئەگینا خۆ ژیان بۆ ترس نابێ، بەڵام نەمدەزانم ئەو کێشەیە چۆن چارەسەر بکەم و بە چ ناو و بیانووەک لە ماڵی ئەو ژنە بڕۆم.

پاش بیرلێکردنەوەیەکی زۆر هاتمە سەر ئەوەی نەخۆشیی و بێتاقەتیی خوشکم بکەمە بیانوو و بڵێم ناچارم بۆ ئەوەی سەرانسۆی میراتەکەی بابم بکەم،

دەبێ ماوەیەک لە مەهاباد بم؛ جا بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکەشم کاک هاشمی کاکەزادەم کە ئەودەمی بە سەڵتی دەژیا، لە کارەکە وەردا. بابەتەکەشم بە تێروتەسەلی بۆ مەحبووبەخانم ڕوون کردەوە، پێشم کوت کە بە ڕاستی نارەحەتم لەوەی ماڵەکەی بەجێ دێڵم. ئەو ژنە میهرەبان و وەفادارە زۆر نارەحەت بوو. بۆ سبەینێ، بە یارمەتیی کاک هاشم کەلوپەلی ماڵەکەمم لە پیکەبێک بار کرد و بە دڵێکی پڕ لە خەم و پەژارەوە، ماڵاواییم لە ماڵی مەحبووبە خانم و کچەکانی کرد. شتومەکم لەماڵی کاک هاشمدا بە ئەمانەت دانا و بۆخۆم بۆ ماوەیەک، سەفەری شومالم کرد.

چوومە گەراجی ئیتمینان لە شەقامی حەسەناباد. بەرێوەبەری نووسینگەی گەراجەکە، کاک محەمەد ڕەسووڵ سەرسوور بوو. لە کۆنەوە یەکترمان دەناسی. پیاوێکی سەربەگێچەڵ بوو، بەڵام گەرموگوڕ و وەفادار و لە دۆستایەتیدا شیاوی پشت پێبەستن و لێبوردە و زۆریش جوامێر. سەڵت بوو. وەک بزانم تا مردیش ژنی هەر نەهێنا و هەر بە زگورتی مرد. خوا لێی خۆش بێ. میراتگریشی نەبوو. نتازانم میراتەکەی بەکێ گەیشت. هەڵبەت خەڵکی لای خۆمان کە لە تارانێ دەژیان، بە هیممەتی کاک هاشمی کاکاغازادە کۆڕێکی پرسەیان لە ماڵی کاک هاشم بۆ پێک هێنا و فاتیحایان بۆ دادا.

یادی بەخێر و ڕۆحی شاد بێ. ئای چەندە غەریب و بێکەس ژیا و ژەندەش غەریبانە مرد. ئەو لە کۆتایی تەمەنیدا وازی لە بەرێوەبەریی گەراجەکە هێنا و کاری سەرپێیی و ئازادی دەکرد. هەر ئەودەمی هاتە لای من و من سکاڵایەکم

لەسەر کۆمپانیای بیمەی ئێران بۆ تۆمار کرد، بەڵام پێش ئەوەی هیچ ئاکامێکی لێ وەرگرێ، کۆچی دوایی کرد و پەڕاوەکەش بەسترا. من زۆر بیرەوەریی خۆش و شیرینم لێی هەیە، بەڵام چونکە نەمـاوە، لە گێڕانەوەیـان خۆ دەبوێرم.

ئیتر، کاتێک چوومەوە نووسینگەی گەراج، پاش سڵاو و ئەحواڵپرسی، کاک حەمە ڕەسووڵ گوتی، چۆنە سەرت لێ هەڵێناین؟ گوتم دەمەوێ بچمە شــومال و لە هەوای گەرمی هاوینی تارانێ دوور بکەومەوە. گوتی کاری باش دەکەی، خۆزگە منیش توانیبـام لەگەڵـت بێم. بچووە چالووس، ماشێنیش ئامادەیە. بلیتی بۆ بڕیم، نیو سەعات دواتر بەرەو شــومالی ســەوزەڵان وەڕێ کەوتم. یەکەم جارم بوو بە جادەی چالووســدا دەڕۆیشــتم. چەندی ماشــێنەکە لە تاران دوورتر دەکەوتەوە، ســروشــتەکە جوانتر دەبوو. کە گەیشــتینە دارســتانەکانی نزیک چالووس، ئیدی سەرم لە سروشتی پەرجووئاسای ئەوێ ســوور ما. بەڕاســتی حەیفە یەکێکی لە ئێرانێ بژی و ساڵێ جارێک نەچێتە شومال. کە گەیشتمە چالووس و لە ئۆتوبووس دابەزیم، لە میوانخـانەیەکی نزیـک چۆمەکە هۆدەیەکم بەکرێ گرت. چـالووس ســەرەڕای ئەوەی شـارێکی بچووک بوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی لە جەنگەڵ و دەریـا نزیـک بوو، لە ڕادەبەدەر خۆش و دڵگر بوو. مەودای نێوان چالووس و نەوشەهر زۆر نەبوو. شەوێک لە چالووس مامەوە و چوومە نەوشەهر و لە دەم دەریای

شـینی بێ بن، کۆخێکی خۆشـم بەکرێ گرت کە بە حەسـیر هەڵبەسترابوو.

دیتنی دەریای شـــین و بێ بن و گوێگرتن لە خرۆشـــی شەپۆلە بەلرفەکانی دەریا لەڕادەبەدەر خۆش بوو. سەرەڕای ئەوەی مەلەکردن لە دەریای شـــومالدا بەهۆی شـــەپۆلی بەردەوام و بەلرفە زۆر خۆش نەبوو، بەڵام من تەقریبەن ڕۆژ تا ئێوارێ یان لە نێو شـەپۆلاندا بووم، یان لەسـەر لمی کەنـار دەریـاکە پـاڵ دەکەوتم. نـانی نیوەڕۆم لە پۆلاژێکی کەنار دەریا دەخوارد. پلاوماسی، بە ترشیاتی سیرەوە لەو کەشـــە کراوە و دڵبزوێنەدا و لە نێو قریوەی ژن و پیاوی مەلەکەردا زۆر خۆش بوو. پیاســـەی شـــەوانەی کەنار و چاوبڕینە دەریای تار و بە ڕواڵەت ئارام، دەیخســـتمەوە بیر بزۆتە و مێردەکانی بادکوبە. خواردنی باش و هەوای خۆش و ئـاوی شـــیلەوتێنی دەریـای قەزبێن، ڕۆحی تەواو گەشاندبوومەوە. سەرەڕای ئەوەی تەنیا و بێ هاودەم بووم، بەڵام یاریی تێنس و ئەو هەمووە خەڵکەی ئەوێ، قەرەبوویان کردبۆوە. ئاخری ڕۆژی بیستەمی گەلاوێژ ئەو ژینگە خۆش و باســـفایەی شـــومالم بەجێ هێشـــت و بەدڵێکی خۆش و گەشەوە گەڕامەوە تاران.

هەڵبەت پێش ئەوەی بچمە شـــومال، تەگبیرێکم بە کاک هاشمی کاکاغازادە کردبوو و قەول وابوو لەگەڵ سولەیمانی شـــافعی کە لە شـــەقامی ڕوودەکی دوو هۆدەی بەکرێ گرتبوو، ببمە هاوماڵ و ئەویش ڕازی بوو. هەر بۆیە، لەگەڵ گەیشتمە تاران، چوومە لای کاک سولەیمان، هەر ئەو ڕۆژە کەلوپەلەکانم هێنایە ئەوێ و کاک هاشم زۆرم پێوە ماندوو

بوو. ناوبراو دوو هۆدەی لە نهۆمی دووەمی بینایەک بەکرێ گرتبوو. خاوەنماڵ فەرمانبەرێک بوو لەگەڵ ژنەکەی و دوو منداڵی لە هۆدەی خوارەوەدا دەژیان. بۆ ئەوەی خاوەنماڵ نەیکاتە کێشە کە بۆچی کرێچییەکەی بوونەتە دوو کەس، بیست تمەنمان لە کرێیەکەی زیاد کرد. ئیتر کرێی مانگانەمان سەد و بیست تمەن بوو. کاک سولەیمانی شافعی گەنجێکی زۆر بەئەدەب و خاکەڕا بوو، زۆربەی کاروبارەکانی ماڵەوەی دەکرد. پاش نیوەڕۆیان کە نەدەچوومە کۆلێژ، لە تەواوی کارەکانی ماڵەوەدا یارمەتیم دەدا. تەنانەت پێکەوە چێشتیشمان لێ دەنا. ئاغای شافعی گۆشتاوێکی زۆر خۆشی لێ دەنا. منیش لە سۆڤیەت فێری هێندێ خواردن ببووم، یەک لەوان برویش بوو، کە فێرم کرد. مرۆڤێکی هێمن و کەمدوو بوو. شتێکیم زۆر بەدڵ بوو، ئەویش ئەوەی کە هەر دووکمان بەوپەڕی ئاسوودەیی خەریکی خوێندنەوە دەبووین. ئەویش خوێندکاری کۆلێژی پەروەردەی مامۆستایان بوو. حەوت مانگێک پێکەوە بووین. لەو ماوەیەدا تاقە گلەییەکیش چییە لێیم نەبوو. هەر بە ڕاستی چێژیشم وەردەگرت کە لەگەڵی بووم. مخابن پاش ئەوەی گەڕایەوە مەهاباد، لە تەقینەوەیەکی کوورەخانەدا لەگەڵ دوو برای دیکەی مردن. خوا لەو سێ برایە خۆش بێ.

# ژنهێنان

سـەرەتای دووەم سـاڵی خوێندنم لە کۆلێژی یاسـا، سـەرەڕای ئەوەی هاوماڵی کاک سـولەیمانی شـافعی بووم، هۆدەیەکم لە "کووی دانشـگا" پەیدا کرد. گەڕەکی خوێندکارانی زانکۆ (کووی دانشـگا) لەوسـەری شـەقامی ئەمیراباد تا بلێی شـوێنێکی باش بوو. ڕسـتوڕانتێکیشـی هەبوو، کە خواردنی بـاش و هەرزانی بە خوێندکارەکان دەفرۆشـت. سـەرەڕای ئەوە، چونکە زۆر پێویسـتیم بەو هۆدەیە نەبوو، دام بە کـاک ئیبراهیمی ئەبریشـەمی، کە خوێندکاری پزیشـکیی ددان بوو. من بەیانیان دەچوومە کۆلێژی یاسا. حەفتەی جارێکیش بۆ ئیمزای دەفتەری هاتوو و ڕۆیشـتوو، سـەرێکم لە وەزارەتی کار دەدا. لەسـەر یەک خراپم بۆ نەدەگوزەرا. هاوماڵێکی باشـم هەبوو. بە مووچەی مانگانەشم بەڕێ دەچووم.

ڕۆژێکیـان، نـامەیەکی خوشـکەزاکەمم بۆ هـات، کە هاوسـەری کاک سـەدیق گەرمیانی بوو. نووسـیبووی، بە هۆی کچەکـانییەوە، کچی بنەمـاڵەیەکی نەجیبیـان بۆ دۆزیومەتەوە کە شـووم پێ بکا. کچەش چۆنی لێی بڕوانی، بۆ من گونجاوە. وێنەیەکی کچەشی بە جلوبەرگی کوردییەوە بۆ ناردبووم. کچە، خاتوو حەلیمەی ئیفتیخاری، کچی سـەید حەمەدەمین ئیفتیخاری بوو. خوشـکەزاکەم نووسـیبووی، زوو بچمەوە بۆ مەهاباد و وێنەیەکی خۆشـمی بۆ بنێرم. مەسەلەکەم بۆ برادەر و هاووڵاتییەکانم باس کرد. هەموویان پێیـان بـاش بوو. لەو نێوەدا کـاک حەمەدەمین خـاتەمی،

بەرپرسی فەرمانگەی ناسنامەی مەهاباد کە ئەودەمی لە تاران بوو، گوتی: کاک سەید ئەحمەدی ئیفتیخاری، برای ئەو خانمە هاوکارمانە لە ئیدارە، خوا هەڵناگرێ لەو خێزانەدا ئەو کچەیان لە هەموویان شیاوترە. پاش ئەو لێکۆڵینەوە و تەگبیر و ڕایە نامەیەکم بۆ خوشکەزاکەم نووسی و بۆم ڕوون کردەوە کە ئێستا بە هیچ شێوەیەک پێم ناکرێ بچمەوە مەهاباد. ئیتر وێڕای دەربڕینی ڕەزامەندیی خۆم، وێنەیەکمم بۆ نارد. بۆشم نووسی کە وەکالەتنامەیەک بۆ کاک سەدیق گەرمیانی دەنێرم و چۆنتان پێ باش بوو وا بکەن. هەڵبەت لەبەر ئەو شتەی هاوینێ پاش دیدارەکەی سەید ڕەسووڵی بابی گەورە بەسەرم هاتبوو، نەمتوانی بچمەوە مەهاباد. وەکالەتنامەکەم لە نووسینگەی بەڵگەنامە فەرمییەکان، بۆ ئاغای گەرمیانی نووسی و بۆم ناردەوە و کردم بە وەکیلی خۆم و نووسیم پاش مارەکردنەکە، لە ڕۆژانی نەورۆزێدا دێمەوە مەهاباد.

سێبەری نەگریسی دەزگای سیخوڕیی ڕوکنی ۲، بوو بە هۆی ئەوەی من بەبێ ئەوەی هاوسەری داهاتووم لە نزیکەوە ببینم و لەگەڵ تایبەتمەندییە ئەخلاقی و خێزانییەکانی یەکتر ئاشنا بین، ملم بۆ زەماوەندەکەمان کە گرینگترین ڕووداوی ژیانی مرۆڤە، ڕاکێشم.

بە پشتیوانیی خودا، قۆڵم لێ هەڵماڵی. هەڵبەت وەک پێشتریش گوتبووم، ئیدی پێم باش نەبوو ژنهێنانەکەم لەوە زیاتر وەدرەنگی بکەوێ، چونکە لەو بابەتەدا تەنیا

مەسەلە کچ و کوڕەکە نین، بەڵکوو چارەنووسی زەماوەندەکەشت کە منداڵخستنەوەیە دەبێ لەبەر چاو بێ. کەچی ئاواش باوەڕم وابوو پیاو کاریگەریی زۆری لەسەر پەروەردەی هاوسەرەکەی و خەملاندن و بەهێزکردنی کەسایەتیی ئەو و وەدیهێنانی تایبەتمەندی و شێوازە ئەخلاقییەکاندا هەیە. لە مانگی خەزەڵوەردا قەباڵەی نیکاح و مارەبڕینەکەیان بۆ ناردم، ئیدی سووک و سانا بەبێ ئەوەی بۆخۆم لەوێ بم، ژنم لێ مارە کرا و بوومە خێزاندار.

ئەو زستانە هەر خەریکی دابینکردنی شتومەک و کەلوپەلی ماڵ بووم و بەو وردە پاشەکەوتەی کردبووم، هێندێ کەلوپەلی چێشتخانە و فەرشێک و کۆمەڵێک وردە شتی دیکەم کڕی. ئینجا هەوڵم دا شوێنێکی گونجاویش بۆ ژیانی داهاتوومان بدۆزمەوە. ئاخری لە ماڵی کاک هاشمی خەلیل زادە دوو هۆدەم لە نهۆمی سەر عەرزی بە مانگێ ۱۲۰ تمەن بەکرێ گرت و ماڵم گواستەوە. دوو ڕۆژ پێش جێژنی نەورۆزی ساڵی ۱۳۳۷، گەڕامەوە مەهاباد.

لە مەهاباد لەپێشدا چوومە ماڵی بەڕێز گەرمیانی. لەوێ بە تێروتەسەلی باسی مارەبڕین و شتەکەیان بۆ کردم. ئەوجار لەگەڵ یەکێک لە کچەخوشکەکانم هەستام بەڕێی ماڵی دەسگیرانم کرام. دڵم دەیکورکاند و خورپەی بوو. نەکا من ئەوم بەدڵ نەبێ، یان ئەو منی نەکەوێتە بەر دڵ؟ ئای چ نەگبەتی و بەڵایەک دەبێ. یان نەکا چاوەڕوانیی وای لێم هەبێ کە بۆم هەڵنەسووڕێ. هەر لە زووەوە دەمناسین. لە زەماوەندی کاک سەید قادری براشی لەوێ بووم.

دەرگای ماڵەکەیان لەسەر پشت بوو. ژنێکی کورتە باڵای سەروڕووخۆش لەبەر دەرگا بوو. دادە مریەم بوو، دایکی دەسگیرانم.

لە دەرگامان دا و وەژوور کەوتین. ئەوەندە بە گەرموگوڕی و سەروڕووخۆشی پێشوازیی لێ کردین، دەتگوت ساڵانێکە دەمانناسێ. زۆر زۆر هێور بوومەوە. فەرمووی کردین بۆ ژوورێک کە دەیڕوانییە حەوشە. کاک سەید حەمەدەمین، واتە خەزوورم، بەتەنێ لە ژووری دانیشتبوو و دیار بوو لەوێوە لە کارکردنی خێزانی دەڕوانی. سڵاومان کرد. لەبەرمان هەستا و لە ئامێزی گرتم و ماچی کردم. چاوم پڕ بوون لە ئاو. دەمێک بوو خۆشەویستیی باوکانە و دایکانەم نەدیتبوو. ناردیان کاک سەید قادر، براگەورەکەی دەسگیرانمیان بانگ کرد، کە ماڵەکەی جیا بوو. تەواوی بنەماڵەکەیان کۆ بوونەوە. دار و دیوار خۆشی و سادەیی و پاکیی لێ دەباری. دەسگیرانم چای بۆ هێنام. یەکەم جار بوو دەمدی. هەردووکمان لە شەرمان سوور هەڵگەڕاین.

ئەوەندە خۆمانە لەگەڵم هەڵسوکەوتیان کرد، کە ئیدی هەرچی نیگەران و دڵەڕاوکێم بوو ڕەوییەوە. نانی نیوەڕۆش لەلای ئەوان مامەوە. دڵپاکی و گەرموگوڕیی خەسووم و سادەیی و بێ کرێژیی خەزوورم، ئارامییەکی پێ بەخشیم لە تاریف نایە. هەر لەوێ شوکرانەی خوام بەجێ هێنا کە لە نەبوونی خۆشمدا، ئەو نیعمەتەی پێ داوم. دەتگوت ڕۆژگار خەریکە ئەو خراپانەی لەگەڵی

کـردووم، قەرەبـوو دەکـاتەوە. ئەگەرچـی بەو ئـاکـامە گەیشـتبووم کە ڕۆژگـار دوژمنـایەتیی لەگەڵ هیچ کەس نییە. هەرچی بنیادەم دەیبینێ و بەسـەری دێ، بەرهەمی کردەوەی خۆیەتی و ئەوە بۆخۆیەتی کە بەدەسـتی خۆی خۆڵ وەسـەر خۆی دەکا یان کۆشـکی بەختەوەریی خۆی دادەمەزرێنێ. بۆ سـبەینێش هەر لە ماڵی دەسـگیرانم بووم. مریەم خانی خەسووم، سەرەڕای وردیلەییەکەی، دەمڕاست و قسـەڕۆیشـتووی ماڵەکە بوو. پێم گوت ئێسـتا من لە خزمەتی ئێوەدام، جا چ دەفەرمووی، لەسەر چاومی دادەنێم. گوتی تۆ لەجێی کوڕەکانمی و چیت پێ خۆشـە ئەوە بکڕە. یەک دوو دەست جلوبەرگ و چەند سکەیەکی زێڕ بەسە.

چوومە لای کاک سـەعید پیرانی و دانیالی سـەوفەیی بۆ کڕینی قوماش و زێڕ. هەردووکیان کۆنە هاوڕێ و هاوپۆلم بوون. هەموو شـتێکیان لەبەر دەسـت نام. کاک سـەعید بە کۆڵێک قوماشـەوە هاتە ماڵی دەسـگیرانم، بۆ ئەوەی کامیانی بەدڵە ئەو هەڵبژێرێ. خوا هەڵناگرێ مریەم خانم نەیهێشـت خەرجی زیادە بکرێ و بە چەند دەستێک جلی کوردی ڕازی بوو.

دانیالیش، بەبێ ئەوەی هیچ پووڵێکی بدەمێ، هێندێ زێڕی بە قەرز دامێ و پێشکەشـی دەسـگیرانم کردن. لەو ماوەی ژیانەمدا جگە لە خۆشەویستی و میهرەبانی، هیچ شتێکم لەو مریەم خـانمە نەجیب و بەڕێزە نەدی. وەهـا کەوتبووە بەر دڵم، کە وەکوو دایکی خۆم خۆشم دەویست، تا ئەو ڕۆژەی لەسەر دنیایێ بوو، ئەویش لە خۆشەویستی و ڕێز بەولاوە هیچی لە من نەدی. ئای کە چەندە میهرەبان بوو، نەک هەر

لەگەڵ من بەڵکوو لەگەڵ هەموو منداڵ و نەوەکانیشـــی هەر وا بوو. هەتا ئەو ڕۆژەی ژیا، ســەفا و گەرموگوڕی لە ماڵەکەدا هەبوو، بەڵام لەگەڵ ڕۆیشتنی ئەو، هیچ شتێک نەما و بنەماڵەکە لێک هەڵوەشـــا و پەرتەوازە بوون. ئەو هەودای پەیوەنـدیی نێوان هەموویـان بوو. حەیفێ ئەو هەودایە پچڕا. ئەی ڕۆحت شاد بێ ژنی دڵ و دەروونپاک. ئەو باب و دایکە فریشـتەیە، هەر وا چوون. ئێمە ماینەوە لەگەڵ بارێکی قورسی خەم و پەژارەوە.

ئیتر ئەو خێزانە نەجیبە، بەوپەڕی ســادەییەوە و بەبێ هیچ دابودەســـــتوورێکی زەماوەند و بەبێ هیچ کۆت و بەندێکی کۆمەڵایەتی، دەسـتی کچەکەیان لە دەسـتم نا و لەگەڵ خزمێکی خۆیـان بەڕێی تـارانیـان کردمەوە. ماشـێنێکم گرت تا مەراغە و لەوێشـەوە بە شـەمەندەفەر چووینە تاران و چووینەوە ئەو ماڵەی تازە گرتبووم.

لە سەرەتای بەهاری ساڵی ١٣٣٧ــــی هەتاویدا، ژیانی هاوبەشـمان دەسـتی پێ کرد. پێکهێنانی خێزان یەکێکە لە پرســـە هەرە گرینگەکان. بەبێ خێزان، کۆمەڵ بەردەوام نابێ و خۆناگرێ.

ڕووسـەکان بڕوایان وایە، دوو شـت لە ژیاندا تۆبزییە و کەس نـاتوانێ لێیـان ڕا بکـا، یەکێکیـان مەرگە و ئەوی دی زیندان. بەڵام بە ڕای من، ژیانی هاوبەشیش سێیەمین بابەتێکە، کە ناتوانی خۆی لێ ببوێری.

من ســـی و شـــەش بەهـاری عومرم تێپەڕانـدبوو و بەهـارێکی نوێم لەبەردەم بوو. بەدەردی زۆر کەســـــان، بەهـاری گەنجیەتی و هەتـاوی لاوی لەئـاوابوونێ بوو و

شـــەپۆلی بەلرفەی دڵخۆشـــی و گەشـــی و ســـەرەڕۆیی لە دامرکانەوە بوون و لە دەریای بێدەنگ و هێمنی پیری نزیک دەبوونەوە. بەڵام من خۆم بڕوام وابوو گەنجیەتی لە سەرەتادا لەگەڵ سەرخۆشی و نەزانی و شێتییەکاندایە، تەنیا پاش سی ساڵییە کە گەنج بە ڕاستی دەزانێ خۆشی و جوانی یانی چی.

فەرەنسییەکان، بە پیاوێکی چل ساڵان دەڵێن، پیاوێکی گەنج. جا لەوێ ئەو جۆرە پیاوانە زۆر پەسندن. چونکە لەو تەمەنەدا پیاو ســـاردی و گەرمیی ڕۆژگاری چێشـــتووە و وازی لە سەرسەریەتی و هەڵە و بزۆزی هێناوە و لە ڕاستیدا بووەتە پیاوی ماڵ و ژیان.

ئیتر بەهار بوو. بە ڕاستی بەهار و پاییزی ئەودەمی تاران، زۆر خۆش بوو. ئیمتیحانی کۆتایی ســـاڵ وەختیان هاتبوو. من زۆر خەریکی خوێندنەوە بووم. پاش کۆتایی تاقیکارییەکان و دەسپێکی گەرما، پانزە ڕۆژێک لە مانگی پووشپەڕ تێپەڕیبوو، کە لەگەڵ خێزانم چووینەوە مەهاباد و لە ماڵی بابی ماینەوە. لە سایەی سەری کاک قادری ئیفتیخاریی ژنبرام و کاک دکتۆر مســـتەفا ئەعلەمی ئاوڵزاوای بەڕێزیانەوە، کە هەر لەکۆنەوە یەکترمان دەناسی، زۆر خۆشم لێ گەوزەرا و لە کۆتاییەکانی مانگی خەرماناندا گەڕاینەوە تاران.

## کاری ویزیتۆری

لەگەڵ دەسپێکردنەوەی سێیەم ساڵی کۆلێژی یاسا، ژیانم بەبێ نیگەرانی و ئارام تێدەپەڕی. بەڵام وردە وردە پاشەکەوتەکەم لە کەمیی دەدا. هەستم دەکرد بە مووچەی ٢٤٠ تمەن کە ١٢٠ تمەنی بۆ کرێی خانوو دەڕۆیشت، ژیان ئەستەم دەبێ. بەتایبەتی کتێب و دەفتەر و خەرجی هاتوچۆی کۆلێژیش قورساییەکی دیکە بوون. بۆیە کەوتمە بیری ئەوەی کارێکی پاشنیوەڕۆیان پەیدا بکەم. هاوسەرەکەم دووگیان بوو و پێویستی بە خواردنی باشتر بوو. ماوەیەک بوو دکتۆر عەلی مەولەوی لە شەقامی ڕوودەکی کلینیکی کردبۆوە. ناوبراو سەردەمانێک قوتابیی خۆم بوو. جا چونکە کلینیکەکەی زۆر لە ماڵی من دوور نەبوو، جاروبار دەچوومە سەردانی. دەیزانی قۆناغی سێی کۆلێژی یاسا دەخوێنم.

ڕۆژێکیان باسی بێکارییەکەی دوانیوەڕۆیانی خۆمم لەگەڵ هێنایە گۆڕێ. زۆری نەبرد کارێکی بۆ دۆزیمەوە. یەکێک لە ئاشناکانی بە ناوی ئاغای برومەند لە شەقامی باب هۆمایۆن کەلوپەلی تەندروستی و پزیشکیی جانسۆن ئەند جانسۆنی دەفرۆشت، جا چونکە بۆخۆی لە شارەکانی دیکە خەریکی کاری ویزیتۆری بوو و نەیدەپەرژا دووکانەکەی هەڵسووڕێنێ، پێویستی بە یەکێک بوو بۆی بەڕێوە ببا. دکتۆر مەولەوییش منی پێ ناساندبوو. ئاغای برومەند پیاوێکی خوێندەوار و زۆر تێگەیشتوو و بە نەزاکەت بوو. بە مانگی سێسەد تمەن

لەلای دامەزرام، ئیدی کلیلی دووکانەکەی ویدام و فێریشی کردم دووکانەکە چۆن هەڵسووڕێنم. منیش دوانیوەڕۆیان پاش ئەوەی لە کۆلێژ دەهاتمەوە، هەر نانێکم دەخوارد دەچوومە سەر دووکان و کەلوپەلەکانم هەمووی بە وەسڵ و پسوولە دەفرۆشت بەو کڕیارانەی کە زۆربەیان خاوەن دەرمانخانەکان بوون. سەعات شەشی ئێواریێ دووکانم دادەخست و دەچوومەوە ماڵێ. ئاغای بروومەند زۆربەی کات دەچووە شارەکان بۆ ئەوەی کەلوپەلەکانی بناسێنێ و بانگەشەیان بۆ بکا و من بەجێی ئەو هەموو کاروبارەکانی دووکانەکەم دەکرد و داهاتی فرۆشەکەشیم دەخستە سەر حیسابەکەی خۆی لە بانکدا و کاڵای پێویستیشم وەردەگرتەوە. کەلوپەلی دووکانەکە بریتی بوون لە پۆدرە و لۆسیۆن و سابوونی منداڵ و کەلوپەلی پزیشکی و ژنان. وردە وردە تەواو لەو کارە شارەزا بووم. ئیدی کە لەکاری دووکان سەرم سووک دەبوو لەوێ دەرسەکانیشمم دەخوێند. لە ڕاستیدا دووکانەکەی ئاغای بروومەند بۆ من هەم سەرچاوەی داهات و هەمیش شوێنێکی بێدەنگ بوو بۆ خوێندن.

لە کۆتاییەکانی زستانێدا خودا کچێکی پێ بەخشیم. لە شانسی ئەو منداڵە، هەرچی پێویست بوو لەلامان دەست دەکەوت و لەبەر دەست بوون.

## ئایەتوڵڵا سەنگەلجی

سـێیەم سـاڵی کۆلێژم خەریک بوو تەواو دەبوو. مامۆسـتاکان هەموو بیرمەند و هەڵکەوتە بوون. جەنابی دکتۆر مەتینی دەفتەری وەزیری پێشـووی داد، جەنابی دکتۆر حەسـەنی ئیمامی پێشنوێژی تاران، جەنابی دکتۆر عەلیابادی دادئەسـتێنی گشـتی، جەنابی دکتۆر هیدایەتی وەزیری پێشـووی داد، جەنـابی دکتۆر پـاد و دکتۆر بـاهێری و ئـایەتوڵڵا محەمەد سـەنگەجی و جەنـابی مشکوهـ ئەوانە مامۆستای کۆلێژی یاسا بوون. هەڵبەت زۆر بە زحمەت نمرەی باشـیان بە خوێندکار دەدا، بەڵام لە هەموویان ڕژدتر و مست قووچاوتر، ئاغای سەنگەجی بوو. خوێندکار بۆ وەرگرتنی نمرە دەچوونە ڕەواق[1] یان ماڵەکەی. ڕەواقەکەی، تەنیا شـەوانی هەینی کراوە بوو. بەڵام بەشـی دەرەوەی ماڵەکەی کە کەوتبووە سـەر شـەقامی مۆنیرییە، هەموو ڕۆژێ شـوێنی میوانداری و پێشوازی لە سەردانکەران بوو. خوێندکارەکان، کاروباری خزمەت و پێشـوازیی ئەو بەشـەیان هەڵدەسـووڕاند. کۆمەڵێک خوێنـدکاریش هەموو ڕۆژێ دەچوونە ئەوێ. منیش لە سـێیەم سـاڵی خوێندنمدا دوو جار چووم. لە جاری دووەمم بیرەوەرییەکم لەبیر ماوە، کە خراپ نییە

---

[1]. هۆدە یان هەیوانێک، کە پیاوی ئایینی بۆ چاوپێکەوتنی شوێنکەوتووەکانی یان بەڕێوەبردنی کاروباری خۆی لێی دادەنیشێ. وەک تەکیەی شێخان.

بۆتـــان بگێڕمەوە. من لە خوارووی مەجلیس و لەبەر دەرگـــاکەوە دانیشـــتبووم. ئـــایەتوڵڵا ســـەنگلەجی لەلای ســـەروو و چەند کەســـێکیشـــی لە دەوری دانیشـــتبوون. یەکێک لەوانە ژەنیاری بەناوبانگی ڤیۆلین ئاغای کەســـمایی بوو. بە دەم قســـەکردنەوە لە ئاغای کەســـمایی پرســـی، قوربـــان لە ڕۆژنـــامەدا خوێنـــدمەوە گۆیـــا لە مۆزەخـــانەی ئەســـتەنبوڵ لە تورکیا نووســـراوێک هەیە، دەڵێن نووســـینی پێغەمبەرە و لەوانەیە دەســـتوخەتی ئەو بێ. ئینجـــا تـــاڵە مووەکیش گۆیـــا ئی ئەوە لەوێیە. جـــا ئەوە کـــاری من نییە باسی ئەو شتانە بکەم، بەڵام لەسەر دەستوخەتەکە شتی وا ڕاســـت نییە. لەبەر ئەوەی تەواوی ئەو نامەگۆڕینەوانەی لە سەدری ئیسلامدا لەگەڵ وڵاتان هەبووە، یان بە مۆری عەلی کوڕی ئەبیتالب بووە یان عومەری خەتاب یان ئەبوبەکری ســـدیق. هیچ نووســـینێک نەبووە بەدەســـتوخەت و مۆری حەزرەتی ڕەســـووڵ. ئاغای کەســـمایی پاش پرســـیی قوربان ئەبوبەکری ســـدیق؟ گوتی بەڵێ لەقەبی ئەبووبەکر، ســـدیق بوو و هەر بە ڕاســـتیش ڕاســـتگۆ بووە. هەڵبەت ناوبراو ئەو قســـانەی لەنێو کەســـانێکدا دەکردن، کە هەموویان شـــیعە بوون. ناوبراو لە پۆل و لە هەموو شـــوێنێک، بەبێ ڕووبینی بیروبۆچوونی خۆی دەردەبڕی.

ئیتر ئیمتیحانات دەســـتیان پێ کرد و ســـاڵی ســـێیەمی کۆلێژم سەرکەوتوانە بەڕێ کرد.

# هاوینی ساڵی ١٣٣٨

لە مانگی جۆزەردانداە بڕیارێک لە کارگێڕیی وەزارەتی فەرهەنگەوە گەیشـــتە دەســـتم، کە بە گوێرەی بڕیارەکە مووچەی مانگانەم لە ١٤٠ تمەنەوە کرابووە ٣٦٠ تمەن. لە ســـایەی خوداوە ڕۆژ بە ڕۆژ ژیانم باشـــتر و هێمنتر دەبوو، جا چونکە هیچ چاوەڕوانییەکم لە ژیان نەبوو، ڕۆژەکانی تەمەن وەکوو ڕووبارێکی مەند وا بوون.

لەگەڵ بەســـەرداهاتنی هاوین و دەســـپێکی وەرزی گەرما، ئێواران پاش داخســـتنی دووکان و چوونەوە بۆ مـــاڵێ، لەگەڵ خێزانم و کچە چکۆلەکەم دەچووینە لای باڵەخانەی پیپسی.

لەو دەوروبەرانە تەنانەت خانووەکیشـــی لێ نەبوو. ئەوێ سـەیرانگا بوو. ئێمە سـەیری بوتڵە پیپسـییەکانمان دەکرد، کە دەتگوت سەربازی وردیلەن ڕیزیان بەستووە و دەڕۆن پڕ دەبن و لەبەرچاوان ون دەبن. هێندێ شەوان عەمباراوی ماڵێم پڕ دەکردەوە لە ئاو. چونکە ئەودەمی تاران ئاوی بۆ ڕانەکێشـرابوو و خەڵکەکە ناچار بوون بە نۆرە بەری ئـاوی جۆگەکە بگرن و بیهێننە ســـەر عەمباراوی ماڵەکەیان و بۆ خواردنەوە و چێشـــتلێنان و پاکوخاوێنی بەکاری بێنن.

ئیتر منیش چونکە لە دووکانەکەی ئاغای بروومەند خەریکی کـار بووم، دەرفەتم نەبوو خۆم لەگەرمـای هاوینانی تاران بدزمەوە. ناچار هاوســـەرم و کچەکەمم ناردەوە مەهاباد و بۆخۆم بەتەنێ لە تارانێ مامەوە. ئیدی

ئەو هاوینە بەیانیان و دوانیوەڕۆیان دەچوومە دووکان. جا چونکە لەوێش سەرقاڵ دەبووم و لەگەڵ دووکاندارەکانی دەوروبەریشم ببوومە دۆست، ئەوێم خۆشتر بوو. مانگی خەرمانان، حەفتەیەک ئیزنم لە ئاغای بروومەند وەرگرت و چوومەوە مەهاباد. پاش سەردانی دۆست و خزمان چەند ڕۆژێک گەڕام و پشووم دا و لە کۆتایی خەرماناندا گەڕامەوە تاران. هاوین تەواو ببوو. وەرزەکانی ساڵ بە دووی یەکدا دەهاتن و ڕادەبردن و هەر ڕۆژ بەشێک لە تەمەن کەم دەبۆوە. سەرەڕای ئەوەی دەشمانزانی، بەڵام بۆخۆشمان پەلەمان لە تێپەڕینی ڕۆژەکان بوو. بە ئاواتەوە بووم هاوین تەواو بێ و خوێندنەکەم تەواو بکەم و... ئاواتی تیژتێپەڕینی مانگ و ساڵ نەدەبڕانەوە. هەرچۆنێک بێ خوێندن دەستی پێ کردەوە. هیوادار بووم دوا ساڵی کۆلێژی یاسام بەخۆشی تێپەڕێنم. پاییز بوو. من پاییزی تارانم لە هەموو وەرزێکی پێ خۆشتر بوو. لەو ڕۆژانەدا بوو کە ئاغای بروومەند و کۆمپانیای فەیرووز کێشەیان لێ پەیدا بوو و وای لێ هات کۆمپانیای فەیرووز کاڵاکانی جانسۆنی پێ نەفرۆشت. ئیدی کار گەیشتە دادگا و سکاڵا.

لە ئاکامدا ئاغای بروومەند ناچار بوو دووکانەکەی دابخا. منیش ئیدی لەوێ کارم نەکرد، بەڵام دۆستایەتیی من و ئاغای بروومەند بۆ هەتاهەتا بەردەوام بوو. من لە کڕین و فرۆشتنی داودەرمان و کەلوپەلی پزیشکیدا تەواو شارەزا ببووم و دەمتوانی بۆخۆم خەریکی ئەو کارە بم. ئینجا خەڵکێکی زۆر لە شەقامی ناسرخوسرەو خەریکی ئەو کارە بوون. بەڵام من دوایین ساڵی زانکۆم بوو و پێویست بوو

زۆر شێلگیرانە و لێبڕاوانە دەرسەکانم بخوێنم و خۆم لە بازاڕ و کڕین و فرۆشتن نەدەم.

چوارەم سالّی زانکۆ، سالّێکی چارەنووسساز بوو و زەحمەتی ئەو چەند ساڵەمی پێوە بەسترابۆوە. لە مانگی خەزەڵوەردا وەختێک چوومە نووسینگەی وەزارەتی کار، کە دەفتەری هاتوو و ڕۆیشتوو ئیمزا بکەم، سەیرم کرد نامەیەک بە ناوی منەوە هاتووە. نامەکە لە وەزارەتی فەرهەنگەوە هاتبوو. کە نامەکەم کردەوە، سەیرم کرد نامەی فەرمانگەی ژمارەی دووی وەزارەتی دەرەوەیە و بۆ من نێردراوە.

سەیری ڕێکەوتەکەیم کرد، دەبینم نۆ مانگ درەنگتر گەیوەتە دەستم. دڵنیا بووم نامەکە لە وەزارەتی فەرهەنگ ڕاگیراوە و وەدرەنگی کەوتووە. ئیتر وەڵامی ئەو نامەیە بوو کە یەکەم سالّی کۆلێژی یاسا دابووم بە وەزارەتی دەرەوە و داوام کردبوو لە ڕێی باڵوێزخانەی ئێرانەوە، داوای کارنامەکانی ئەو قۆناغانەم بۆ بکەنەوە کە لە باکۆ خوێندبوومن و بۆم بنێرنەوە.

ئێستا کە لە سالّی کۆتایی کۆلێژی یاسا بووم، تازە وەلامەکەم بۆ هاتبۆوە.

هەستام چوومە فەرمانگەی دووەمی سیاسیی وەزارەتی دەرەوە و کارنامەکانی کۆلێژی پزیشکیی بادکوبەم وەرگرتنەوە کە باڵوێزخانەی بەرزی شاهەنشاهی لە مۆسکۆ پشتڕاستی کردبوونەوە. کارنامەکان و پشتگیرییەکان لە کۆلێژی پزیشکیی باکۆ،

پشتڕاست کرابوونەوە. دوا لاپەڕە، پشتڕاستکردنەوەی خوێندنەکەم بوو و بە فارسی دەبووە : (وێنە پەیوەندیدارەکان، لە کۆتایی کتێبەکەدا).

## پشتڕاستکردنەوە

ڕەحمان حەلەوی، کوڕی عەبدوڵڵا ســـاڵی ١٩٤٥ تا ١٩٤٧ لە نـاکۆلدتێی کۆلێژی پزیشـــکیی کۆمـاری ئازەربایجان دەرسی خوێندووە و ساڵی سێیەمی کۆلێژ بەهۆی کاری تایبەتیی خۆیەوە دەستی هەڵگرتووە.

جێگری پەروەردە و ڕاهێنـانی کۆلێژی پزیشـــکیی ئازەربایجان، پرۆفیسۆر بالا کشییەڤ.

هەڵبەت ئەو بڕوانامانە زۆر درەنگ گەیشتنەوە دەستم. ســاڵی چواری کۆلێژی یاســا بووم. بەو جۆرە لە پێشــدا پێویســـت بوو ئەم کۆلێژە تەواو بکەم، دیارە لەو وەختی ســاڵەدا کە لە ڕاسـتیدا کۆتاییەکانی وەرزی خوێندن بوو، دەرەتانی خوێندن لە کۆلێژی پزیشـــکیش نەدەڕەخســـا. جگە لەوەش، دکتۆر حەفیزی کرابووە سکرتێری کۆلێژی پزیشـــکی و باســـم کرد کە چۆن لەگەڵم ڕەفتاری کرد. ئەگەرچی هیچ بیانووەکی دیکەشـــی نەگرتبا، هیچ دوور نەبوو ناچارم بکا لە یەکەم قۆناغەوە بخوێنمەوە. ئیدی شەکەتیی لەڕادەبەدەری نۆ ساڵ زیندانی و خێزانداری و ئەو مووچە کەمەی هەمبوو، نـاچـاریـان کردم واز لە کۆلێژی پزیشـــکی بێنم و هەڵیـانگرم بۆ دوای تاقیکارییەکانی کۆلێژی یاســا. ئیتر ئەوشـتانەی کە دواتر بەســەرم هاتن، تەواو لە خوێندنی پزیشـکی پاشـگەزیان کردمەوە.

## ئەو ڕووداوە سیاسییەی هاتە پێش

ماوەیەک بوو بۆ کرێی خانوو کەوتبوومە زەحمەتەوە. هەر بۆیە لەگەڵ دکتۆر عەلی مەولەوی ماڵێکی دوو نهۆممان لە ئەناری بەکرێ گرت. ئەو لە نهۆمی سەرەوە و من لە نهۆمی خوارەوەدا حەواینەوە. ژیانێکی سادە و ئارامم هەبوو. بە ڕۆژ دەچوومە کۆلێژ و شەوانەش لەگەڵ دکتۆر و منداڵەکانی دەچووینە دەرێ یان لێک کۆ دەبووینەوە. وردە وردە هەستم کرد جەنابی دکتۆر هێندێ بابەت دێنێتە گۆڕێ کە تەواو بۆنی سیاسەتیان لێ دێ و وای دەگەیەنێ کە بەدەم کاروباری پزیشکییەوە، سەرقاڵی چالاکیی سیاسیی نەتەوەییشە. شەوێکیان دراوسێیەکمان زەماوەندی هەبوو. هەردووکیشمانی بانگهێشت کردبوو. سەرەڕای ئەوەی کۆڕێکی زۆر خۆش و شاد بوو، کەچی دکتۆر مەولەوی نەک شاد و بەکەیف نەبوو، بگرە خەمباریش دیار بوو. پرسیم دکتۆر بۆچی وا دڵت گیراوە؟ چی بووە؟ بەسپایی گوتی، لێت ناشارمەوە، شتێک هەیە دەبێ بۆتی باس بکەم. کەسێکیان گرتووە بەناوی دکتۆر عەلی مەولەوی، کە پزیشکیشە. بەڵام دەزانم بە هەڵە ئەویان لەبری من گرتووە. زۆری پێناچێ بەشوێن مندا دێن. ئەگەر سبەی یان هەر کاتێک نەگەڕامەوە ماڵێ، ئەوە دڵنیا بە دەستبەسەریان کردووم. تەنیا داوا و چاوەڕوانییەکم لێت هەیە، ئەویش ئەوەیە ئاگات لە منداڵەکانم بێ و دوای ماوەیەک، بیاننێرەوە ماڵی بابم بۆ مەهاباد. بەڵێنم پێ دا هەر شتێکم لەدەست بێ دەیکەم. گوتم دەی کە دەزانی هەڕەشەت

لەســـــەرە، بۆچی ڕا ناکەی؟ مەگەر نازانی دۆخەکە زۆر خراپە؟ گوتی ناتوانم، چونکە خەڵکێکی زۆر پێوە دەبن. هەر دووکمان لەبری ئەوەی بەشداری شاییەکە بین، خەم دایگرتین. ئەو ڕۆژانەم بیر کەوتنەوە کە پێکەوە دەچووینە ئێڤین و دەرەکە. ڕۆژانی هەینی چەند خێزان کە هیچ کاممان وەسیلەی هاتوچۆمان نەبوو و پێکەوە ماشێنێکمان دەگرت و بەدڵخۆشی و شادی دەچووینە سەعادەتاباد یان ئێڤین و لە باغات و شیناوەردە خۆشەکانی ئەوێ تا ئێوارێ دەماینەوە. من منداڵێکم هەبوو و دکتۆر مەولەوی دوو. هەمووشیان منداڵ بوون. زۆربەی کات لە کۆڵمان دەکردن و شاد و دڵخۆش لە گردەکانەوە دادەگەڕاین و بەقاقاکێشان خۆمان دەگەیاندە مەیدانی وەنەک. ئای ڕۆژگارێکی چەندە خۆش بوو.

ئیدی دوو شەو دواتر دکتۆر نەگەڕایەوە. زێنەب خانمی هاوسەری دکتۆر بە نیگەرانییەوە هات گوتی دکتۆر هێشتا نەهاتۆتەوە. گوتم منداڵەکان بێنە لای ئێمە.

تەلەفۆنمان نەبوو. بەو وەختی شەوە نەماندەزانی هانا بۆ کێ و کوێ ببەین. من بە حەقایەتان منداڵەکانم خافڵاند تا خەویان لێ کەوت. وامان دانا سبەینێ بچینە کەلانتەری و خەستەخانەی ڕووداوەکان. من جارێ نەمدەتوانی بە ڕاشکاوی بۆی ڕوون بکەمەوە. سبەینێش چووینە کەلانتەری و خەستەخانەی لوقمانودەولە، بەڵام دکتۆر مەولەوی شوێنەواری دیار نەبوو. لە دەر و دراوسێی

کلینیکەکەیمان پرسی، هیچ کام ئاگایان لێی نەبوو. چەند ڕۆژ دواتر یەکێک لە ئاشناکانی زێنەب خانم گوتبووی دکتۆر لە گرتووخانەی ساواکە. ناوبراو چەند جاران لەگەڵ من و زێنەب خانم هات و چووینە باڵەخانەی ساواک. بەڵام هەموو جارێ بەگژماندا دەهاتن. ئیدی نەچوونەوە. زێنەب خانم کە تەواو بێهیوا بوو و زانیی دکتۆر بەو زوانە نەجاتی نابێ و خوا دەزانێ لەگەڵ دەسبەسەرکراوانی دیکە چییان بەسەر دێ، پاش مانگێک شتومەکی ماڵەکەی کۆ کردەوە و لەگەڵ منداڵەکانی بەرەو مەهاباد کەوتنە ڕێ. جگە لە دکتۆر مەولەوی کۆمەڵێکی دیکەش لە خەڵکی لای ئێمەیان گرتبوو. پاش ڕۆیشتنی خاوخێزانەکەی دکتۆر، ناچار لە باڵەخانەیەکدا نهۆمێکمان گرت، بەڵام ساڵێکیش پاش گیرانی دکتۆر، هیچ کەس لە ترسان دەرگای لێ نەدەکردینەوە. هەڵبەت سێ مانگێک پاش دەسبەسەرکرانی دکتۆر، کاک عەولای برای ئاگاداری کردمەوە کە گۆیا ناوی منیشیان وەکوو بەشداری چالاکییە سیاسییەکان لەبەرچاو گرتووە و بەدڵنیاییەوە بەو زوانە منیش دەسبەسەر دەکرێم.

چەند ڕۆژێکی مابوو بۆ نەورۆزی ساڵی ۱۳۳۹ی هەتاوی. ترسێکی سەیر دایگرتم. نەمدەزانی چی بکەم. لێرە بمێنمەوە و بمگرن، دۆخی من لەوانی دی زۆر خراپتر دەبێ. چونکە من لە سۆڤیەت هاتبوومەوە و هەر تۆمەتێکی ناڕەواشیان لێ دابایەم، قورسترین سزای بەدوودا دەهات و ئەگەر بڕۆم و ڕا بکەم، هەرچی زەحمەتی لە کۆلێژی یاسادا کێشاومە، بەفیڕۆ دەچێ و ئاوات و ئارەزووەکانم و دڵخۆشییەکانی خوێندنم دەبنەوە تۆزی بانان. کەوتبوومە

دۆخێکی سەیر ناخۆشەوە. ئاگادار بوومەوە کە جەنابی ئەلفیش گومانی هاوکاری لەگەڵ تاقمەکەی دکتۆر مەولەویی لێ کراوە و بەتەمایە لە وڵات بچێتە دەرێ. دۆخە هاوشێوەکەمان لێکی نزیک کردینەوە. لە کۆبوونەوەیەک پێکەوە دانیشتین و نەخشەی چوونەدەر لە وڵاتمان کێشا. من چەند ڕۆژێک بوو لە ماڵێ نەهاتبوومە دەرێ و نەدەچوومە کۆلێژ.

باش بوو مریەم خانم واتە خەسووم لە تاران بوو. ناچار ئەو و خێزانمم لە وەزعەکە ئاگادار کردەوە. لەو بەینەدا دکتۆر شیرازی ئاگاداری ئەو بەزمە بوو. ئەویش پێی باش بوو بڕۆم. ئیدی خێزانمم ڕازی کرد کە ڕۆیشتن لە مانەوە باشترە. ئەویش لەگەڵ دایکی تا ماوەیەکی دی و پاش ئەوەی دڵنیا بۆوە لەوەی من لە ئێران دەرباز بووم، کەلوپەلی پێویست لەگەڵ خۆی بباتەوە مەهاباد و ئەوانی دیکەش بۆ ئەوەی لەسەری نەبنە بار و شتێکیشی لەگیرفاندا بێ، بفرۆشێتەوە. بۆ سبەینێ پاش ماڵاوایی لە ماڵ و منداڵ بەوپەڕی داخ و کەسەرەوە لەگەڵ بەڕێز ئەلف لە تارانێ وەدەر کەوتین. بە شەمەندەفەر چووینە مەراغە و لەوێ بە ئوتوبووس چووینە میاندواو. لە میاندواو دوو دەست جلوبەرگی کوردیمان کڕی و بەبێ خۆگنخاندن بەرەو مەهاباد کەوتینە ڕێ. بەرەبەری ئێوارێ گەیشتینە نزیک شاری و لە داوێنی گردی کەلکی بەگزادان لە ئوتوبووسەکە دابەزین بەڕواڵەت بۆ ئەوەی بچینە ئیندرقاش. وەڕێ کەوتین و پاش ئەوەی

ئوتوبووسەکە لەچاوان ون بوو و کەسیش لەو دەوروبەرانە دیار نەبوو، لە خەندەقێکدا دانیشـــتین و جلوبەرگەکانمان گۆڕی و هەردووکمان هاتینەوە ســـەر شـــێوە و ڕواڵەتی کوردان. هێشـــتـا تەواو تـاریـک دانەهـاتبوو. چـاکەت و پانتۆڵەکەمان کە داکەندبوو، وەبن گڵ دا و بە پیادە داگەڕاین و ویستمان چۆمەکە پەڕینەوە بۆ ئەوەی بچینە سەر جادەی ورمێ شـــنۆ، بەڵام ئـاوەکەی هێنـدە زۆر و بێ بوار بوو، دەرەتانی پەڕینەوە نەبوو. ناچار گەڕاینەوە و بەلای خانەگێدا بەرەو چیای داشـــامەجید کەوتینە ڕێ. چەند ژنێکی گوندی ئێمەیان دیت، گوتیان ئەوەتا پێشـــمەرگە. خێرا لەوێ دوور کەوتینەوە و خۆمان گەیاندە پشت داشامەجید. تەواو تاریکی کـردبـوو. بـــارانـیـش دەبـاری. خـووســـــابـوویـن. هـیـچ پەناگەیەکیشمان پێ شک نەدەهات. لەپەنا بەردێک دانیشتین، بەشـــکم بارانەکە لێی بکاتەوە و وەڕێ بکەوینەوە. ئامانج ئەوە بوو شـــەوێ لە مەهاباد دوور بکەوینەوە و خۆمان بگەیەنینە جادەی ســـەردەشـــت و لەوێوە بچینە ئەوبەری عێراق. من نازانم بۆچی هیچ حەزم لە عێراق نەبوو و حەزم لێ نەبوو بچمە ئەوێ. نیو ســـەعاتێک لەوێ گیرســـاینەوە. باران وردە وردە خۆشـــی کردبۆوە. نازانم چۆن بوو کتوپڕ بیرێک وەک برووســـکە بەمێشـــکمدا هات. گوتم کاکە من پاشـــگەز بوومەوە و نامەوێ بچمە عێراق. پێی ســـەیر بوو، گوتی خۆ تا ئێرە هاتووین، هەر ئەمشەو و سبەینێ دەگەینە سنوور.

گوتم ئەگەر ســـنوور لەو بســـتەڕێیەی بەردەمیشـــم بێ نایەم. گوتم وا باشـــترێ بیرێکی لێ بکەینەوە. ئاخر ئەگەر

ئێمە لەژێر چاوەدێریدا بواین، یان قەرار بوایە بمانگرن، لەو مــاوەیەدا کە ئەوە چوار مــانگە دکتۆر مەولەوی و هاوڕێیانی گیراون، ئێمەشیان دەگرت ئیدی. ئینجا خۆ من هیچم نەکردووە. جیـا لەوەش، گیران و بەنـدیخـانەم لە ئاوارەبوون پێ باشترە. من دەگەڕێمەوە.

برادەرەکەم گوتی، ئەگەر تۆ بگەڕێیەوە، منیش ناڕۆم. چی دەبێ با ببێ. باران تەواو خۆشــــی کردبۆوە. بەڵام ئێمە تەواو خووسابووین. هەستیان و لە چیاکە داگەڕاین و خۆمان گەیاندە جادەی مەهاباد میاندواو. جادەکە سپی دەچۆوە. ئێمەش هەر وا دەڕۆیشــــتین بەشــــکم خۆمان بگەیەنینە قــاوەخــانەیەکی نزیــک گوێکتەپە. بە دەم چۆمەکەدا دەڕۆیشـــــتین، تـاریک بوو. چۆلەکەکوژ دیـار نەبوو. بێـدەنگییەکی قورس بـاڵی بەســـــەر ئەو نێوەدا کێشابوو. جاروبار کە دەگەیشتینە دەم چۆمەکە، خوڕەی ئاوەکەمـان دەبیســــــت، بەڵام چونکە جـادەکەمـان جوان نەدەدی، کتوپڕ بەڕێز ئەلف لە چۆمەکە کەوت. چۆمەکە خوڕ بوو. بە زەحمەت خۆی لە دەوەنەکـانی کەنـارەکە نزیک کردەوە و دەستی پێ گرتن. شوێنەکەی منیش قوڕ و خلیســـــک بوو، ئـاواش بەهەموو هێزی خۆم گرتم و کێشــامە دەرێ. بەڵام ئیدی ســـەرتاپای ئاوی لێ دەچۆڕا. هەواش ســـارد بوو. چونکە هێشــتا زســتان بوو و ســێ ڕۆژی مابوو بۆ نەورۆزێ. بە زەحمەت خۆمان گەیاندە قاوەخانەی گوێکتەپە. لەو ماوەیەدا سەگەلیش دەوەڕین.

دەرگای قاوەخانەکە داخرابوو. لە دەرگامان دا. درەنگانی شـەو بوو. پێم وایە نیوەشـەو بوو. تاوێکی پێ چوو ئاخری قـاوەچی دەرگـای کردەوە و گوتی چییە کـاکە؟ بەو وەختی شـــەوە هەموو خەوتوون. ســـڵاومـــان کرد و گوتمـــان ماشـــێنەکەمان پەنچەر بووە و بەو شــــەوە تەگەرمان پێ ناگۆڕدرێ. ئەوەتا تەواو خووسـاویشـین. ڕێگەمان بدە بێینە ژوورێ. قاوەچی دەرگای کردەوە. سۆبەیەک لە قاوەخانەکە هەبوو. گوتی دار و ئاوردوو لە نزیک ســـۆبەکەیە، دەتوانن دایگیرسێنن و خۆتان وشکەوە بکەن.

گوتمـان مـاڵـت هەزار جـار ئـاوەدان بێ. ســـۆبەمـان داگیرســـاند و ماوەیەک هەر خەریکی خۆوشـــککردنەوە بووین. ئەوجار ئاســـوودە لێی خەوتین. بەیانی زوو لەخەو هەســـتام. "ئەلف"یشـــم لەخەو هەســـتاند. قاوەچییش تازە لەخەوێ هەسـتابوو و خەریکی خاوێنکردنەوەی قاوەخانە و تێخســـتنی ســـەماوەر بوو. پارەیەکمان دایە و ماڵواییمان لێ کرد. هێشـــــتـا ڕوونـاکی نەکردبۆوە. بەرەو میـانـدواو بە جادەکەدا ملی ڕێیەمان گرت. یەکەم کامیۆن کە هات، ســوار بووین و بەرەو مياندواوێ کەوتینە ڕێ. بەبێ خۆمەحتەلکردن بە کامیۆنێکی دی خۆمان گەیاندە مەراغە. ســـەعات دەی بەیانی گەیشـتینە مەراغە. چووینە وێسـتگەی شـەمەندەفەر. ئەودەمی مســـــافیری تاران زۆر نەبوو. دوو بلیتی دەرەجە ٣ــمان کڕی و سەعات چوار لە شەمەندەفەردا بەرەو تاران کەوتینەوە ڕێ. دوێنێ هــاتبووین و ئەمڕۆ دەگەڕاینەوە. بەیانی ســـەعات حەوت گەیشـــتینەوە تاران. وامان دانا ئەو مەســـەلەیە بۆ هیچ کەس نەگێڕینەوە. ماڵاواییمان لێک کرد.

بەپەلە خۆم گەیاندە شــەقامی ئەناری. بەیانی زوو بوو، هێشتا تاک و تەرا خەڵک هاتبوونە دەرێ.
هێشــتا هیچ خانووەک لە دەوری ماڵەکەی ئێمە نەبوو. لەلای مـاڵێ ڕاوەســـتـام و ڕوانیم. تـاوێـک دواتر دیتم خەســـووم هاتە ســـەر بانیژەکە. دیار بوو دیەویســت دەفرێکی ئاو بەو دیودا بڕێژێ. هەر دیتمی، چوومە پێشێ و پرسیم، چ باس؟ گوتی هیچ. گوتم بیکەوە. چەند ساتێک دواتر خێزانم دەرگـای کردەوە. مـاڵەکە هەر بۆخۆمـانی تێدا بووین. نهۆمی خوارەوە کەســـی تێدا نەبوو. بە کرێ نەچووبوو. سڵاوم کرد و وەژوور کەوتم. هەموو شتێکم ســەرلەبەر بۆ گێڕانەوە. گوتم پاشـگەز بوومەوە و ناڕۆم. لێرە لای خۆتان دەبم، هەرشـــتێکیش ڕوو بدا بە توون. چەند ڕۆژێک لە ماڵێ نەچوومە دەرێ، بەڵام مانەوەش لە ماڵەوە زۆر باش نەبوو. خەســـــووم بەبێدەنگی نارد لە بـازاڕچەی شـــەقـامی ڕەی دوو هۆدەم بەکرێ گرت و مـاڵەکەی ئەنـاریم چۆل کرد. بەبێدەنگی و تەنـانەت بەبێ ئەوەی کەس ئاگادار بکەمەوە، ماڵەکەم گواســـتەوە. پاش ئەوەی لە شـــوێنی نوێ حەواینەوە و تۆزێک هاتینەوە ســـەرخۆ، پاش جێژن، ســـەرێکم لە کۆلێژ هەڵێنا. پۆلەکان وردە وردە تەواو ببوون. مامۆستا وانەیان تەواو کردبوو. بەرنامەی تاقیکارییەکانی کۆتایی ســـاڵیش ڕاگەیەنرابوو. لەســـــەرەتـــای جۆزەردانەوە تـــا پـــانزەی جۆزەردان، تاقیکارییەکان تەواو دەبوون.

تا ڕۆژی تاقیکاری دوو جاران چوومە کۆلێژ. ئەویش بۆ دیتنی پڕۆفیسۆر گیلدبراند، مامۆستای زمانی ڕووسی. دەمزانی زۆری حەز لە شیعرەکانی لۆرمانتۆڤی شاعیری ڕووسە. من شیعرێکی ناوبراوم هەڵبژارد و قەول وابوو بیکەمە فارسی. لە نێو شیعرەکانی ئەو شیعرەدا بایەوانم هەڵبژارد و وەرمگێڕا و دامە پڕۆفیسۆر. زۆری بەدڵ بوو و گوتی ئەوە لەبیر ئیمتیحانی کۆتایی ساڵت بێ و منیش وەکوو یادگارییەک لەگەڵ خۆم دەیبەمەوە، چونکە ئەمساڵ خانەنشین دەبم و قەول وایە ئیدی بڕۆم لە ئاڵمان بژیم.

ئەوەش شیعرەکە:

لە نێو تەم و دووکەڵی چڕ
بایەوانێک، دیارە، بە کوڵ
سینگی شەپۆلان هەڵدەدڕێ
تۆ بڵێی بۆچی بگەڕێ بەدڵ
چیی لێ بزر بووە لە وڵات
ئاوا دەیبا وەکوو ئاوات

.

شەپۆل کەوتوونە بەر پێیان
لەگەڵ هەڵمەتی ڕەشەبا
پشتی ئەستوون کووڕ بۆتەوە
"با" هاواری جیرەی دەبا
خۆ نابوێرێ لە بەختی خۆی
نوقمی دەریای ئاواتە بۆی

.

**شینەشەپۆلی بریسکەدار**
**لە ژێر و تیشکی تاو لەسەر**
**بەڵام بێ حەجمینی زریان**
**ڕێی ئاواتی گرتۆتە بەر**
**بۆ کەناری حەز و هیوای خۆی گەڕاوە**
**بەشکم ئیتر ڕزگاری بێ لەو گێژاوە**

تاقیکارییەکان دەستیان پێ کرد. لە سایەی خواوە بە نمرەی زۆر باش دەرچووم و تەواو حەسامەوە. جا کۆلێژی یاسام تەواو کردبوو و ئیدی لە هیچ شتێک نەدەترسام. بەلامەوە گرینگ بوو کۆلێژەکە تەواو بکەم. لەو ماوەیەدا دکتۆر و مەولەوی و زیندانییەکانی دیکەیان بۆ دادگاییکردن هێنابووە گرتووخانەیەک لە شەقامی سێی ڕەشەمە "خیابان سوم اسفند". تەنیشت دادگای ئەرتەش.

هێندێ جار بە ترس و لەرزەوە بەویدا ڕادەبردم و لەودیو ئاسنەپەرژینی پەنجەرەکانی نهۆمی سێیەمەوە زیندانییەکانم دەدی. ڕۆژێک کاک کەریم کابانیم دیت، دەستی بۆ ملی ڕاداشت. یانی سەرمان دەپەڕێنن.

دادگاییەکەیان زوو دەستی پێ کرد. من و زێنەب خانم کە دیسان هاتبۆوە تاران چووینە لای سەرهەنگێکی خانەنشین بەناوی ئاغای شاقولی بۆ ئەوەی ببێتە پارێزەری دکتۆر مەولەوی. ئاخری دادگاییان کردن و بە تۆمەتی دامەزراندنی حیزبی دیموکرات زیندانیی درێژخایەنیان بەسەردا سەپاندن و هەموویانیان بەرێی بەشی سیاسیی زیندانی قەسر کردن.

## دامەزران لە بانکی بازرگانی

کە هاوین داهات، لەبەر ئەوەی خاوخێزانەکەم بەڕاستی سەردەمێکی زۆر تاڵیان بەڕێ کردبوو، ناردمنەوە مەهاباد، بۆ ئەوەی ئاهێکیان بەبەردا بێتەوە. بۆخۆم کە بەتەنێ لە تاران مابوومەوە، بڕیارم دا ماڵەکەم لەو گەڕە پیس و قەرەباڵغە بگوازمەوە، کە خاوەن خانووەکەشم گرووبانێکی بەدگوزی شارەوانی بوو. پاش هەوڵێکی زۆر، هۆدەیەکم لە کۆڵانی غەفاریی شەقامی ڕوودەکی دۆزییەوە. خاوەنماڵەکە، پیاوێکی ئازەریی تا بڵێی باش بوو، بە ناوی ئیسماعیل، کە جلوبەرگی ژنانەی دەدروو.

سیپاڵم هێنا ئەوێ و بۆخۆشم بەرەو مەهاباد بوومەوە و چەند ڕۆژێک دواتر لەگەڵ خاوخێزانم بەرەو تاران گەڕامەوە و چووینە هۆدە تازەکەمان. سەرەڕای ئەوەی ژیانەکەمان لەوپەڕی سادەییدا بوو، بەڵام تا بڵێی ئاسوودە بووم.

مانگێ ٤٥٠ تمەنم وەردەگرت و بۆ بڕوانامەی بەکالۆریۆسەکەشم قەول وابوو بڕی دووسەد تمەنم بۆ زیاد بکەن. هەر وا هاتوچۆی وەزارەتی کارم دەکرد و حەفتەی جارێک دەفتەی هاتوو و چووم واژوو دەکرد. ئیدی زۆر لەو دۆخە وەڕەز و ناڕازی بووم. ئەودەمی لە کۆلێژ دەمخوێند، ئەو دۆخە زۆر بەلامەوە خۆش و بگرە هەر بیعمەتێک بوو، بەڵام ئێستا هەستم دەکرد خێرم پێ دەکەن. بەبێ ئەوەی هیچ کارێک بکەم، مانگانێ بڕەپارەیەک یان بڵێی بەرتیلی بێدەنگی وەردەگرم.

خۆ دەربازکردن لەو دۆخە زۆر ئەستەم بوو. نەمدەتوانی خۆم بە کار و کاسبیی سەربەخۆوە سەرقاڵ بکەم. وازهێنان لەو مووچەیەش، کارێکی ژیرانە نەبوو، جگە لەوەش وا لە قۆناغی خانەنشینی نزیک دەبوومەوە. چونکە بە بیست ساڵ پێشینەی دامەزران، دەکرا خانەنشین بی. لەو فکر و خەیاڵاتانەدا بووم، کە لە مانگی خەزەڵوەردا بانگەوازێکم لە ڕۆژنامەدا خوێندەوە و تێیدا گوترابوو، کە بانکی بازرگانیی ناوەند چەند کەسێکی پێویستە کە بڕوانامەی بەکالۆریۆسی مافناسییان هەبێ. دەمودەست خۆمم گەیاندە لقی ناوەندیی بانکەکە لە مەیدانی تۆپخانە و ناوی خۆمم نووسی. پاش تاقیکارییەکان، یەکێک لەو پێنج کەس بووم کە پێویستیان بوو. ناردیانمەوە بانکی بازرگانیی لقی بازاڕ، بۆ ئەوەی پاش سێ مانگ خولی ڕاهێنان، بمنێرنەوە بەشی مافپارێزیی بانکەکە.

جا بە ڕێکەوت، کاک مەحموودی وەلی زادە، سەرۆکی بەشی بەڵگەپسوولەکان بوو. منیش هەر لەو بەشەدا خەریک بووم. هەموو ڕۆژێ کارم ئەوە بوو، سفتەکانی سبەینێ ڕێکوپێک بکەم. هەڵبەت کارێکی قورس نەبوو، بەڵام کاتی زۆر دەویست. دەبوو لە ماوەی سێ مانگدا لەگەڵ کاروبار جۆراوجۆرەکانی بانک ئاشنا بم. خۆشحاڵ بووم لەوەی کە بە ڕاستی لە بێکاری زرگار بووم. سێ مانگەی خولی ڕاهێنان خەریک بوو تەواو دەبوو، کە ڕۆژێکیان لە وەزارەتی فەرهەنگەوە نامەیەکم بۆ هات و

داوا کرابوو دەسبەجێ خۆم بگەیەنمە فەرمانگەی فەرهەنگی پارێزگای تاران. هەڵبەت دەمێک بوو ئیدی نەدەچوومە وەزارەتی کار، لەبەر ئەوەی منیان دابووە بەردەستی چاودێریی گشتی.

ئەو نامەیە منی خستە سەر دووڕییانێکی ئەستەم. ئاخۆ واز لە کاروباری بانک بێنم و بگەڕێمەوە وەزارەتی فەرهەنگ، یان تازە کاری بانکەکەم بەجێ نەهێڵم، کە داهاتوویەکی زۆر باش چاوەڕێم بوو. بانک هیچ ئاگاداری پێشینە و ڕابردووی من نەبوو. چونکە بانکەکە کەرتی تایبەت بوو، زۆر کاری بە ڕابردووتەوە نەبوو. ئیتر ڕێگەی پێشکەوتن و هەڵکشان لەوێ بەڕوومدا کرابۆوە، بەڵام لە وەزارەتی فەرهەنگ وا نەبوو. لەسەر فایلەکەم نووسرابوو کە چوومە سۆڤیەت. خۆ ئەگەرچی بە بە مۆڵەتی وەزارەتی فەرهەنگ چووبووم، بەتایبەتی لەو ماوەیەدا کە هیچ کارێک بە من نەدەسپێردرا، باشترین هۆکار، ئەوە بوو کە ڕێکخراوی پاراستن و تەناهی و بەرپرسانی پەیوەندیدار بەو بەشەوە ڕازی نەبوون. هەر لەو سۆنگەیەوە هەموو ڕێیەکی پێشکەوتن لە وەرزارەتی فەرهەنگدا لە من گیرابوو. ئێستاش کە بانگیان کردوومەتەوە بۆ کار، بۆ ئەوەیە کە مووچەی بەلاش خۆڕاییم نەدەنێ. ئینجا ئەولایەنە باشەشی هەبوو کە هێندەی نەمابوو بۆ بیست ساڵەی پێشینەی خزمەتم لەو وەزارەتخانەیەدا و دەمتوانی خۆم خانەنشین بکەم، لە حاڵێکدا لە بانکی بازرگانی هەر دەبوومە کارمەندێکی تازە دامەزراو.

ئیتر پاش بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندنی دۆخەکە لەو دوو شوێنە باش یان خراپ، هەڵە یان دروست بڕیاری خۆمم دا بگەڕێمەوە فەرهەنگ.

## گەڕانەوە بۆ وەزارەتی فەرهەنگ

پاش ئەوەی بڕیارم دا بگەڕێمەوە وەزارەتی فەرهەنگ. بە تێروتەسەلی هەموو شتێکم بۆ بەرپرسی بانکی بازرگانی نووسی و بۆم ڕوون کردەوە کە سەرەڕای ئەوەی حەزم لێیە لەو بانکەدا کار بکەم، بەڵام چونکە بڕیار دراوە لە وەزارەتی داد دامەزرێم و کارەکەی ئەوێ لەگەڵ بواری خوێندنەکەم یەک دەگرێتەوە، تکایە لێم قبووڵ بکەن دەست لەکارەکەم بکێشمەوە. دەستەی بەڕێوەبەریی بانکیش وێڕای قبووڵی دەست لەکارکێشانەوەکەم فەرمانی کرد مووچەی ئەو سێ مانگەم بدەنێ کە ڕاهێنانیان پێ کردووم. بەو جۆرە کاری بانکەکەم لەکۆڵ بۆوە و خۆمم بە فەرهەنگی پارێزگای تاران ناساند. لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا بڕیارەکەم بۆ دەرکرا، کە بە پێی ئەو بڕیارە، نەک وەکوو مامۆستا، بگرە وەکوو فەرمانبەری فەرمانگەی فەرهەنگی گەڕەکی پازدە دامەزرام. ئەو فەرمانگەیە تازە لە نازیاباد، یانی دوورترین شوێنی باشووری تاران دروست کرابوو. لە ڕاستیدا منیان بۆ ئەوێ دوور خستەوە. چونکە تا دەگەیشتمە ئەوێ دەبوو سێ پاس بگۆڕم. ڕۆژی پانزەی ڕەشەممەی ساڵی ١٣٣٩ پاش تەقریبەن پانزە ساڵ چاوەڕوانی، گەڕامەوە سەر کارەکەی خۆم و دەستم بە کار کردەوە. بەڵام باشترە بڵێم دیسان چوومەوە سەر بێکاری، چونکە لەو فەرمانگەیە هیچ بەرپرسیارەتی و ئەرکێکیان پێ نەسپاردم. ماوەیەک لە بەشی ژمێریاری و

کارگێڕییەکەی کارم کرد. بەڵام بەگشتی وەکوو فەرمانبەرێکی ئەوێ سەیریان نەدەکردم. فەرمانبەرێکی زیادە بووم. درەنگ دەچووم و زوو دەڕۆیشتمەوە. کەس کاری پێم نەبوو. پاش شەش مانگ، بەڕێوەبەری فەرمانگەکە لەکۆڵ خۆیانی کردمەوە و گواستیانمەوە بۆ گەڕەکی ۷ی فەرهەنگی کە لە سەرەتای جەوادییە پاش پردی ئاسنەڕێ بوو. ئەوێ بۆ من باشتر بوو. چونکە لە ماڵەکەم نزیکتر بوو و بە پاسێک دەگەیشتمێ. شتێکی باشی دیکەشی هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کە بەڕێوەبەری فەرمانگەکە دەرچووی یاسا بوو. جا چونکە منیش ئەو بوارەم تەواو کردبوو، زۆری ڕێز دەگرتم. هەڵسوکەوتی باشی بەڕێز بەسیریی نەمین، بەڕێوەبەری فەرمانگەکە لەگەڵم ببووە هۆی ئەوەی باقی هاوکارەکانیشم کە زۆربەی ئازەربایجانی بوون، ڕێزێکی زۆرم بگرن. هەڵبەت لێرەش وەک ئەولا هیچ کارێکی ئەوتۆیان پێ نەسپاردم. بەڕێز بەسیری زۆری هەوڵ دا بەڵام هیچی پێ نەکرا. ئاخری منیان کردە بەرپرسی فەرمانگەی بەتەمەنەکان. هەرچۆنێک بێ ماوەیەکیش لەو بەشە کارم کرد.

یەکێک لە شانازییەکانم لەو بەشەدا ئەوە بوو، کە توانیم کۆمەڵێک هاوولاتیی کوردزمانی خۆم وەکوو مامۆستا، بە مووچەی ڕۆژانە دامەزرێنم. ئەوانە، یان لەبەر هۆکاری سیاسی یان نەبوونی دیپلۆم

نەیاندەتوانی بە فەرمی دامەزرێن، ئەوەش بۆ من ئەوپەڕی بەختەوەری و شـــانازی بوو، کە بەتایبەتی توانیبووم کارێک بکەم ئەو گەنجە بێبەشـــانە خەریکی کاروباری خۆیان بن. باش بوو زۆریش ســـەرکەوتوو بوون. جا چونکە ئەوانە بەردەوام لە ســـۆنگەی ئەو خزمەتە بچووکەوە کە پێم کردبوون، زۆریـان ڕێز دەگرتم، بەوپەڕی ڕێزەوە ناوەکانیان لێرەدا دەنووســـمەوە: کاک عەلی مەحموودی، خەڵکی سەقز، کە ئێستا لە نووسینگەی ژمارە ١٢١ی بەڵگەنامەکانی تاران کار دەکا. هەر کاتێکی من لەو نووســـینگەیە کارێکم هەبووبێ یان کەســـانێکم ناردبێ، ئەوپەڕی چاکە و خۆشەویستیی نواندووە. بەڕێز مەلا ســـاڵحی ئیبراهیمی کە هەمووتان دەیناســـن. بەڕێز عەبدوڵلاپوور، کە ئێســـتا دادوەرە. بەڕێز جیهانبین کە لە وەزارەتی کاروباروباری دەرەوەدا کار دەکا. جەنابی دکتۆر مســـتەفا خوڕەم دڵ و کاک فەتاحی کاویان و... خانمێکی بۆکانیش، کە بە دوو منداڵە هەتیوەکەیەوە لە تاران دەژیان و جلی بۆ ماڵان دەشوشت. هەوڵم بۆ دا کە وەکوو فەڕاش لە قوتابخانەی کچانەی گەڕەکی ٧ دابمەزرێ. ئێستا خانەنشینە.

هیوادارم ئەو کەسانە، کە هەموویان کەسانێکی پاک و شـــێلگیر بوون و بۆخۆیان خۆیان پێ گەیاندبوو، سەرکەوتوو و بەختەوەر بن.

## قۆناغی دکتۆرای یاسا

لەو قۆنـاغی بێکـارییەدا بیرم لەوە کردەوە ئەو هەلە بکەمە دەرفەت و بچم دکتۆرا بخوێنم کە چەند ســـاڵێک بوو دەرگای خوێندنی ئەو بوارە خرابووە ســـەرپشـــت. دەکرێ دواکەوتنەکانت بە شێلگیری و ماندووییەناسی و قۆســـتنەوەی هەل و دەرفەتەکان قەرەبوو بکەیەوە. بە ڕێکوپێکی کەوتمەوە خوێندنەوەی بابەتە یاســـاییەکان و خۆمم بۆ بەشـــداری لە تاقیکاریی کۆنکوردا ئامادە کرد. بەتایبەتی زمانی ڕووســـی ئامرازێکی زۆر باش بوو بۆ من، کە لە بواری سیاسیدا بەشدار بم.

خەرمانانی ســاڵی ١٣٤٠، یەکێک بووم لە بەشــدارانی تاقیکاریی کۆنکور. هەڵبەت مەرجی ناونووسی لە قۆناغی دکتۆرادا ئەوە بوو کە نێونجی نمرەکانی بەکالۆریۆســـت لە ١٣ بەرزتر بێ. جـا چونکە ئی من ١٣ بوو، توانیم بەشدار بم.(سێزدە لە بیست).

بەشـدارانی هەر ســێ بواری ســیاســی و ئابووری و یاسا لە شوێنێک کۆ ببوونەوە. من بە پێی ژمارەی سەر کارتەکەم، چووم کورســیی خۆمم دۆزییەوە و دانیشــتم. لە تاقیکارییەکەدا، بەڕێز دکتۆر عەمید، ســەرۆکی کۆلێژی یاسا و کۆمەڵێک مامۆستای دیکە چاودێرمان بوون.

پرســیارەکانیان بەســەر بەشـداربواندا بەش کرد. بەڵام هەرچی چاوەڕێم کرد، پرســـیار بە من نەدرا. ئیدی کات تێـدەپەڕی. بە دکتۆر عەمیـدم گوت قوربـان بۆچی وەرەقەی من نەدراوە؟ گوتی لە چ بوارێکدا بەشـــداریت

کردووه؟ گوتم بواری سیاسی و زمانی ڕووسی. بە سەرسووڕمانەوە گوتی ئێمە ئیدی زمانی ڕووسیمان نییە، چونکە پرۆفیسۆر گیلدبراند خانەنشین بووە. گوتی، بە هەڵە ناوی خەڵکیان لەو بوارەدا نووسیوە. ئیدی بانگی زەینەدینی سەرۆکی ژمێریاریی کۆلێژی کرد و گوتی، پارەی بەشداریی ئەو برادەرە بدەنەوە. ناچار هەستام کۆڕی تاقیکاریم بەجێ هێشت. زۆرم پێ ناخۆش بوو کە ئەو دەرفەتە گرانباییەم لەکیس چووە. بەڵام بێهیوا نەبووم و لەو ساتەوە بڕیارم دا زمانی فەرەنسی بخوێنم. جا چونکە پێشتر هێندێ وردە زانیاریم لەسەر زمانی فەرەنسی هەبوو، بە کتێبێکی گرامێرەوە، چووم چەند کتێبێکی فەرەنسیشم کڕی. حەفتەی یەک یان دوو جاریش دەچوومە کتێبخانەی کۆلێژی ماف و کتێبی یاساییم بە زمانی فەرەنسی دەخوێندەوە و وشە پێویستەکانم یادداشت دەکرد و بۆ تێگەیشتن سەرم بە قامووسدا دەکرد. وردە وردە توانیم بەو زمانەش دەقە یاساییەکان بخوێنمەوە و تێیان بگەم.

هەڵبەت بواری دکتۆرای یاسا، پێویستی بە زانینی فەرەنسی هەبوو. هەر بۆیە خوێندنەوەی دەقی فەرەنسی هەم زانیارییەکانمی لەو بوارەدا دەوڵەمەندتر دەکرد و هەمیش زیاتر بەسەر زمانەکەدا زاڵ دەبووم. ساڵێکیش دەرفەتێکی باش بوو. ئیتر وام لێ هاتبوو بیستوچوارسەعاتە خەریکی خوێندن و یادداشت هەڵگرتنەوە بووم.

خەرمانانی ساڵی ١٣٤١ داهات. دیسان ناوی خۆمم لە کۆنکوردا نووسی، بەڵام ئەمجارەیان لە بواری داد. ئەوانەی

بەشـــدار ببوون، هەموو دادوەر و پارێزەری داد بوون. سەد کەسێک دەبوون.

ئیمتیحانەکانیش زمانی عەرەبی و فەرەنسا و کۆمەڵێک پرسیاری یاسایی بوون، لە یاسای مەدەنی و بازرگانی و سزا. کاتی تاقیکاریش دوو سەعات بوو. پاش تەواوبوونی تـاقیکـارییەکە و ڕاگەیـانـدنی ئـاکـامەکەی، تەنیـا ٩ کەس دەرچووبوون، کە بەختەوەرانە یەکێکیـان من بووم. شانازییەکی گەورەم پێ بڕابوو. لەخۆشیان خەنی ببووم. ڕۆژێکیان کە لە پۆلی دەرســی قۆناغی دکتۆرادا بەشـدار بووم، جگە لەو ٩ کەســە دەرچووە، کۆمەڵێکی ســاڵەکانی پێشـــووش هاتن. چونکە هەر ســـاڵێک ٦ وانەمان پێ دەگوترا و ســـاڵی دووەم ٦ وانەی دی. هەر بۆیە ئەگەر خوێندکارێک لە یەکەم ساڵدا لەو شەش دەرسە کەوتبایە، دەبوو دیســـان بیانخوێنێتەوە. کۆی دەرســـەکانی قۆناغی دکتۆرا ١٢ دەرس بوون، کە بە دوو ســـاڵ دەخوێنران. هەڵبەت بۆ هەر دەرســـێکیش لە کۆتایی ســـاڵدا دەبوو تێزێک پێشـــکەش بکەی. بەو جۆرە بەڕاســـتی بڕینی قۆناغی دکتۆرا بە دوو ســـاڵ، تا بڵێی تاقەتپڕووکێن و ئەســـتەم بووم. هەر بۆیەش هێندێ بە چوار یان شـــەش ســـاڵ و بگرە زیاتریش تەواویان کرد. مامۆســـتاکانیش دەرەجەیان زۆر بە زەحمەت دەدا و لەسەری ڕژد بوون. دۆخی پۆلەکانیش وەکوو پۆلی بەکالۆریۆس نەبوو. هیچ مامۆســتایەک وەکوو قۆناغی ئەودەم وانەی نەدەگوتەوە، بگرە هەر بەشـــێک یـان بـاســـێکی کتێبەکە دەدرایە

خوێندکارێک، که بیخوێنێتەوە و لێکۆڵینەوەی تێدا بکا و بگەڕێتەوە سەر کتێبی پەیوەندیدار بەو بەشە و ئەو یاسایانەی دانراون و بە پشتبەستن بەوانە وتارێک بنووسێ و بەشێوەی کۆنفڕانس یان سمینار پێشکەشی بکات. جا لە پۆل ڕەخنەی لێ دەگیرا.

بە ڕێکەوت ئەو ساڵە یاسایەکی مەدەنیی تازە لە حەبەشە، لەلایەن کۆمەڵێک یاساناسی بەناوبانگی فەرەنساوە بەپێی عورف و عاداتی ئەوێ نووسرابوو. ئەو یاسا مەدەنییە کە دەکرێ بڵێی مۆدێرنترین یاسای مەدەنیی دونیا بوو، نوێترین بوارە یاساییەکانی لەخۆ گرتبوو. بەرگێکیان بۆ دکتۆر ئەفشاری مامۆستای یاسای بەراوردکاری ناردبوو.

ئەویش ماددەکانی ئەو یاسایەی بەسەر خوێندکارەکاندا دابەش کرد و وا دانرا جگە لەوەی بکرێنە فارسی شەرحیشیان لەسەر بنووسرێ. لەو حەفتا ماددەیەدا کە قەرار بوو من تەرجومەیان بکەم و لێکیان بدەمەوە، بڕگەیەکی یاسایی هەبوو، کە لە یاسای مەدەنیی ئێمە و فەرەنسا و سویسراشدا هەبوو. ئەوەش یاسای بەڵێن بوو. بەو ڕوونکردنەوەیە کە بەڵێنەکەی نێو یاسای حەبەشە، بەرپرسیارەتی بوو. لەحاڵێکدا لە یاسای مەدەنیی ئێمەدا هیچ ماددەیەک نەبوو کە دەستەبەری و بەرپرسیارەتی بێنێ. تەنیا دەکرا لە خوازبێنیدا بابەتەکە و بەڵێن پێک بگری، هەڵبەت نەک بە دەستەبەری، بەڵکوو وەکوو بەرپرسیارەتیی مەدەنی. ئەوەش بڵێین کە هەر کات بنەماڵەی بووک لە خوازبێنی و قبووڵی زەماوەند پاشگەز و پەژیوان ببنەوە،

تەنیا حەقێکی کە بنەماڵەی زاوا دەتوانن داوای بکەن، قەرەبووی ئەو خەرج و تێچووانەیە کە بەهۆی ڕێوڕەسمی خوازبێنی و دەست و دیارییەوە کێشاویانە.

یەکێک لە دەرسەکانی دیکەی سەرەتای قۆناغی دکتۆری، مێژووی یاسا بوو، کە کوردسییەکەی درابوو بە دکتۆر محەمەد حەسەنی عەلیابادی. ئەویش کتێبی مێژووی یاسای ڕۆما، نووسینی مەمەسنی هەڵبژاردبوو و هەر بەشێکی بە خوێندکارێک ئەسپاردبوو.

ئەو باسەی کە بە من بڕابوو، شێوازی داوەریکردن بوو لە ڕۆمای کەونارادا.

هەڵبەت ئەو کتێبە دەقێکی یاسایی کۆن و زۆر ئەستەم بوو و کۆمەڵێک وشەی لاتینی تێدا بوو کە تەنانەت لە قامووسی فەرەنسییشدا نەدەدۆزرانەوە. هەر بۆیە زۆربەی وەرگێڕانی خوێندکارەکان وشەبەوشە بوون و تێیان نەدەگەیشتی. بەڵام من هەوڵم دابوو ئەوەندەی دەلوێ وەرگێڕانەکە سادە و شیاوی تێگەیشتن بێ. هەر بۆیەش پاش پێشکەشکردنی وتارەکەم لێم هاتە پێشێ و پرسیی، بەڕێز، تۆ هەواڵنێری ڕۆژنامەی؟ گوتم نەخێر قوربان فەرمانبەری وەزارەتی فەرهەنگم. جەنابی دکتۆر عەلیابادی مامۆستایەک بوو بە هەڵسوکەوتی دەروێشانە و شاعیرانە. زۆربەی قسەکانی تەوس و پلاریان تێدا بوو. ڕۆژێکیان بە دوو خوێندکاری، کە یەکێکیان شۆرەتی زەریف و ئەویش دیکە پەشمی(واتە کوڵکن) بوو، گوت: "ئەو دوانەتان وا باشترە شۆرەتەکەتان بگۆڕنەوە. چونکە

بەڕێز زەریف بە دابی فەقێیان ڕیشـــی نەدەتاشـــی و مووی هەبوو، بەڵام پەشـــمی ڕیشـــی وا دەتاشـــی، دەتگوت قەت مووی لێ نەڕواوە.

# سەفەری شیراز

لەگەڵ دەسپێکی ساڵی خوێندنی ٤٢ـ ٤٣، شەش وانەکەی دیکەی دکتۆراش دەستی پێ کرد و وەک ساڵانی پێش دەچووینەوە پۆل، کە دوانیوەڕۆیان بوو. ماوەیک بوو لە کۆڵانی غەفاری بەرانبەر خانووە کرێیەکەی پێشوو، نهۆمێکم بەکرێ گرتبوو، کە دوو هۆدە و چێشتخانە و عەمبارێکی بوو. لە بەڕێز موحەڕەڕی، کە خەڵکی سنە بوو. باری ژیانم خراپ نەبوو. جگە لە مووچەی مانگانەم، هەموو مانگێ دووسەد تمەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس و بیست تمەنیشیان پارەی منداڵ دەدامێ، کە لەسەر یەک دەیکردە هەزار و سێسەد و چلوپێنج تمەن. بەپێی تێچووی ژیان و خەرجی ئەملاوئەولا، توانیبووم هێندێکیش پاشەکەوت بکەم. هەر بۆیە بەرەبەری نەورۆزێ ماشێنێکی فۆلکس واگۆنی دەستی دووم بە شەش هەزار تمەن کڕی بە قیست. بڕیارم دابوو نەورۆزەکەی بچمە شیراز. هەڵبەت جەنابی دکتۆر شیرازی ئەو پێشنیارەی پێ کردم. چونکە کاک محەمەدی شیرازیی برای لەوێ کاری دەکرد. جەنابی دکتۆریش بە خاوخێزانەوە دەچووە ئەوێ.

بەڵام بۆ ئەوەی لە شیراز سەرودڵی ئاغای شیرازی نەگرم، داوام کرد دوو هۆدەمان بۆ بگرن. سەرلەبەیانیی ڕۆژی ٢٩ی ڕەشەممە لە تارانێ وەدەرکەوتین و پاش نیوەڕۆ گەیشتینە ئیسفەهان. لەپێشدا چوومە فەرمانگەی فەرهەنگ و بە یارمەتی و ڕێنوێنیی یەکێک لە فەرمانبەرەکان هۆدەیەکمان لە یەکێک لە قوتابخانە باشەکانی ئیسفەهان

بەکرێ گرت، کە بۆ نیشتەجێبوونی مسافیرانی بەشی فەرهەنگ تەرخان کرابوو. بۆخۆم بووم و هاوسەر و دوو کچۆڵەکەم. جگە لە ئێمە کۆمەڵێک خێزانی دیکەش لەو قوتابخانەیە بوون. جا بە ڕێکەوت، بەڕێز حەقەندیشی لێکۆڵەری دادی تاران، کە دەبووە خوشکەزای کاک محەمەدی موحەڕەڕیی خاوەن خانووەکەمان، لەو قوتابخانەیە هۆدەی گرتبوو. ئەویش لەگەڵ هاوسەرەکەی بەرەو شیراز دەچوون. ئێوارێ پێکەوە چووینە دەم چۆمی زایندەڕوود و لە دەم سی و سێ پردەکەی ئیسفەهان نانی ئێوارەمان پێکەوە خوارد و یەکەم شەوی جەژنمان زۆر بەخۆشی تێپەڕاند. بۆ سبەینێ بەرەو شیراز کەوتینە ڕێ. کاک محەمەدی شیرازی هەر لە پێش پێشەوە، پاش دەروازە قورئان، دوو هۆدەی ڕاخراو و سەربەخۆی بە هەموو کەلوپەلێکی پێویستەوە بۆ بەکرێ گرتبووین. جا بە ڕێکەوت خاوەن ماڵ کچەکەی بەشوو دابوو و شاییەکی خۆش بوو. ئێمەشیان بەشدار کرد. دەنگی قریوەی ژنان و گۆرانیی ئەو دەڤەرە و مۆسیقا و ژەنیار تا بڵێی خۆش بوو. بنەماڵەی دکتۆر شیرازی لە ماڵی براکەی و بەڕێز حەقەندیش لە یەکێک لە خانووەکانی نزیکمانەوە حەوابوونەوە. بەشداریی بەکۆمەڵ لە شایی و زەماوەند و گەڕانی نێو شارەکە زۆری دڵخۆش کردین.

دیتنی باخی ئیرەمی شیراز بەو حەوز و نافوورە جوانانەوە و ئەو دارانەی وا سەریان لە هەوران دەسوو، بەتایبەتی داری سنۆبەر و زیارەتی گۆڕی سەعدی حافز، دوو شاعیرە شیرین زمانەکەی دەڤەری فارس، بوون بە بیرەوەریی لەبیرنەکراو. کچانی چاوڕەش و کەمەرباریک و خەڵکی دلۆڤار و میوانگر کە شتی وام لە هیچ شوێنێکی ئێرانێ نەدیتبوو، وەها کەفوکوڵ

و شادییەکیان خستبووە دڵ و دەروونمانەوە، شاگەشکەیان کردبووین. لەگەڵ ئەو بیرەوەرییانەدا بە دەست و دیاریی شیرازەوە، پێش نەورۆزێ گەڕاینەوە تاران.

بۆ ڕۆژی سێزدەبەدەر، دکتۆر شیرازی دۆست و ئاشناکانی کەرەجی ڕاسپاردبوو، باخێکیان لەوێ بەکرێ گرتبوو و قەرار بوو بە هیممەتی وی، کوردەکانی نیشتەجێی تاران هەموو لەوێ کۆ ببنەوە. بەیانی کە هەستیان و خۆمان ئامادە کرد بچینە کەرەج، بەفرێکی قورس باری. بەفرێک کە تەنانەت زستانەکەشی لە تارانێ شتی وام نەدیتبوو. هەرچۆنێک بێ وەڕێ کەوتین. خۆ هەر دەبوو سێزدەی لەخۆمان دەرکەین. هێشتا نەگەیشتبووینە پردەکەی بەر کەرەج، چەند هاوولاتییەکمان وەپێشمان کەوتن و بردیانینە نێو باخێک. جا چونکە هەواکەی سارد بوو و بەفرەکەش هەر دەباری، لە هۆدەیەکی گەورەی نێو باخەکەدا کۆ بووینەوە.

## یادی دکتۆر حەفیزی

مـانگی جۆزەردانی ســــاڵی ١٣٤٣ی هەتـاوی، قۆنـاغی دکتۆرای یاســام لە زانکۆی تاران تەواو کرد و کارنامەکەیم لە نووســــینگەی قۆنـاغی دکتۆرا کە ئەودەم بەڕێز زەریف بەڕێوەبەری بوو، وەرگرتەوە و یەکێک بووم لەو قوتابییانەی کە توانیبوویان ئەو ســـاڵە هەموو دەرســــەکانی قۆناغەکە تێپەڕێنن.

دوانیوەڕۆریەکی ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی مـانگی جۆزەردان بوو، کە کارنامەکەمم وەرگرتەوە. هێشـتا پشـووی هاوینەی کۆلێژەکـان بە فەرمی دەســـتیان پێ نەکردبوو. ڕێک لەو دەمەدا بەڕێز دکتۆر حەفیزیی سـکرتێری کۆلێژی پزیشـکیم بیر کەوتەوە و دەمودەســـت بەرەو کۆلێژەکە وەڕێ کەوتم. کە گەیشــتمە کۆلێژ و ســۆراغیم لە فەڕاشــەکە کرد، گوتی ئێستا بووەتە سەرۆکی کۆلێژی پزیشکی.

هۆدەکەی پێشــانم دا. ئەو هۆدەیەم دەناســـی و هێندێ بیرەوەریی تاڵم لێی هەبوو. لە دەرگام دا و وەژوور کەوتم. دکتۆر پیر و کەنفـت ببووو خەریـک بوو نـامەیەکی دەخوێندەوە. سڵاوم کرد. لە ژێر چاویلکە ئەستوورەکەیەوە ســـەیرێکی کردم و گوتی، کارێکت هەبوو؟ من بەبێ ئەوەی هیچ بڵێم، کارنامەکەمم پێشـــان دا. بڕوانامەکەی هەڵگرت و سەیرێکی کرد و گوتی، ئەوە ئی کۆلێژی یاسایە.

گوتم قوربان ڕاســـت دەفەرمووی، بەڵام ســـەیرێکی بکە بزانە خاوەنەکەی دەناسـی؟ ڕەنگێکی هێنا و برد. گوتی یانی چی؟ خاوەنی ئەو بڕوانامەیە خوێندکاری پزیشـــکی نییە تا

بیناسم. بڵێم بزانم مەبەستت چییە؟ گوتم قوربان، خاوەنی ئەو کارنامەیەش خوێندکاری پزیشکی بوو. چارەڕەشێک بوو لە سۆڤیەتەوە گەڕابۆوە. ئێوە نەتانهێشت لەم کۆلێژەدا بخوێنێ. فەرمووت ناهێڵم کۆمۆنیست لەم کۆلێژە بخوێنن. ئەوەتا دەبینی هەر ئەو کەسە دکتۆرای لە یاسا وەرگرتووە و لە ماوەی شەش ساڵ خوێندنی لە کۆلێژی یاسادا بچووکترین بێڕەوشتیی لێ نەبینراوە. ئەو کەسە منم. ئێستا هاتوومەوە ڕابردووت بیر بخەمەوە و لەخوا بپاڕێمەوە جزای ئەو خراپەیەت بداتەوە کە لە حەقی مندا کردت. لەوانەشە پەشیمانی بی لەوەی کردووتە و ببێتە وانەیە.

دەستم دا بڕوانامەکەم. چاوم پڕ ببوون لە ئاو. لەو ماوەیەدا ئەو هەر وا بێدەنگ گوێی دابووە قسەکانم. وەدەر کەوتم. نازانم قسەکانم چ کاریگەرییەکیان لەسەر دانا. بەڵام بڕوام نەدەکرد زاتی ئەو جۆرە کەسانە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا بێ.

هەرچۆنێک بێ، من قسەی دڵم کرد. گرێپووچکەی دڵم کردەوە. دەستی ڕۆژگار بەهێزە و قوڕگی ئەو کەسانە دەگوشێ. دواتر بیستمەوە، سزای کردەوەی چەوت و نامرۆڤانەی خۆی وەرگرتەوە.

پاش شۆڕش و ڕووخانی تەخت و بەختی پاشایەتی لەسەر کار لادرا و کوڕەکەی کە گەیشتبووە پلەی سەرهەنگی، گوللەباران کرا.

**چی دەکەی، پێت وانەبێ بیر چوویەوە**

**چیت بچێنی، هەر ئەوەش دەدروویەوە**

## تەواوکردنی خوێندن

پاش تەواوکردنی خوێندن، بەڕاستی هەستم بە شەکەتی دەکرد. حەزم لێ بوو ماوەیەک واز لە کتێب و خوێندن و خوێندنەوە بێنم.

بە دەردی کاک عوبەیدی ئەبیوبیان "ماندوو بووم من لە دەس و باسی مەدرەسە". بە ڕاستی ماندوو ببووم. شەش ساڵی ڕەبەق بەبێ سرەوتن هەوڵم دا. بۆ حەسانەوە، مانگێکم مۆڵەت وەرگرت و لەگەڵ خانمەکەم و منداڵان چووینەوە مەهاباد. مەکۆی کۆزمان، لە هەموو سەفەر و دەرفەتاندا هەر مەهاباد بوو. زێدی مرۆڤ، سەیر دڵ ڕادەکێشێ. بەو هەمووە کەمایەسییەوە کە هەیەتی، لە هەموو شوێنێک خۆشتر و جوانترە. بەڕاستی لەو مانگەدا کە لە مەهابادێ بووم، تەواو حەسامەوە.

پاش ئەوەی مۆڵەت و پشووم تەواو بوو و گەڕامەوە تاران، هەوڵم دا هەرچۆنێکی بووە لە کاروباری ئیداری و فەرهەنگ دوور بکەومەوە و خۆم لەو سەرلێشێواوی و سووکایەتییە ڕزگار بکەم. مانەوەم لە فەرمانگەکەدا هیچ ئاکامێکی نەبوو. نە کارێکیان پێ دەسپاردم و نە هیچیشی تێدا بوو.

ڕۆژێکیان چوومە ئیدارە. پێیان گوتم، جەنابی بەڕێوەبەر کاری پێتە. چوومە ژووری بەڕێز هێرەوی، سەرۆکە تازەکە. گوتی، تۆ لێرە نەبووی، دەزگای تەناهی زەنگیان لێ دا و کاریان پێتە. سبەینێ بچووە شەقامی سوڕەییا، باڵەخانەی ساواک، ژمارە....

خەیاڵ بەربینگی گرتم. ڕێکخراوی تەناهی (ساواک) چ ئیشێکی بە منە؟ نەکا مەسەلەکەی دکتۆر مەولەوی بێ. خۆ چوار ساڵ بەسەر دەسبەسەرکرانەکەی ئەودا تێپەڕیوە. بە نیگەرانی چوومەوە ماڵێ. حاڵ و مەسەلەکەم بۆ خێزانم گێڕاوە. گوتم ئەگەر نەگەڕامەوە، دڵنیا بە دەسبەسەر کراوم و وا زووش بەرنابم. بۆیە باشترە دوای ماوەیەک، بچیەوە مەهاباد، لانیکەم لەوێ کەسانێک هەن چاویان بەسەر خۆت و منداڵەکانەوە بێ.

بەیانی بە نیگەرانییەوە چوومە شەقامی سوڕەییا. کە گەیشتمە باڵەخانەی گۆڕین، ڕاوەستام. دەلاقەیەکی بچووک کراوە و گوتی، کارت بە کێیە؟ گوتم داوایان کردووە بێمە ئێرە. پرسیی، کێم؟ خۆمم ناساند. گوتی بوەستە.

چەند ساتێک دواتر دەرگا کراوە و بردیانمە ژوورێ. چوومە هۆدەیەک، کە مۆبلی لێ دانرابوو. چۆڵ. چارەگێک بەتەنێ دانیشتم. ئاخری گەنجێک هات، پەڕاوێکی لەبن هەنگڵیدا بوو. سڵاوی کرد و گوتی فەرموو. چووینە ڕاڕەوەکە. لەوسەری ڕاڕەوەکە دەرگای هۆدەیەکی کردەوە کە تەنیا مێزێکی بچووک و دوو کورسیی تێدا بوو. گوتی فەرموو. دانیشتم. فۆڕمێکی تایبەتی لەپێش دانام و گوتی پڕی بکەوە و هەر سکاڵا و ناڕەزایەتییەکیشت هەیە، بە تێروتەسەلی بینووسە. هەستا چووە دەرێ. کە سەیری فۆڕمەکەم کرد، ئەوی نیگەرانیم هەبوو، ڕەوییەوە. زانیم شتەکە هەر لە بنێڕا پەیوەندیی

بە دکتۆر مەولەوییەوە نەبووە. فۆرمێک بوو، لەبارەی تایبەتمەندییەکانی خۆم بە وردی و چەند کەسین لە خێزاندا و باری ژیانم چۆنە و بەچی دەژیم و لە کوێ و چەندەم خوێندووە و لە فەرمانگە چۆنم و لەگەڵ خەڵکەکە چۆنم؟ ئەوان کێن؟ ئینجا ئەگەر سکاڵایەکیشم هەیە بینووسم. تەنانەت شێوازی بیروباوەڕ و ئەو شتانەش. لە ڕاستیدا لێکۆڵینەوەیەکی تەواو بوو. لەبارەی کاروباری ئیدارییەوە نووسیم، هیچ چاوەڕوانییەکم نییە پلەو پایەم بدەنێ. بەڵام کارگێڕی سەرەڕای نامە و نامەکاریی بەردەوام و یاسایی لەسەر گۆڕنی پلەکەم لە مامۆستایەتییەوە بۆ کاروباری کارگێڕی، هیچ هەوڵێک نادا.

نیوسەعات دواتر، گەنجەکە گەڕاوە و پرسیی، فۆرمەکەت پڕ کردەوە؟ گوتم چیی پێویست بووە نووسیومە. سەیرێکی کرد و گوتی، زۆر باشە، بۆت هەیە بڕۆی. ئێمە بۆخۆمان فۆرمەکە تاوتوێ دەکەین. ئەگەر پێویست بە ڕوونکردنەوەیەک بێ، زەنگت بۆ لێ دەدەین. ئیدی لە بینای ساواک هاتینە دەرێ و دەمودەست چوومەوە ماڵێ، بۆ ئەوەی نیگەرانیی هاوسەرەکەم بڕەوێنمەوە.

بیست ڕۆژێکی بەسەردا هات. ڕۆژێکیان لە ئیدارە بووم کە لە کارگێڕیی وەزارەتی فەرهەنگەوە نامەیەکم بەدەست گەیشت و داوام لێ کرابوو بۆ گۆڕینی پلەکەی خۆم بە بڕوانامەی پێویستەوە بچمە کارگێڕی.

لەکارگێڕی گوتیان ناکرێ پلەی مامۆستایەتیم بەرز بکەنەوە، بەڵام کێشەی نابێ بیگۆڕن و بیکەنە پلەی ئیداری و تەکنیکی، بەڵام بۆ ئەو کارە پێویستە لەپێشدا پشتگیریم

هەبێ کە پێشتر لە قوتابخانە وانەم گوتووەتەوە و ئەوجار ئەو ماوەیەی چاوەڕێی ئیشکردن بووم، لە مووچەی خانەنشینییەکەم کەم بکرێتەوە و دامەزرانەکەم بکرێتە فەرمی.

چارەسەری ئەو کێشانە، کاتی پێویست بوو. چار نەبوو. دەستم پێ کرد. چوومە فەرمانگەی گشتیی خانەنشینی. زۆر باش بوو کە تووشی هاوڕێ و هاوسەنگەری دێرینم کاک محەمەدی یاهوو بووم، کە لێرە پۆستێکی گرینگی هەبوو. بە ڕێنوێنیی ئەو دەستم پێ کرد. ئەودەم لە فەرمانگەی گەڕەکی ٧ی تارانیشەوە گوازرامەوە فەرمانگەی گشتیی پەروەردەی سەرەتایی. بەڕێوەبەرە گشتییەکەی ئەوێ، بەڕێز عەقیلی بوو. ناوبراو لە بەشی پەخش و دابەشینی کتێب دایانم.

بەرپرسی دابەشینی کتێب ئەو دەم بەڕێز غوڵامڕەزا جۆڵایی بوو. هاوکاری لەگەڵ ئەو پیاوە ماقووڵ و شاعیرە نیعمەتێکی گەورە بوو. ئاغای جۆڵایی ناسراو بە مەزدا، دیوانە شیعرێکیشی هەبوو. بە ناوی خۆشەویستیی نیشتمان. من شیعرەکانی لۆرمانتۆف و پووشکینی ڕووسیم بۆ وی دەخوێندنەوە و وەرمدەگێڕان. زۆری پێ خۆش بوون. زۆر لەو شیعرانەی بۆم وەردەگێڕا، ئەو بە فارسی دایدەڕشتنەوە. ئیتر لەو ماوەیەدا کە هاوکاری بووم، زۆر چێژمان وەردەگرت و من هاوکات دەمتوانی وەشوێن کاروباری پێویستی خۆم بکەوم، کە دەبوو

بچمە فەرمانگەی خانەنشـــینی و کارگێڕی بۆ ئەوەی پلەکەم بۆ بگۆڕن.

بۆ وەرگرتنی پشـــتگیریی کـار و وانەگوتنەوە چوومە قوتابخانەی مەولەویی تاران و دواناوەندیی ئێرانشـــاری مەهـابـاد. بەڕێوەبەری دوانـاوەنـدیی مەهـابـاد، بەڕێز ڕیانی بوو. چۆوە ســـەر پێشـــینەی کارکردنەکەم و پشـــتگیریی پێویســـتی دامێ و فەرمانگەی فەرهەنگی مەهاباد بۆیان مۆر کردم. ئەوجـار پشـــتگیریی وانەگوتنەوەم لە قوتـابخـانەی مەولەویی تارانیش وەرگرت. لە فەرمانگەی خانەنشینییش بە بیسـت و دوو هەزار و شـەشـسـەد و سـێ و هەشـت تمەن توانیم سـاڵەکانی چاوەڕوانیم کە بریتی بوو لە ١١ سـاڵ، لە سـاڵی ١٣٢٥ـــــەوە تا ١٣٣٥، بکەمە فەرمی و تەواوی ئەو بەڵگەنـامـانە ببەمەوە بۆ فەرمـانگەی گشـــتیی کـارگێڕیی وەزارەتی فەرهەنگ و پلەی مامۆسـتایەتیی سـەرەتاییان بۆ کردمە پلەی ٩ی تەکنیکی. بڕیارەکە بە ژمارەی ٥٥١١٨/١ ی ڕێکەوتی ١٣٤٤/١١/٢٦ دەرچوو.

دیارە لەو بارودۆخەدا لەوە باشـتر نەبوو. ئیدی پێویسـت نەبوو من لە فەرهەنگ(پەروەردە) بمێنمەوە. هەر بۆیە پانزە ڕۆژ پـاش وەرگرتنی بڕیـارەکە، دەمودەســـت داوای خانەنشـینیم کرد. بەڵام بەڕێز عەقیلی، ئەو پیاوە شـەریفە بە داواکەم ڕازی نەبوو.

باش بوو سـەفەرێکی بۆ هاتە پێشـێ و لێیان گێڕابۆوە بۆ بەشـــداری لە ســـمینارێکدا بچێتە ئەمریکا و ئیدی ڕۆیشـــت. منیش لە نەبوونی ئەودا چیی پێویست بوو کردم و شتەکانم کەوتنە گەڕ. لە ئاکامدا لەبەر ئەوەی وەزارەتی فەرهەنگ ئەو

داوایەی منی زۆر پێ خۆش بوو، بە بڕیاری ژمارە ٨٦٣ی ڕێکەوتی ١٣٤٥/١/٢٤بە چوار مانگ مۆڵەتەوە خانەنشینی کردم. بەڵام چونکە یاسای دامەزرانی وڵات خەریک بوو پەسند دەکرا و بەپێی ئەو یاسایە لانیکەمی تەمەنی خانەنشینی بۆ فەرمانبەرانی دەوڵەت ٥٠ سال لەبەرچاو گیرابوو و من ئەودەم ٤٥ ساڵان بووم، ئەگەر ئەو یاسایە پەسند کرابایە من نەمدەتوانی خانەنشین بم. بۆیە داوام کرد بەبێ چوارمانگ مۆڵەتەکەم، یەکسەر بڕیاری خانەنشینییەکەم بە لێبڕاوی بۆ مۆر بکرێ. بۆیە لەسەر ئەو داوایە لە ڕێکەوتی ١٣٤٥/٣/٩دا بە فەرمی گەیشتمە کاروانی خانەنشینەکانی وەزارەتی فەرهەنگ.

ئەو بڕیارە هاوکات بوو لەگەڵ هاتنەوەی بەڕێز عەقیلی لە ئەمریکا. وەختێک دیتی کار لە کار ترازاوە، بۆ ماڵاوایی توند دەستمی گوشی. مخابن ئەو پیاوە باش و شەریفە مانگێک دواتر دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت. بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێ.

## گەڕانەوە بۆ مەکۆی پارێزەران

پاش وەرگرتنی بڕیاری خانەنشینییەکەم، چوومە مەکۆی پارێزەرانی ناوەند. ئەودەم بەڕێوەبەری مەکۆی پارێزەرانی ناوەند، جەنابی هاشمپوور بوو. بۆخۆی پێشوازیی لێ کردم و فەرمووی دەمێکە مەکۆی پارێزەرانی ناوەند لەبەر زۆریی پارێزەر، کەس وەرناگرێ و ئێستا ناتوانی نە جەنابت وەرگرین نە هیچ کام لەوانەی داوایان کردووە. بەڵام لەوانەیە بەو زووانە ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێ.

تەنانەت دەنگۆی ئەوەش هەبوو کە لەمەودوا مەکۆی پارێزەران ئیدی خانەنشینکراوان وەرنەگرێ، بۆ ئەوەی تازەدەچووانی کۆلێژ ڕێگەیان بۆ بکرێتەوە.

هەر بۆیە بەبێ ئەوەی خۆم بگنخێنم، چوومە مەکۆی پارێزەرانی ئازەربایجان لە تەورێز. یەکێک لە هاوڕێ و هاوولاتییەکانی خۆم بە ناوی کاک محەمەدی هیندی لە تەورێز دادوەر بوو. لەگەڵ وی چوومە لای بەڕێز عەلی ئەبولفەتحی سەرۆکی مەکۆی پارێزەرانی ئازەربایجان. بەڕێز هیندی یەکێک لە دادوەرە خۆشەویستەکانی تەورێز بوو و هەموو پارێزەرەکان ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرت. باش بوو من لەگەڵ سەرۆکی مەکۆی پارێزەران یانی جەنابی دکتۆر ئەبولفەتح ئەبولفەتحی قۆناغی دکتۆرامان پێکەوە خوێندبوو. ناساندنی ئەویش بووە هۆی ئەوەی سەرۆکی مەکۆی پارێزەران داواکارییەکەم بە ڕوویەکی خۆشەوە وەرگرێ و گوتی جا بە ڕێکەوت لە مەهاباد، پارێزەری پلە یەکمان نییە. بۆیە داواکات بێ ئەملا و ئەولا قبووڵ دەکرێ. بەڵام بەو مەرجەی قبووڵی

بکەی ماوەیەک خۆت بەڕێوەبەری نووسینگەی مەکۆی پارێزەران بی. بە پێی فەرمانی وی، داوا و بەڵگەی پێویستم ڕادەستی نووسینگەی مەکۆی پارێزەران کرد. بەڵام چونکە بڕیاری خانەنشینییەکەشمم لەگەڵ خستبوون، سەرۆکی مەکۆ، نامەیەکی بۆ کارگێڕیی وەزارەتی فەرهەنگ نووسی، بۆ ئەوەی کورتەی پێشینەی کارم ڕابگەیەنن. نامەکەی دایە خۆم، بۆ ئەوەی زووتر وەڵامەکەی بێنمەوە. چوومەوە تاران و نامەی مەکۆی پارێزەرانی ئازەربایجانم ڕادەستی کارگێڕیی وەزارەتی فەرهەنگ کرد. باش بوو سەرۆکی فەرمانگەی کارگێڕی، بەڕێز ساتراپ بوو. پێشتر یەکترمان دەناسی. ناوبراو پێشتر سەرۆکی فەرهەنگی مەهاباد بوو. پیاوێکی باش و بەویژدان بوو. دەمودەست تەلەفۆنی کرد و داوای کرد پەڕاوەکەم بێنن. چەند ساتێک دواتر پەڕاوی ئاسایی و نهێنیی مدیان لەسەر مێزەکەی دانا. بەڕێز ساتراپ هەڵیدانەوە. بەتایبەتی کە پەڕاوە نهێنییەکەمی دی، گرژ بوو. ئەو نەیدەزانی پەڕاوی من ئاوایە. جا ئێستا چ بکا؟ ئیتر گوتی: ئەگەر بەپێی پەڕاوە نهێنییەکەت وەڵام بدەینەوە، بڕوا ناکەم وەڵامێکی باش و بەسوود بێ، بەدڵنیاییەوە زیانت پێ دەگا.پەڕاوەکەی دا بە خۆم و گوتی ها وەرە خۆت بیخوێنەوە. هەر سەرم سووڕ ما. بەتایبەتی ئەو کورتەیەی کارگێڕی لە ساڵی ١٣٣٩ـدا ناردبوویە فەرهەنگی پارێزگای تاران. ئەوە تازە تێدەگەیشتم کە بۆچی لە فەرمانگەکانی فەرهەنگ هیچ کارێکم پێ ناسپێرن. گوتم بەڕێز ساتراپ، چۆنت پێ باشە وا وەڵام بدەوە. تازە ئی

من لەوەی دەرچووە. ڕازی نیم شــتێکی وا بکەی تووشــی چەرمەســـەری و گۆنگەڵ بی. بیرێکی کردەوە و گوتی وەڵامێکی زۆر گونجـاو دەدەمەوە. ئەگەر دواتر ڕەخنەیەک گیرا، دەڵێم پەڕاوە نهێنییەکەیان پێشانی من نەداوە.

ســەیرێکی ڕوخســاری لەبەردڵان و کز و باریکیم کرد و لە دڵی خۆم دا گوتم هێشتا ئەم وڵاتە زۆر خەڵکی بەویژدانی تێدا ماوە. بەوپەڕی سپاسەوە ماڵاواییم لێ کرد و هەرچۆنێک بوو، کۆپییەکی کورتەی پەڕاوەکەم هەڵگرت، کە لە کۆتایی کتێبەکەدا وێنەکەیم داناوە.

هەڵبەت چونکە لە نامەی کارگێڕیدا هاتبوو کە چوار مانگ پاش پشوو خانەنشین دەکرێم، بەدوای ئەوەدا نامەیەکی دیکەم وەرگرت، کە بە پێی ئەو نامەیە لە ڕێکەوتی ١٣٤٥/٣/٢دا بەبێ مۆڵەت و بە یەکجاری خانەنشـین کراوم. ئەویشـم پێشـکەشـی مەکۆی پارێزەرانی تەورێز کرد. ئەوانیش بە بەشداریی هەموو ئەندامانی دەســـتەی بەڕێوەبەری داواکەمیان تاوتوێ کرد و ڕەزامەنـدییـان دەربڕی و مۆڵەتی فێرکـاریی من بە ڕێکەوتی ١٣٤٥/٣/٢٥ دەرچوو. ســـەرۆکی مەکۆی پارێزەران، جەنابی عەلی ئەبولفەتحی وێڕای پیرۆزبـایی فەرمووی، وەک بەڵێنـت داوە، هەتا بەڕێوەبەرێک بۆ نووســـینگەکەمان پەیدا دەکەین، دەبێ بۆخۆت بەڕێوەبەر بی. منیش بەوپەڕی ڕەزامەنـدییەوە قبوولم کرد و لەو ڕۆژەوە دەســـتم بەکـار کرد. ئەو چەنـد ڕۆژەی لە تەورێز مـامەوە، بە یـارمەتیی بەڕێز هێنـدی، خانووەکی ســـەربەخۆم لە شـــەقامی شـــەهنازی باشـــووری، ســـەرەتای شـــەقامی ســـائیب لە بەڕێز حاجی عەلی ئەکبەری

نامی بەکرێ گرت. بینایەکی ڤێلایی بوو، حەوشەیەکی پڕ لە دار و بار و میوە.

ئیتر گەڕامەوە تاران و لە ماوەی حەفتەیەکدا سـیپاڵم کۆ کردەوە و بە کـامیۆنێـک بەرەو تەورێز وەڕێ کەوتم و ماڵاواییم لە هاوڕێیان و دۆسـتەکانم کرد. ماڵە کرێیەکەی تەورێزم لە هەموو لایەنێکەوە گونجاو بوو. هەموو شـتێکی لێ نزیک بوو. ئینجا دراوسـێیەتیی جەنابی هیندییش بۆ ئێمە خەنیمەتێکی گرانبایی بوو.

بەرپرسـی قۆنـاغی ڕاهێنـانەکەم بۆ پـارێزەری، بەڕێز حەمیدی ئەمیر عیلمی بوو، کە یەکێک بوو لە پارێزەرە زۆر خوێندەوار و باشـەکانی تەورێز. ڕۆژانە یەک دوو سـەعات لە نووسـینگە کارم دەکرد و کاروباری نامە و شـتەکانی دیەکەم ڕادەپەڕاند و ئەوجـار دەچوومە فەرمـانگەی دادی تەورێز بۆ خوێندنەوەی پەڕاوی جۆراوجۆر. ڕۆژ و ڕۆژگار زۆر بەخێر و خۆشـی ڕادەبرد. هاتوچۆی بەڕێز هیندی و جەنابی دکتۆر حوسـێنی ئەیوبی و کاک قادری شـەریفی تـامێکی تـایبەتی هەبوو. هـاوینـان بەتـایبەتی ڕۆژانی هەینی پێکەوە بەخێزانی، دەچووینە یەکێک لە باغەکانی تەورێز. بە ڕاسـتی ئەو هەمووە هـاووڵاتییە لەوێ بۆ من نیعمەتێکی گەورە بوو.

پاش دوو مانگ کارکردن لە نووسـینگەی پارێزەران، جەنابی عەلی موسـتەفید لەو شـوێنە دانرا و ئەو ئەرکەیان لەکۆڵ من کردەوە. بەڵام ئیـدی لەودوو مـانگەدا توانیم کتێبخانەی مەکۆی پارێزەران ڕێکوپێک بکەم و لیسـتەیەکی

ڕێکوپێکی کتێبەکان ئامادە بکەم. ئینجا واشم کرد، کەس نەتوانێ هیچ کتێبێک بباتە دەرەوە. لەگەڵ ئەوەدا، هەموو پارێزەرە ئازەربایجانییەکانیشم ناسی. سەرەڕای هەموو ئەوانە، بوێری و جوامێریی بەڕێز ئەبولفەتحیی سەرۆکی مەکۆی پارێزەرانم زۆر بەدڵ بوو. چونکە زۆربەی کات کە نامەی نهێنی لە ساواکەوە دەهات و پەیوەندییان بە مەکۆی پارێزەرانەوە هەبوو، ئەبولفەتحی دەیدانە من و دەیگوت وەڵامێکی بدەوە، کە بۆ پارێزەری گۆرین باش و بەسوود بێ.

لە جۆزەردانی ١٣٤٦ـدا قۆناغی ڕاهێنانم تەواو بوو. من و یەکێکی دیکە بە تاقی کراینەوە. من دەرچووم، بەداخەوە ئەوی دی دەرنەچوو و ئەو دەبوایە ساڵێکی دیکەش خۆی ڕابێنێ.

ڕۆژی بیست و پێنجی جۆزەردان، مۆڵەتی پارێزەریم بۆ دەرچوو.

جەنابی ئەبولفەتحی پێشنیاری کرد ئەگەر پێم خۆشە لە تەوریز وەمێنم و هاوکاریی بکەم. سەرەڕای ئەوەی من بەڕێزیانم لە هەموو ڕوویەکەوە پێ کەسێکی شیاو بوو و شانازیم دەکرد کاری لەگەڵ بکەم، بەڵام قبووڵم نەکرد و پێم باشتر بوو بچمەوە مەهاباد. هەڵبەت دواتر پەژیوان بوومەوە.

ئیتر لە کۆتایی جۆزەرداندا، نووسینگەی پارێزەریم لە مەهاباد کردەوە و خانووەکم بەکرێ گرت و چووینەوە ئەوێ.

قۆناغی پارێزەریم، دنیایەک بیروەریی تێدایە، بەتایبەتی لە قۆناغی شۆڕشی گەلانی ئێران و پاش شۆڕشدا. هیوادارم تەمەن ماوەم بدا و بتوانم بەتێروتەسەلی بیاننووسمەوە.

**مانگی گوڵانی ١٣٦٩ی هەتاوی**

**تاران　　ڕەحمان حەلەوی**